# پەیڤێک لە دڵەوە




نوسینی
عمرو خالد

وەرگێڕانی
بەرزان ئەمین



نارین

# پەیڤێك لە دڵەوە

نوسینی

عمرو خالد

وەرگێڕانی

بەرزان ئەمین

نارین

| | |
|---|---|
| ناوی کتێب بەعربی: | كلام من القلب |
| نوسینی: | عەمر خالید |
| ناوی کتێب بە کوردی: | پەیڤێك لە دڵەوە |
| وەرگێڕانی: | بەرزان ئەمین |
| بڵاوکار: | کتێبخانەی نارین |
| نەخشەسازی ناوەوە: | شنۆ حمدامین |
| نۆرە و ساڵی چاپ: | یەکەم/ ١٤٣٠ك ـ ٢٠٠٩ز |
| شوێنی چاپ: | بەیروت ـ لبنان |

**کتێبخانەی نارین**

هەولێر ـ چوارڕیانی شێخ مەحمودی حەفید

بازاڕی زانست بۆ کتێب وچاپەمەنی

تەلەفۆن : ٢٥١١٩٨٢-٦٦(٠٠٩٦٤)

E- mail: nareen_١@yahoo.com

## بسم الله الرحمن الرحيم

### پێشەکی:

الحمـد لله رب العـالمين والـصلاة والـسلام علـى خـير خلـق الله أجمعـين وعلـى ال بيتـه الطاهرين و أصحابه المكرمين ومن تبعهم بإحسان الى يوم الدين...

أما بعد

مرۆڤ... ئەو دروستکراوە هەڵبژێردراوەی خودایە... پێکهـاتوە لـە روح و جەسـتە... بەگاڵتە دروست نەکراوە... بەڵکو خولْقێنراوە لە پێناو ئامانجێکی ڕێزدار و مەبەسـتێکی بەرزدا، کە بریتی یە لـە پەرستنی خـوای گـەورە کـە دەفـەرموێ ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ الذاريات: ٥٦.

بەرز ڕاگرتنی یاسا و دەسـتوری خـودا لـە ژیانیـدا و هەوڵـدان بـۆ بەدەسـت هێنـانی ڕەزامەندی خوای باڵادەست، کە بەخشندەیە بەلافاوی نیعمەتەکانی بەگەورە و بـچوکیەوە لەسەر ئەم مرۆڤە، بەڵام نیعمەتێ کە لە پێنـاو ڕەزامەنـدی خـوادا کـاری پـێ نـەکرێ و بەسەرپێچی کردنی خوادا بەکاربێت ..بۆئـەوە پێویـستیمان بەتەوبـەکردن و پەشـیمانی و گەڕانەوە هەیە. بۆ ئەوەی تەوبەکار بزانێ کە چەندێ ڕێزی لای خـودا هەیـە... و هەسـت بەئەندازەی خۆشەویستی خودا بکات بۆ ئەو بەندەیەی کـە بـۆلای کەبۆدەچـێت و هـەوڵی بەدەست هێنانی ڕەزامەندی ئەو دەدات.

تەوبە پێویستی بە جێگیری و دامەزراوی هەیـە... بۆئـەوەی تەمـەن لـە دوو دڵـی و سەرسامی و لە نێوان تاوان و تەوبەدا بەفیڕۆ نەڕوات، چونکە مـرۆڤ نازانـێ کـەی و لـەچ دۆخێکیدامەرگ ڕێگەی پێ دەگرێ.

بۆ دامەزراویش کۆمەڵە فاکتەرێکی یاریدەدەر هەن... کە یەکەمیان: هـاوەڵی چـاك و هاوڕێی ڕاستگۆ و برایەتی بۆ خوا، کە ئەگەرخودات لـەبیر چـوو بـە یـادت دێنێتـەوە و گەرلە یادت بێت هاوکاریت دەکات و ڕێنموییت دەکات لە خۆشەویستیدا لە پێناو خوادا،

تا ڕۆژگارت شادومان بێت و ژيانت نوێ بێتەوە. پڕی دەكات لە كامەرانی و ئارامی و بەختەوەری... هەروەها دامەزراوی چەند هۆكارێكی فەوتێنەری هەیە: لەوانە تێكەڵی نایاسایی و ئەو پەیوەندی یانەی كە لە شاراوەییدا گەشە دەكەن و پۆشاكی جوانی شەرم لادەبات. كوڕان و كیژان جگە لە حەسرەت و پەشیمانی و ئەشكەنجە و ئازار و ماندو بون هیچی دیكە دروێنە ناكەن و نادورنەوە.

بەڵێ ئەی لاوی ئازیز... زۆر مەترسی دارە كە بەبێ ئاگا لەخۆشەویستی خودا بژیت... بێ ئاگابیت لەو پەیامە خودایی یەی كە خوای گەورە بۆتی ڕەوانە دەكات بۆ ئەوەی ڕێگەی ملكەچیت بێنێتەوە یاد و بتخاتە سەری... ئەو هێشتا بانگت دەكات و دەیەوێ دڵت ڕابگرێ... تا بگەڕێیەوە و تەوبە بكەیت و چێژی شیرینی ڕاسەقینە لە دونیا و پێش ڕۆژی دوایی بكەیت بەڵام هەر شتێك نرخی خۆی هەیە و بەهەشت گرانە و پێویستی بە ئارامی تۆیە بۆئەوەی بەدەستی بهێنی و پشت بە خودایەك ببەستی كە زیندوەو هەرگیز نامرێ، جیهادی نەفسی خۆت بكەیت هەركاتێ كە ویستی بەلای كارێكدا لابداتەوە كە دەبێتە مایەی توورەبوونی خوای گەورە.

ئەم پەرتوكە پەیڤێكە لە دڵێكی خۆشەویستەوە بۆ دڵێكی ڕاستگۆ كە ئارەزوی بەهەشت دەكات... كۆمەڵێك گفتوگۆی بوێرانەی تێدایە و كۆمەڵە پرسیارێكی گرنگ كە لاوان پێشنیازی ناخی خۆیان كردوە و زۆر بەڕاستگۆیی و ناسكی چیرۆك وبەسەرهاتی ژیانی خۆیان گێڕاوەتەوە و تعبیریان لە ئازارو بەختەوەری یەكانیان كردوە و چۆن سەر لەنوێ چێژی خۆشیەكانی ئیسلامیان كردوە و ژیانی خۆیان لەسایەی ڕەزامەندی خوادا بە دڵا چووە... دەی وەرە... دەستت بنێ نێو دەستمەوە بە ئومێدی ئەوەی تا پێكەوە ڕەزامەندی خوای گەورە بەدەست بهێنین و لەنێو پانتایی بەهەشتەكەیدا ئارام و سەقامگیر بین.

لەسەرەتاو كۆتایدا... نزاو پارانەوە هەمیشە بۆ خودای بیسەر و نزیك و وەڵامدەر دەبێت بۆ ئەوەی ئەم كارەمان لەتای تەرازوی چاكەكانماندا بە پوختی و لەپێناوی خۆیدا بۆ تۆمار بكات

**براتان: عەمر خالید**

# تەوبەکردن

## تەوبەکردن و گەڕانەوە بۆلای خودا

### مانای تەوبەکار چی یە ؟

تەوبەکار واتای گەڕانەوە... واتـە بەهـەموو هێزێکمـەوە گەڕامـەوە بـۆلای خـودا... بەهەموو توانایەکمەوە ..گەڕامەوە بۆ لای تۆ ئەی خوایە...گەڕامـەوە بـۆ لای تـۆ ئـەی پەروەردگارم دوای دیارنەمانێکی دوور و درێژ...گەڕامەوە پاش ئەوەی کە ماوەیەکی دوور بەبێ سەر و بەری یەوە لەنێو تاریکی تاوانە دڕندەکاندا مامەوە .

ڕەنگە لەسەرەتا یەکێك بڵێ: ئەی ئێمە چی بکەین؟ بەڕێگەیەکی دروسـت و ژیـانێکی سەقامگیر دەژین... بەڵام من دەڵێم: ئێمـە دەکەوینـە نێـو کۆمـەڵێ تـاوانی گـەورەوە و هەست بە سامناکی ئەم کارە ناکـەین... بـەڵکو دەتـوانم بڵـێم کـە کەسـانێکی زۆر لـە دەوروبەرماندا دەکەونە نێو تاوانە گەورەکانـەوە... مـن دەزانم، کـە ئـەم تۆمەتبارکردنـە سامناکە...بەڵام ئەمە ڕاستی یە...لاوانێکی زۆر دەکەونە بێ گوێیی و سەرە ڕۆیی دایك و باوکیانەوە، بەڵام ئایا ئەمە کارێکی گەورە نی یە؟ ئاگادارتان دەکەمەوە کە هـەرگیز لـە دایك و باوکتان یاخی نەبن، چونکە ئەمە چوارەمین تاوانی گەورەیە لە ئیسلامدا... ئـەی ئایا فرمێسك ڕشتنی تورەیی و پەستی دایك هۆیەك نی یە بـۆ تورەبـوونی خـوای گـەورە بەتوندی؟ ئەو باوکەی، کە دەسەوسان دەبێت لە پەروەردە کردنـی کوڕیـەکان، بەتایبـەتی ئەو کوڕەی کە لە زانکۆدا دەرناچێ و دەکەوێت، یان مادەی بێ هۆشکەر دەکێشێ...، یان ئەو دایکەی کە هەمیشە دەگری لەبەر ئـەوەی کـچەکەی هـاوەڵی کـوڕان دەکـات بـەبێ ئاگاداری کەس و کارەکەی... ئایا هەموو ئەم کارانە پێویستی بەتەوبەکردن نی یە ؟ ئایا ئەم کارانە لە تاوانە گەورەکان نین؟ ئەی تۆ نازانی پەست کردنی دایك و باوکت قورسـترین کێشیان دەبێت لە نێو تەرازوو و تەواوی تاوانەکانی دیکەدا... بەڵکو لە هـەزاران تـاوانی دیکە قورسترن کە لە ماوەی ساڵێك، یان دوساڵ، یان سێ ساڵدا ئەنجامت دابـن ؟ کەواتـە ئێمە کۆمەڵێ تاوانی گەورەمان هەیە کە پێویستە تەوبەی لێ بکـەین... ..لەوانەیـە تـۆ ئەو کەسە نەبێت کە مەی دەخواتەوە، یان داوێن پیسی دەکات بـەڵام پـێ نـەدانی مـافی دایکان و باوکان لە تاوانە گەورەکانە.

## کەواتە تۆ پێویستیت بە تەوبە کردن هەیە...

چەندێك لە خەڵکیمان دیوە لە مانگی پیرۆزی ڕەمەزاندا نوێژدەکەن و پاش ئەوە وازی لێ دێنن... چەندێکیان تەنانەت لە ڕەمەزانیشدا ڕێك و پێك نیە لە نوێژەکانیدا... چەندێکیان ماوەی ٢٠ساڵیشە نوێژی بەیانی ناکات... ئایا نوێژی بەیانی لەنوێژە فەرزەکان نی یە ؟ ئایا دەزانی کە وازهێنان لە نوێژ لە گەورەترین ئەو تاوانانەیە کە خوای گەورە پەست دەکات، نوێژ کۆڵەکەی ئاینە و هەرکەس بیڕوخێنێی ئەوا دینی ڕوخاندوە؟ کارەساتی بەسوك زانینی نوێژەکان... لە دۆزەخدا دەرگایەك هەیە پێ ی دەوترێ سەقەر، خوای گەورە لەبارەیەوە دەفەرموێ: ﴿مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ ﴿٤٢﴾ قَالُوا لَمْ نَكُ مِنَ الْمُصَلِّينَ ﴿٤٣﴾ وَلَمْ نَكُ نُطْعِمُ الْمِسْكِينَ ﴿٤٤﴾ وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ الْخَائِضِينَ ﴿٤٥﴾ وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوْمِ الدِّينِ ﴿٤٦﴾ حَتَّى أَتَانَا الْيَقِينُ﴾ المدثر٤٢-٤٧.

خوای گەورە سەبارەت بە سەقەر دەفەرموێ کە لەکەس ناگەڕێ هەرکەس بڕواتە نـاوی یەوە خانەکانی لەشی سواخ دەدرێن... هەمویان بەتەواوی لەنێو دەچن و، پاشان سـەر لـە نوێ دروست دەبنەوە و لەنێو دەچنەوە و ئەمکارە بەم شێوەیە بەردەوام دەبێـت ﴿مَا تَذَرُ مِن شَيْءٍ أَتَتْ عَلَيْهِ إِلَّا جَعَلَتْهُ كَالرَّمِيمِ﴾ الذاريات: ٤٢، کارێکی سامناکە... ئەو فریشتانەش کە لەبەردەرگاکەیدا دەوەستن لەوانەی ناو دۆزەخ دەپرسن: چی ئێـوەی هێنایـە ناو سەقەر؟ وەك ئەوەی کە بەزەی، یان پێیاندا بێتەوە... ئەوانیش وەڵامیـان دەدەنـەوە و دەڵێن ئێمە لە نوێژکەران نەبووین.

گەر خوای گەورە ڕێزدارت بکات بەوازهێنان لـە تاوانـە گـەورەکان... سـەرنجی ئـەو تاوانانە بدە کە تۆ بە بچوکیان دەزانی... هەزاران تاوانی بچوك هـەموو ڕۆژێ... بیهێنـە پێش چاوی خۆت هەفتەی ڕابردو چەند تێڕوانینی حەرامت کردوە.

کیژان و ژنان کامیان بۆ نمونە لە تەڵەفۆنەکەیدا چەند بە خراپە (غەیبە)ی خەڵکی دیکەی کردوە... من ئەوە ناڵێم تا دڵتان تەنگ بکەم، یان ناڵێم ئێمە بە تەواوی وون بووین.

بەڵام بۆ ئەوەی هەست بە جوانی تەوبەکردن بکەین، دەبێت هەست بە قێزەونی تاوانیش بکەین....دەکرێ هەتا تەوبە دەکەین لەسەرەتادا هەندێ بە ئەشکەنجە و ئازاربین.

بریا هەموشەوێ دوو لاپەڕەت ئامادە دەکرد یەکێکیان بۆ ووتە شیرین و ئەوی دیکەیان بۆ ووتە ناشیاوەکانی ڕۆژی ڕابردوت، خۆزگە چەند وشەت لەلای باشەکان و چەند لەلای خراپەکانت دەنوسی؟ ئاکامی کارەکانی ئەمڕۆت چۆن دەبوو؟ ئایا ملکەچی خودا، یان سەرپێچی کاری دەبویت؟

بێگومان هەزاران تاوان دەدۆزینەوە، کەواتە ئێمە زۆر بەتوندی پێویستیمان بەتەوبە کردن هەیە... یەکێك لە تابعەکان کە سوفیانی ثوری یە پەیڤێکی زۆر جوانی ووتووە، دەڵێ: ڕۆژێك دانیشتم و تاوانەکانم ژمارد .-سەرنجی ئەم بایەخدانەی بکەن بەداهاتوی... داهاتوو هەرگیز ماڵ و منداڵ و خێزان نی یە بەڵکو داهاتوو بەهەشت و دۆزەخە، ئەو ڕۆژێ دانیشتم گوناهەکانی خۆمم ژمارد کە ژمارەیان ٢١هەزار بوون-کە ئەو تابعی یەکی بەڕێزە-بەخۆی ووت: ئەی سوفیان بەم ٢١هەزار تاوانەوە دەچیە بەردەم خوای خۆت کە لە هەریەکەیان پرسیارت لێ دەکرێت ؟... ئەم تابعی یە بەڕێزە ژیاوە لەگەڵ یارانی پێغەمبەردا(ﷺ) ژیاوە... خۆت لەم وێستگەیە بێنە پێش چاوی خۆت...

ئێمە گوناهمان یەکجار زۆرە... هەندێ جار تاوانی گەورە دەکەوێتە سەر تای تەرازوی خراپەکانمان بەبێ ئەوەی ئاوڕی لێ بدەینەوە و زۆر بە ئاسانی پێی هەڵدەستین... دەنگت بەسەر دایکتدا بەرز دەکەیەوە، یان لەڕوی باوکت دەوەستیەوە. کارەسات دەخولقێنی و دەبیە مایەی مەینەتی کەواتە ئێمە پێویستیمان بەوە هەیە لە زۆر کاردا تەوبە بکەین، پێویستە تەوبە بۆ لەبیرکردنی ئەو نیعمەتانە بکەین کە تیایدا نغرۆ بوین و لەلایەن پەروەردگارمانەوە بۆمان هاتونە خوارێ و ئێمە لەسەری سوپاسمان نەکردووە... چونکە لەهەمان کاتدا کەسانێك هەن کە نایدۆزنەوە... ئایا سوپاس نەکردنی نیعمەتەکان پێویستی بە تەوبەکردن نی یە؟

پێویستیمان بەوەیە کە تەوبە لەبێ ئاگایمان بکەین، خەڵکی نزیکەی ٢٠-٣٠ ساڵە وێڵ و سەرگەردانن لە خوای گەورە، لەبەرئەوەی کەسێك کە تاوانێك دەکات دەکرێ وازی لێ بهێنێ، کەسێ کە تاوانێکی گەورە دەکات دەکرێ لێ ی هەڵگەڕێتەوە... بەڵام بێ ئاگایی لە نزیکی لە خودا ئەو کەسەیە کە ئەم پەیڤەی خودای لەیاد کردوە، کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ الذاريات: ٥٦.

بێ ئاگایی زۆر گەورەترە لە تاوان و سەرپێچی کردن و پێویستی بەتەوبەی خێرا و چالاکانە هەیە... ئێمە هەموو کەوتوینەتە نێو تاوانێکەوە کە لەمپەر دەخاتە ڕێگەمان بۆ بەرەو خودا چوون... پاکانە بۆ خۆم ناکەم هەمومان تاوان و گوناهمان هەیە.

**وەرن بۆتان بگێڕمەوە خوای گەورە چیمان لەبارەوە دەفەرموێ ؟ چۆن بانگمان دەکات؟**

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ وَأَنِيبُوٓا۟ إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا۟ لَهُۥ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ﴾ الزمر: ٥٣-٥٤.

دوای ئەم دڵتەنگی یەی، کە دەستمان پێ کرد و تاوان و کەمتەرخەمی یەکانی خۆمان وە یاد هاتەوە حەوانەوەیەکمان لە خوداوە بۆدێ.

**باوەڕ بکەی، یان نا ! تاوان و گوناهی ٢٠ساڵ، یان زیاتر لەیەك چرکەدا لێی دەبورێت!**

((وأنيبوا الى ربكم...)) ملکەچی خودا بن... خۆتانی بەدەستەوە بدەن... لەگەڵ ناختاندا بوەستن و بگەڕێنەوە...پرسیارەکەش ئەمەیە خوای گەورە چی لە ئێمە دەوێ؟

﴿وَٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيۡكُمۡ وَيُرِيدُ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلشَّهَوَٰتِ أَن تَمِيلُواْ مَيۡلًا عَظِيمٗا﴾ النساء: ٢٧، هەروەها سەیری دوای ئەوبکە کە دەفەرموێ: ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُخَفِّفَ عَنكُمۡۚ وَخُلِقَ ٱلۡإِنسَٰنُ ضَعِيفٗا﴾النساء: ٢٨، چونکە گەر تۆ تەوبە نەکەیت ئەوا وەستانەکەت زۆر سەخت دەبێت لە ڕۆژی دوایدا، خوای گەورەش دەیەوێ هەندێ کار ئاسانی بۆ ئێمەی لاواز بکات . سەنجی ئەم فەرموودەیەی بدە ﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ يَلۡقَ أَثَامٗا ﴿٦٨﴾ يُضَٰعَفۡ لَهُ ٱلۡعَذَابُ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَيَخۡلُدۡ فِيهِۦ مُهَانًا ﴿٦٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلٗا صَٰلِحٗا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمۡ حَسَنَٰتٖۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا﴾ الفرقان:٦٨-٧٠

شێوازی لێدوانی قورئان دەربارەی زیناو داوێن پیسی توندە - پەنابەخوا لێی- زاراوەکان بەتەواوی دەگۆڕێن لەکاتی ئاخاوتن دەربارەی تەوبەکردن... واتانەك تەنهاکە لێمان ببورێ و تاوانەکانمان بسرێتەوە، ئەمە شتێکە، کە هەستی پێ ناکەین و، بیری لێ ناکەینەوە، بەڵکو خوای گەورە گوناهەکان دەگۆڕێ بە چاکە واتە گەر تەوبەم کرد دەست دەکەم بەوتەوبە و کاری چاك دەکەم، گوناهەکانم دەگۆڕێن بۆ چاکە واتە ٥ساڵ بەسەر کەسێکدا تێپەڕ بوبێ و لەو ماوەیەدا لە نوێژکردن نزیك نەبوبێتەوە و هەر ئەو ساتە کە تەوبەی کردوە بەتەنها ئەوەی لە نوێژەکانیدا ڕێك و پێکەو هەندێ لە سوننەتەکان بەجێ دێنێ لەو٥ ساڵەی دەبووردرێ و بەڵکو گوناهەکانی ئەو ٥ ساڵەی بۆ دەگۆڕێ بەچاکە...!! (بێگومان لەگەڵ دانەوەی حەق و مافی خوای گەورە ئەویش بەدوبارە کردنەوەیان... بەلام تاوانی نەکردنیان سراوەتەوە)

ئەم هەموو بەخشندەیی یە چی یە ئەی پەروەردگار!! سبحان الله

## پێغەمبەرت(ﷺ) دەربارەی تەوبە دەدوێ:

چیرۆکی مرۆڤێکی نەرم و نیانت بۆ دەگێڕێتەوە کە ڕۆژی دوایی دێت و خـوای گـەورە فەرمان دەداتە فریشتەکان کە تاوانە گەورەکانی لێ دور بخەنەوە، پاشان خوای باڵا دەست دەفەرموێ ئەی بەندەکەم پەرتوکەکەت بخوێنەوە، بەندەکەش پەرتوکەکەی دەخوێنێتـەوە و دەبینێ کە گوناهەکانی ئامار ناکرێن و ناژمێردرێن بۆیە ڕەش دادەگەڕێ و وا دەزانێ کـە تیا چووە، خوای گەورە و باڵادەست بەم بەندەیە دەفەرموێ جـارێکی دیکـەش بخوێنـەوە، ئایا تۆ تەوبەت نەکرد ئەویش تەوبەکەی دێتەوە یاد و دەڵێـت: بـەڵێ ئـەی پـەروەردگارم تەوبەم کرد، تەوبەم کرد ئەی پەروەردگارم، دەیخوێنێتەوە و گوناهەکانی دەبینێ کە گۆڕاون بۆ چاکە، پاشان ئەم بەندەیە بە پەروەردگاری دەڵێت: ئـەی خوایـە مـن گونـاهی دیکـەم هەیەو زۆر باش دەیان زانم بەڵام فریشتەکان لەیادیان چووە کە تۆماری بکـەن !! تەنانـەت پێغەمبەر(ﷺ) کە ئەوەی دەگێڕایەوە پێدەکەنی و دانە پیرۆزەکانی دەرکەوتن.

ئایا تەوبە و قەشەنگی تەوبە تان بینی... ئـای کـە چـەند قەشـەنگە؟ سـەرنجی ئـەم وتەیەی پێغەمبەر(ﷺ) بدە کە دەفەرموێ: (ئەی خەڵکینە تەوبە بکـەن بـۆلای خـودا و داوای لێخۆش بوونی لێبکەن من هەمو ڕۆژێ تەوبە بۆلای خوا دەکەم و سـەد جـار داوای لێخۆش بوونی لێ دەکەم ).[1]

پێغەمبەری(ﷺ) خوا لە ڕۆژێکـدا سـەد تەوبـە دەکـات، تـۆش ١٠ سـاڵە تەنانـەت جـارێکیش تەوبـەت نـەکردوە، پێغەمبـەر(ﷺ) لـە گونـاه دوورە!! تـۆش بەندەیـەکی گوناهکاری!!

لە إبن عمرەوە دەگێڕنەوە، کە دەفەرموێ: (ئێمە لە دانیـشتنێکدا دەمـان ژمـارد، کـە پێغەمبەر(ﷺ) سەد دانە جار دەیفەرموو: ((رب اغفرلي وتـب علـيّ إنـك أنـت التـواب الرحيم)[2] واتە: پەروەردیگارا لێم خۆش بەو تەوبەم لێوەرگرە بەڕاستی تـۆ تەوبـە وەرگـر و خاوەن بەزەیی.

---

١ـ امام أحمد لە (مسند)ەکەی و مسلم لە (صحیحة)ەکەیدا ریواتیانکردوە.

٢ـ ترمذي و ابو داود ریوایەتیان کردوە.

پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ یارانی دەدوێ و کەمێك بێدەنگ دەبێ ئەوان گوێیان لێ دەبێت کە دەفەرموێ: ((أسغفر الله وأتوب اليه... أستغفر الله و أتوب اليه))، پاشان کەمێك دەدوێ و جارێکی دیکە بێ دەنگ دەبێتەوە هەتا داوای لێخۆش بون و تەوبە لەخودا بکاتەوە .

هەروەها گوێ بۆ ئەم ووتە شیرینەی پێغەمبەر(ﷺ) بگرە کە ئەبو موسا(ﷺ) لە پێغەمبەر(ﷺ)ەوە دەگێڕێتەوە، کە (خوای گەورە بەشەو دەستی ڕادەخات تا تاوانبارانی ڕۆژ تەوبە بکەن وە بە ڕۆژ دەستی رادەخات تا تاوانبارانی شەو تەوبە دەکەن هەتا خۆر لە ڕۆژ ئاوا هەڵدێت).[1]

کێ دەستی ڕادەخات ؟! هەژار و نەبوو... کێ هەژارە ؟ بەندە بەڵام خوای گەورە لە بەخشندەیی خۆی دەستی ڕادەخات بۆ بەندەکەی... گوێ لەم ووتەیەی پێغەمبەر(ﷺ) بگرە کە دەفەرموێ: (پەروەردگارمان لەسێ یەکی کۆتایی شەودا دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا و بانگ دەکات ئایا تەوبەکارێك هەیە تەوبەی لێ وەربگرم؟ ئایا کەسێك هەیە کە داوای لێبوردن بکات و لێببورم) خوای گەورە ئەو خوایەیە کە هەموو ڕۆژێ نزیکەی سێ کات ژمێر و نیو پێش بەرەبەیان ئەمەمان نیشان دەدات).

ئەوەش بێنە پێش چاوی خۆت، کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەواڵمان پێ دەدات کە خوای گەورە تەوبەی بەندەکانی خۆش دەوێ، ئەوە بێنە پێش چاوی خۆت کە تۆ ماوەی چەند ساڵێکە یاخی بووی و تاوانی گەورە دەکەیت، پاشان ڕۆژێك دێت و تیایدا دەڵێی: ئەی پەروەردگارم تەوبەم کرد و جارێکی دیکە ناگەڕێمەوە بۆسەر تاوان کردن... خوای گەورە بەم تەوبەیە کامەران دەبێت.

---

[1] ـ مسلم ریوایەتی کردوە.

# چەند چیرۆکێکی ڕاستەقینە

## ئایەتێك سروشت و کەسایەتی عبد الرحمن ی هەژاند

ناوم عبد الرحمنە خوێندکاری کۆلێژی یاسا قۆناغی سێ یەمم... لەناوچەیەکی میللی دەژیم من زۆرم حەز لەوەرزش بو هەمیشە کەس و کارم لەسەری هانم دەدەن و لەبەر بەرزی باڵام خوازیار بووم ببمە یاریزانێکی تۆپی باسکە و خەون بە ئەستێرە بونیەوە دەبینم، بەڵام ئەوەی کە ڕویدا من ئەو کاتە چوومە یەکێك لەیانە گەورەکان و پێوەری بنەڕتیشی ئەوە بوو، کە وتیان فلان کەس لە ناوچەیەکی میللی یەوە هاتوە و لە ئاستی ئێمەدا نی یە و لەو بارەیەوە دەدوان بەڕاستی ئەمە زۆر کاری تێکردم هەمو ئامانجێکم ئەوەبوو، کە وەك ئەوان لەو ئاستەدا بم، هەستام چوم بۆ ناوچەیەکی ئاوەدان و تیایدا چاوم کەوت بەچەند کوڕ و کچێکی لاو و پێکەوە دەرچوین و دەستمان کردە پێشبڕکێی ئۆتۆمبێل... ئاوڕدانەوەی زۆروو جگەرەکێشان و جارێك یەکێك لە برادەران ویستی جگەرەیەکم بداتێ، کە جگەرەکە ئاسایی نەبوو لەگەڵیدا دەستم کردە وەرگرتن و چەندین شتی دیکە... چوومە کۆلێژەوە کۆمەڵگایەکی نامۆم بەرچاو کەوت بەوەی، کە لاوانی فێربونیان بەلاوە گرنگ نی یە. هەمو ئەوەی، کە بەلایانەوە گرنگە بریتی یە لە نمایشی جل و بەرگ و دەرچون و شەوخنونی و چەندین شتی دیکە. من دەگریام لەبەرئەوەی، کە پارەم نەبوو وەك لە ئەوان کەل و پەل و کاڵا بکڕم و بڕۆمە دەرێ بەتایبەتی، کە من دوو کیژم ناسی کە لە بواری نمایشی جل و بەرگدا کاریان دەکرد ئالێرەوە سەرەتای لێژبونەوە دەستی پێ کرد، چونکە من حەزم دەکرد، کە هاوسێ یەتیان بکەم، بیرم لەوە کردەوە، کە چۆن پارەم دەست بکەوێت ؟ ئەمە هەموو غەم و پەژارەیەکم بو... چەند لاوێکم ناسی لەو ئاستەدابوون: ئەوان سەرگەردان و غەمی تەواویان ڕواڵەت و پەیداکردنی پارەبوو.

هاوەڵی یەکێك لەو کەسانەم کرد و بیر و بۆچونی خۆم سەبارەت بە سامان و پارە و پول پێ وت... ئەو پێی وتم، کە هەروەك من وابووە، بەڵام ئەو دەزانێ، کە چۆن پارە پەیدا دەکات و بەدوایدا دەچێت، منیش سەرقاڵی وەرزشی لەش و لاری و جەستەیی بوم و کەسێکی بەهێز و شێوەیەکی نایابم هەبوو ئەو بەچەند کەسێکی سەرمایە داری زۆری ناساندم بەوەی، کەمن وەرزشکارم و دەتوانم بەرگری، یان لێ بکەم و شتێکیان بۆ بکەم... من ئامادەی چەند دانیشتنێك بووم، کە هەرگیز بەهزرمدا نەدەهات و هەرگیز خەونیشم

پێوەنەدیبوو... مەی خواردن و بۆماوەی سێ ساڵ مادەی بێ هۆشکەرم کێشا هەتا وردە وردە هەستم بە ماندوبوون دەکرد... شتێکی زۆر نامۆم بە دیکرد لەگەڵ هەمو کەسدا تێکدەگژام تەنانەت ئەو پۆشاکانەش، کە شانازیم پێوە دەکردن بەشێوەیەکی نامۆ پارچە پارچە دەبوون هەر ڕۆژەیەی شتێك دەدڕا وە شتێك، کە چاك نەدەبویەوە.

ڕۆژێك کات ژمێر ٢ی شەو بوو لە ماڵەوە دانیشتبوم و سەیری دیواری ماڵەکەمانم دەکرد و دەموت: بۆچی من لەسەر ئەم ژیانە ئاوا گەورە بووم؟ ئەمە ئەو شوێنەی،ە کە منی تێدا پەروەردە بووم... زۆر تامەزرۆی ئەم کەش و هەوا سادەیەم دەکرد: کەش و هەوای خێزان و کەس و کار، خەریك بوو دەڕوخام و پرسیارم لەخۆم دەکرد: ئەی پەروەردگار بۆچی منت خوڵقاندوە؟! سوێند بەخوا و لەم ساتەدا و سوێند بەوە دەخۆم، کە خوای گەورە بەخشیمی و دەنگی ڕادیۆیەك لە دور هات، کە گوێم لە ئایەتێك بوو، کە تەواوی جەستەمی هەژاند بەوەی کە دەیفەرموو: ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ الذاريات٥٦ کاتێ، کە خۆمم دیتەوە لە سوژدەدا بووم... تێر تێر گریام و پێم وایە لەو سوژدەیە سەرم هەڵنەبڕی هەتا دوای بەرەبەیان، هەستام خۆم شوشت و دەست نوێژێکم گرت، هەستم بە شتێکی زۆر سەریر کرد، هەستم کرد، کە من تینوی ڕەزامەندی خودام، ئەو کاتە زانیم، کە من هەست دەکەم وەك ئەوەی، کە خنکابم، من دڵنیابووم پێویستم بە خوای گەورەیە و لێی دور بووم لەم ساتەدا هەستم کرد، بەوەی کە نوری خودا چووەتە نێو ژیانمەوە لەبەرئەوە بەڵێنم دا بە خوای گەورە هەر تاوان و گوناهێك بکەم بە ملکەچی خوای گەورە بەرپەرچی بدەمەوە واتە گەر هەڵەیەك بکەم و جگەرەیەك بکێشم ئەوا ڕۆژێك ڕۆژو دەگرم، هەستم کرد، کە من سەر لە نوێ بنیاتی خۆم دەنێمەوە و نیاز و بڕیاری خۆم بەهێز دەکەم، ئەوە ماوەی ٢ ساڵە من لە نێو ئەم ژیانە نوێ یەمدا دەژیم و نامەوێ لە مزگەوت دور بکەومەوە و لە خودا دەپاڕێمەوە کەلەسەر ئەم ڕێگەیە دامەزراوم بکات

سبحان الله زانایان پەیڤێکی زۆر جوانیان هەیە، کە دەڵێن: هەروەك ورگ بۆ خواردن برسی دەبێت، ڕوحیش بۆ خۆشەویستی خودا و تامەزرۆی خودا برسی دەبێت، عبد الرحمن یش بەم پەیڤە شیرینەی گوزارشتی کرد، و وتی: من تینوی ڕەزامەندی خودا و گەڕانەوە بۆ لای خودای باڵادەستم... بەڕاستی ئەمە تەوبە کردنە

## هەستی عبدالرحمن پاش گەڕانەوەی بۆلای خوا لە ڕۆژانی یەکەمیدا چۆن بوو؟

یەکەمین شتێك کە من هەستم پێ کرد ئەوەیە کـە دەمـەوێ بمـرم.. چـونکە هـەرگیز شایانی ژیان نیم....ئەویش لەبەرئەوەی کـە زۆر پەشـیمانم... وە هەسـتم کـرد کـە ئـەو ژیانەی پێشووم هەرگیز بەختەوەری تێدا نەبوو،... لەگەڵ ئەوەشـدا مـن وام دەزانـی کـە ژیانم زۆر خۆشە، کاتێ کە ئایەتەکەم بەرگوێ کەوت، تا ئێستاش نـازانم چـۆن گـوێم لـەو ئایەتەبوو. لەناخمدا ئەوەم بەدیکرد کەپڕە لە نیەت و نیاز و ئەمەوێ تەواوی ئەو شـتانەی لە دەستم دەرچوون بیان خەمە گەڕ و لەبری ئەوە لەگەڵ پەروەردگاردا بژیم , وەك و ئەوەی کە پێغەمبەرم(ﷺ) ون کردبێت, من وامدەزانی کە کەسایەتی یـەکی زۆر بـەهێزم هەیـە وەك مرۆڤێکی وەرزشی و خاوەن جەستەیەکی نایاب و بەرزم... یاری لەش جوانی دەکـەم پێم وایە گەر سەیری کەسێك بکەم ئەوا لێم دەترسێ وە ئەگەر سەیری کیژێك بکـەم ئـەوە خوازیارە کە بیدوێنم، بەڵام لە ڕاستیدا من لەناخمدا لاواز بووم واتە نەمـدەتوانی مامەڵـە لەگەڵ ناخی خۆمدا بکەم، یان ڕایگرم لە سنوری خۆیدا، یان لەکاتی سەرپێچی یەکدا من هیچ نەخشەسازی و توانایەکم نەبو، کە بەو شێوەیە پێکم بهێنێ، بـەڵام پـاش گەڕانـەوەم بۆلای خودا... بـۆم دەرکـەوت کـە وەك منـداڵێکی بـچوکی لاوێنـراو وام، کـە کـەس و کارەکەی تێکیان دابێ دواتر ووتم: دەکرێ، کە ئەم کوڕەیـە پـەروەردە بکـەم و ڕای بێـنم لەسەر کۆمەڵە شتێك کە لێیان تێناگات... دەستم پێ کرد و، ووتم سـبەینێ بـەڕۆژو دەبم بۆ نمونە... کوڕەکەی ناخم دەستی کردە هات و هاوار... چۆن ڕۆژو دەگریت لە کاتێکـدا تۆ کارو خوێندن و چی و چی ترت هەیە؟ بەڵام من ملکەچیم نەدەکرد، دەزانم هـەر کاتـێ کە ئەو هاوار لەسەر کارێ بکات، ئەوا ئەو کارە چاکەیەکی تێدایـە مـن پـێم دا دەگـرت لەسەر ملکەچیەکان بەجۆرێ هەندێ شـتم لـە نـاخی خۆمـدا ئاشـکرا کـرد کـە هـەرگیز نەمزانیبون کە ئەویش بریتی یە لە هێزی ناوەکی، سوپاس بۆ خودا.

لەڕاستیدا عبد الرحمن ئەزمونەکەی خۆی نمایش دەکرد و منیش هەستم دەکرد، کە دڵم پڕە لە دڵنیایی و ئارامی و ساردی... لە کاریگەری بیرکردنـەوەم لـە گـەورەیی ڕەحمـەتی خودا... شتێکم هاتەوە یاد.

خواى گەورە سروشى نارد بۆ پێغەمبەر داود(ﷺ) کە دەفەرموێ ئەى داود، گەر دووركەرەوەكان و بێ ئاگاكان شتێكیان دەربارەى ئارەزومەندیم بزانیایە بەگەڕانەوەیان بۆلاى من و ئارەزوم لە تەوبەكردنیان ئەوا لە شەیداییان بۆ من دەتوانەوە... ئەى داود ئەمە ئارەزوى منە بۆ ئەوانەى پشتیان لەمن كردووە ئەى ئەبێ خۆشەویستم بۆ ئەو كەسانە چۆن بێ كەبەرەو ڕووم دێن).

ئێمە هەندێ جار نازانین كە خواى گەورە چەندێ خۆشحاڵە بە گەڕانەوەمان وە نمونەى عبدالرحمن جەخت لەسەر بەخشندەیى خواى گەورە دەكاتەوە... واتە ئەو ژیانى هەمووى گرفت بوو... وەمن دڵنیام كەروخسارى زۆر گۆڕاوە لەپاش ڕێنمونى بوونى بەڵكو هەموو شتێ قەشەنگ و زیاتر بەختەوەر بووە.

## دوو ڕكاتى تەوبە

بەسەر هاتى خۆى دەگێڕێتەوە و دەڵێت:

من لەگەڵ تەوبەكردندا چیرۆكێكم هەیە:من هەمیشە لەگەڵ دایك و باوكم دەجەنگام و ناكۆك بوم لەگەڵیان و دەنگم بەسەردا بەرز دەكردنەوە كاتێ، كە زانیم پەستى دایك و باوكان یەكێكە لە گوناهە گەورەكان و هەر كارێكى باش و چاكە، كە دەیكەم بەیەك تێڕوانینى پەستى دایك و باوكم دەڕوات.

لێبڕاوانە بڕیارم دا كە هەرگیز نەگەڕێمەوە سەر ئەم كارە و من هەر كاتێ، كە تووڕە دەبووم دەست نوێژێكم دەگرت و دوڕكات نوێژى تەوبەم دەكرد. دەگەڕامەوە بۆ لاى خودا بەڵكو دەمارەكانم بەهێز بكات، هەرواش بوو هەمیشە دڵم لە ناخیەوە ئازارى دەدام، هەتا سوپاس بۆ خودا وام لێهات كە هەرگیز ناتوانم دەنگ لە ڕویان هەڵبڕم وەك ئەوەى كە خواى گەورە بەیەكجارى لە سینەمى دەركێشابێ تەنانەت هەستم وابوو كە سەركەوتنى ئەم كارە لە منەوە نەبووە بەڵكو خەڵاتێكى خودایى بووە .

ئەم كارە زۆر جوانە، دەمەوێ لەم پەیڤەوە بابەتى ئەم دوڕكات نوێژى تەوبەیە وەربگرم لەبەر ئەوەى كە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (موسڵمانێك نى یە، كە گوناهێك بكات و،

پاشان دوو ڕكات نوێژ بكات و داوای لێخوش بون بكات لەسەر ئەوگوناهە ئەوا خوای گەورە لێی دەبورێ).[١]

هەندێ كەس كاتی، كە گوێیان لە فەرمودەیەكی قودسی، یان ئایەتێك دەبێت سەبارەت بە تەوبەكردن و خۆشەویستی خوا بۆ بەندەكانی باوەڕ ناكات كە ئەگەر تەوبە بكات هەروا بەئاسانی خوای گەورە لێی ببورێ...

بەڵێ خەڵكانێك ئاگادار نین لەوەی كە گوناهی ٢٠ ساڵ تەنها لەیەك ساتدا لێی دەبورێ... وە منیش سوێندت بۆ دەخۆم ئەوە كارێكی زۆر ئاسانە.

سەیری ئەم فەرمودە قودسی یەی چوارەم بكە لە ئەبوذەرەوە(ﷺ) دەگێڕنەوە كە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: خودای گەورە فەرموویەتی: (هەركسێ چاكەیەك بكات ئەوا دەهێند، یان زۆرتری پێ دەدرێ و هەركەسێك خراپەیەك بكات سزاكەی وەك خۆیەتی، یان لێ بوردنە، وە هەركەس بەقەدەر پانتایی زەوی تاوان بكات و هاوەڵم بۆ پەیدا نەكات، ئەوا بەوێنەی ئەو گوناهانە لێی دەبورم، هەر كەسێك بستێك لێم نزیك بێتەوە ئەوا من گەزێك لێی نزیك دەبمەوە، وە هەركەسێ باڵێ لێم نزیك بێتەوە ئەوا من شاباڵێك لێی نزیك دەبمەوە و هەركەسێ بەڕۆیشتن بەرەو ڕوم بێت ئەوا من بەرە و ڕوی ڕادەكەم).[٢]

پیاوێك لەسەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) باوەڕی نەدەكرد و پێی ووت: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)من پیاوێكی زۆر ناپاكم ناپاكی زۆرم لەگەڵ خودادا كردوە خوای گەورە ڕێگەی چاكەی پێ نیشان داوم و فەرمانی پێ داوم بەڵام من ناپاكی زۆرم كردوە و زۆر داوێن پیسم، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: تەوبە بكە، ئەویش ووتی خوای گەورە لە ناپاكی و داوێن پیسی یەكانم دەبورێ ؟ ئەەویش فەرموی: بەڵێ، پیاوەكە لێیدا و ڕۆیشت و دەیوت: الله اكبر بۆ ئەو خوایەی كە لە ناپاكی و داوێن پیسی یەكانم دەبورێ.

وریایی دان: گەر تۆ باوەڕ نەكەیەت كە خوای گەورە تەوبەت لێ وەردەگرێت ئەوا تۆ نكوڵی یەكێك لە خاسیەتەكانی دەكەیت، ئایا بەخشندە لە سیفەتەكانی خوای گەورە نی

---

١ـ امام احمد لە ((مسند)) ە كەی لە ئەبوبەكری صدیقەوە ڕیوایەتی كردوە.

٢ـ (مسند))ی امام أحمد.

یە؟ واتە گەر گومانت لەم کارە بێ وەك ئەوە وایە کە تۆ گومانت لە بەخشندەیی واتە سیفەتێك لە سیفەتەکانی خوای گەورە هەبێت... کەواتە ئەمە تاوانێکە و تۆ بە گومانی لەوەی کە پەروەردگار لێت ببورێ...

کەواتە شەیتان پێت پێدەکەنێ و دەتخاتە نێو تاوانێکی گەورەوە... لەبەر ئەوەیە کاتێ لە کێوی عەرەفە لە کاتی حەج کردن دا دێیە خوارێ پێت دەڵێن، کە نەڵێی: وا هەست دەکەم کە خوای گەورە لێم نەبورابێ لەبەر ئەوەی ئەمە یەکەمین گوناهی دوای لێبوردنە...

## خەون بینین و بردن:

من زۆر بەردەوام نەبووم لەسەر نوێژکردن... واتە گەر بەرنامەیەکی ئاینی، یان هەر شتێکی لەو چەشنەم دیتبا ئەوا دوو رۆژ بەرێك و پێکی نوێژەکانم دەکرد و، پاشان لێ ی دادەبڕامەوە، هەتا خێزانم پێکەوەنا، یەکێك لە خزمانی خێزانەکەم دەربارەی نوێژ دواندمی و منیش پێم ووت ماوەیەك دەیکەم و هەندێ جاریش لێی دەگەرێم... هەتا خەونێکم دی و تیایدا ئاگرم گرتبو و ڕام کرد بۆلای خزمەکەم و داوای هاوکاریم لێ کرد، خەونەکە کۆتایی پێهات بەڵام لەجاری دووەمدا کە تیایدا باسی نوێژی بۆ کردم ڕاستەوخۆ خۆمم دیتەوە کە دەڕۆم و نوێژ دەکەم. خوای گەورەش ڕێگەی چون بۆ مزگەوت و نوێژ تێیدا کردنی بۆ ئاسان کردم... یەکەم جار کە چومە نێو مزگەوت کاتی نوێژی خەوتنان بوو وە سوپاس بۆ خودا تا ئێستا لێی دانەبڕاوم.

من دەمویست کە ئاوڕ لە کارێکی گرنگ بدەمەوە کە ئەویش پەلەکردن بوو لە تەوبە کردندا چونکە زۆر کەس لەوانەی کە گوناهێك دەکەن دەڵێن: إن شاء الله بەم زوانە تەوبە دەکەین... چۆن شتی وا دەڵێیت؟... مەرگ دیاری نەکراوە لەبەر ئەوە پێویستە لەسەر تەوبەکردن پەلە بکەین.

### سەیری مەزنی وگەورەیی خودا بکە کاتێ کە سەرپێچی دەکەی:

هەندێ جار وا هەست دەکەین کە ئێمە سەرپێچی پەوەردگارمان دەکەین، لەبەر ئەوەی کە نازانین خودا کێ یە؟ وە نازانین نیعمەتەکانیشی کامانەن لەسەرمان و دیاریشی ناکەین، چونکە ئێمە بەڕاستی ئەمانەمان بزانیایە هەرگیز نەمان دەتوانی سەرپێچی بکەین...

پێغەمبەر(ﷺ) لەنێو مەدینەدا یەکەمین ووشەیەك، کە فەرمووی: (ئەی خەڵکینە پەروەردگارتان لەهەموو دڵتانەوە خۆش بوێت) واتە: گەورەترین شت کە لەدڵتایە با ووشەی الله بێت گەر بزانی کە الله کێ یە ئەوا بەزوویی تەوبە دەکەیت... گەر پلەو پایەو توانای بزانیت هەر بەزوویی تەوبە دەکەیت... بەئەندازەی هەست کردنت بەگەورەی خودا... بە ئەندازەی شەرم کردنت لە خودا و هەست کردنت بە خەجاڵەت باری لەوەی کە تورەی بکەیت و لە فەرمانەکانی دەرچیت, تەوبەکردنت خێرا دەبێت.

### مەرجەکانی تەوبەکردن چین:

#### لەمەرجەکانی تەوبەکردن:

هەر گوناهێك لەنێوان تۆ و خودادا هەیە و دەتەوێ تەوبەی لەسەر بکەیت پێویستی بەسێ مەرجی سەرەکی هەیە، ئەم گوناهەت هەرچۆن بێت:

#### یەکەم: پەشیمانی و واتاکەی...

گەر مرۆڤێك کۆمەڵە تاوانێکی زۆری هەبێت لەگەورە و بچوك... هەزاران جۆر لەتاوان... کاتێ کە هەست بە ئازاری دەکات لە دڵیدا وا دەزانی کە تەوبەی کردوە... سوتانێکی تێدایە... دڵی دەبرژێ و کڵپە دەستێنێ... چۆن هەموو ئەم کارەت لە دەرهەق بە خودادا ئەنجام دا... چۆن ئاوات کرد؟ دەکرێ کە مرۆڤ ماوەی٢٠ ساڵ لەسەر تاوانێك، یان گوناهێك بەردەوام بێت... بەڵام کاتێ کە بیر لەم گوناهە دەکاتەوە دەبینێ دڵی لەترساندا دەلەرزێ و پەشیمانە... ئەمە بریتی یە لە پەشیمانی... کە شانازی بە گوناهەوە نەکەیت و پەرۆش نەبیت بۆی... بەڵکو لە ئەنجامدانی پەشیمان بیت.

**دووەم: وازهێنان لە گوناه و جیابوونەوە لەو شوێنانەی کە بەرەو گوناهت دەبەن.**

**سێ یەم: توانای بەهێز و پەیمان دان بەخودا بەمەبەستی نەگەڕانەوە بۆسەر گوناهەکان:**

گەر هەستای بەئەنجام دانی ئەم سێ مەرجە دڵنیابە خوای گەورە لێت دەبورێ گوناهەکانت دەسڕێتەوە و لاپەڕەکەت بەتەواوی سپی دەبێتەوە. واتە: گەر یەکێ لە خوێنەران ئێسا هەست بەوە بکات کە پەشیمانە لە ئەنجام دانی گوناهێك و تەوبەی کرد و سور بوو لەسە نەگەڕانەوە دەست بەجێ گوناهەکانی دەسڕێتەوە تەنها لەبەرە ئەوەی کە خوای گەورەی ڕاستی لە دڵیدا ببینێت.

## ئایا تەوبە بە جارێك تەواو دەبێت و کارەکە کۆتایی پێ دێ ؟

بەدڵنیایی یەوە نەخێر... تەوبە هەمیشە نوێ دەکرێتەوە... واتە گەر جارێك گوناهێکت کرد و، پاشان گەڕایتەوە... سەر لە نوێ جگە لەتەوبە کردن هیچی دیکەت لەبەردەمدا نی یە.

پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) و ووتی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) سەرنج بدە گەر گوناهێکم کرد ئایا لەسەرم دەنوسرێ؟ ئەویش فەرمووی: بەڵێ دەنوسرێ، پیاوەکە ووتی: ئەی ئەگەر تەوبەم کرد؟ حەزرەت فەرموی: دەکوژێتەوە، پیاوەکە وتی ئەی گەڕامەوە سەری، حەزرەت فەرموی: دەنوسرێ، پیاوەکە وتی ئەگەر تەوبەم کرد، پێغەمبەر(ﷺ)فەرموی: دەکوژێتەوە، دەشتەکی یەکە ووتی: هەتاکەی ئەم تاوانە هەر دەکوژێتەوە؟ پێغەمبە(ﷺ) فەرموی: (خوای گەورە وەڕس نابێ لە لێبوردنتان هەتا ئێوە وەڕس نەبن لە داوای لێخۆش بوون)[1]

## بەدفەڕی تاوان و پیرۆزی تەوبەکردن

لە ڕاستیدا دەمەوێ کۆتایی بە چیرۆکەکە بهێنم... چیرۆکێکی بەچێژ چیرۆکی پیاوێك لە جولەکە کە بۆماوەی ٤٠ ساڵ سەرپێچی خودای کردوە... تاوان نی یە ئەو ئەنجامی نەدابێ بەڵکو هەمو تاوانێکی ئەنجام داوە و بۆ تەنها جارێکیش تەوبەی نەکردووە...لە

١ـ بەیهەقی واتاکە دەرهێناوە.

یەکێك لەساڵەکاندا بێ بارانی پەیدا دەبێ و بەنی ئیسرائیل بارانیان بەسەردا نابارێ ئاژەڵیان دوچاری نەخۆشی و کشتوکاڵیان دوچاری وشك بوون دەبێت و ئاوی ڕوبارەکان دەبنە هەڵم بۆیە دەچنەلای موسی و پێی دەڵێن: لەخودا بپاڕێوە، کە بارانمان بەسەردا ببارێنێ، موسی بەنی ئیسرائیل کۆ دەکاتەوە و دەفەرموێ وەرن با بپاڕێینەوە، ئەی خودایە باران، ئەی خودایە باران ببارێنە، باران نابارێت ئەی خودایە باران و بەڵام باران هەر نابارێت، موسی دەفەرموێ: ئەی پەروەردگار ڕاتهێناوم بەوەڵام ئەی بۆچی باران نابارێ؟ خوای گەورە لە ڕێگەی سروشەوە پێی فەرموو: ئەی موسی: باران نابارێ، لەنێوتاندا بەندەیەك هەیە ماوەی ٤٠ ساڵە سەرپێچیم دەکات، بەشومی و بەدفەڕی و تاوانەکانی ئەو بارانتان لە ئاسماندا لێگیراوەتەوە.

ئایا هۆی تەنگ و چەڵەمەو گرفتی نێو ماڵەکانتان زانی؟ بەدفەڕی تاوانە... باری ئابوری و هۆیەکانی نالەباریتان زانی؟ بەدفەڕی تاوانە...

موسی فەرمووی: ئەی پەروەردگار من چی بکەم؟ خوای گەورە فەرموی دەری بکەن لە نێوتاندا... سەرنج بدەن کە گوناهکار و تاوانبار چۆن پەروەردگاری پەست دەکات... موسی وەستاو فەرموی ئەی بەنی ئیسرائیل سوێندتان لەسەر دەخۆم، لەنێوماندا بەندەیەك هەیە ماوەی ٤٠ ساڵە سەرپێچی خوای گەورە دەکات و بە بەدفەڕی تاوانەکانی بارانمان لێ گیراوەتەوە، باران نابارێ هەتا ئەو لە نێوماندا دەردەچێ، بائەو لە نێوتاندا بێتە دەرێ، ئەو تاوانبارە بەباشی خۆی دەناسی، بەڵام سەیری دەوروبەری خۆی کرد، بەڵکو کەسێکی دیکە بێتە دەرێ بەڵام کەس نەبوو ئەو بەندەیە دەست بەجێ دەستی کردە پاڕانەوە لە پەروەردگاری و ووتی ئەی پەوەردگارم ماوەی چل ساڵە من تاوان دەکەم و تۆ بۆت پۆشیوم و من گەر ئەمڕۆ بچمە دەرێ ئاشکرا دەبم و من پەیمانت دەدەمێ، کە جارێکی دی نەگەڕێمەوە سەر ئەو تاوانانەم خوایە تەوبەم لێ وەربگرە و بم پۆشە، موسی دەست بەجێ بارانی دی کە لە ئاسمان دەهاتە خوارێ، موسی فەرموی: ئەی پەروەردگار باران باری و کەس نەهاتە دەرێ... خوای گەورە فەرمووی ئەی موسی باران باری بەهۆی بەختەوەریم بە تەوبەی ئەو بەندەیەم کەماوەی٤٠ ساڵە سەر پێچیم دەکات.

سەرنجێك... ئەی ئەوەی سەرپێچی خوا دەکەیت... سەرنجێك گواستنەوەیەکی گەورە دەتگوێزێتەوە.

موسی فەرموی: ئەی خودایە پێم نیشان بدە تا پێی بەختــەوەر بــبم، خــوای گــەورەش فەرموی: ئەی موسی چل ساڵە سەرپێچیم دەكات و دەی پۆشم ئێستا كە گەڕاوەتەوە بۆلام ئاشكرای بكەم؟

براكانم ئەمە پــەروەردگاری زۆر بەخــشندەی ئێوەیــە، لــە تــەواوی گوناهــەكان خــۆش دەبێت... وە ما یەی شەرمەزاری یە كە ئێمە ئەم هەمو ساڵە دوور و درێــژە لێــی وە دور كەوینەوە.

بڕوام پێ بكەن... پیاوێك ٩٩ كەسی كوشتبو كەسێك نی یە لە ئێمە لەو خراپتر بــێ، ووتی: ئایا دەتوانم تەوبەبكەم؟ پرسیاری كرد، ئەو قەشەیەی كە پرسیارەكەی لێكردبوو پێ ی ووت: كوڕەكەم تەوبەكردن بۆ تۆ نی یە ئەویش قەشەكەی كوشت و كردنی بە سەد كەس پرسیاری لە بەندەیەكی دیكە كرد: ئایا دەتوانم تەوبە بكەم؟ ئەویش پێی ووت كێ ڕێگــری لەتەوبەكردن لێ دەكرێ، بەڵام ئەو خاكە بەجێ بهێڵە، كە تۆی تێدایە، چونكە ئەمە خاكی خراپەكاری یە بڕۆ بۆ سەر زەوی یەكی ئاوا، كە قەومێكی چــاكەخوازی تێــدا بێــت، ئــەو پیاوە خاكەكەی خۆی بەجێ هێشت و دەستی كرد، بە جوڵان و لــە نیــوەی ڕێگــەدا مــرد، فریشتەكان لەسەری ناكۆك بــوون فریــشتەی ڕەحمــەت دەیــان وت ئــەو تەوبــەی كــردوە و فریشتەی دۆزەخ وئازار دانیش دەیان وت ئەو چاكەی لەســەر زەوی نــەبوە و ســەد كەســی كوشتووە، خوای گەورە سروشی بۆ ناردن لە نێوانی هەردوو زەوی یەكە بپێون و بــزانن لــە كامیانەوە نزیكە نێوانی پیاوەكەو هەردو زەوی یەكەیان پێوا و خوای گەورە ئــەم پیــاوەی یەك بست لەزەوی یە چاكەكە نزیكتر كردبویەوە لەبەرئەوە فریــشتەكانی ڕەحمــەت لەگــەڵ خۆیان بردیان).[1]

هەست بە نرخی بستێك بكەن پێش ئەوەی بمرن... ئەو بستە دەكــرێ تەوبەیــەك، یــان ئەسرینێك، یان دوو ڕكات نوێژ بێت كە دەیانكــەیت وەیــان ماچــێكی دەســتەكانی دایــك بێت.

١ـ إمام احمد لە ((مسند))ەكەی لە ئەبو سعیدی خدری یەوە ماناكەی دەرهێناوە.

## نــزا

لەکۆتاییدا پێم خۆشە بەنزا کۆتایی بەم باسە بهێنم... خوای گـەورە لـە گوناهـەکانمان ببورە... شورەیی یەکانمان بپۆشە... ڕەحم بـە لاوازیـان بکـەیت و... کارەکانمـان بگریـە دەست و گەردنمان لە دۆزەخ بپارێزێ و... داوێنمان بپارێزە و بپۆشە و... تەوبەکانمان قبولّ بفەرموی و... گوناهەکانمان بشۆریتەوە و... نەمان مرێنی خوایە تا لێمان ڕازی نەبیت... خوایە لەسەر چاکە لە دونیا دەرمان بێنە و پەنات پێ دەگرین کـە لەسـەر سەرپێـچی تـۆ بمرین... پێش مردن داوای تەوبە دەکـەین و لـەکاتی مردنیـشدا داوای شـەهیدی و پـاش مردنیش بەهەشتی پڕناز و نیعمەت ئارامی و بەختـەوەری... خـوای گـەورە ئێمـە داوای ژیانی کامەرانی و مردنی شەهیدان و هاوەڵی پێغەمبەران و سەرکەوتن بەسەر دوژمنانـت لێ دەکـەین... داوای ژیـانی بەسـۆز و بـەزەیی و مردنێکـی هاوتـا و گەڕانەوەیـەکی سەربەرزانە و بێ سەر شـۆڕیت لێ دەکـەین... ئێـستا تەوبـەمان لێ وەربگـرە... ئێـستا تەوبەمان لێ وەربگرە تەوبەمان لا خۆشەویست بکە... بە جوانی بۆ لای خۆتمان بگێـڕەوە پەنات پێ دەگرین کە لە دونیا دا سەرگەردان و بێ ئاگابین لە تۆ... پـەنات پـێ دەگـرین گەر لە یادت بکەین کە تۆ لەیادمان ناکەیت... چاکەت بۆ ئێمە هاتۆتە خوارێ و خراپەی ئێمە بۆلات بەرز دەبێتەوە... بەسۆز و میهری خۆت دۆستایەتیمان دەکەیت... تۆ زۆر لە ئێمە دەوڵەمەندتری... بەسەرپێچی تاوانەکانمانەوە ناشـیرین دەبـین لات کـە چـی ئێمـە هەژارترین کەسین بۆ تۆوە... ئەی خۆشەویست لە هەژاران ببورە و بـەزەیت بـە لاوازانـدا بێتەوە... لە گوناهباران خـۆش بـە... ئـەی ئـەو زاتـەی کـە حـەزت لـە نرکـەو ناڵـەی گوناهبارانە کاتێ کە دەگەڕێنەوە بۆلات... گەڕانەوە و تەوبەمان قەبوڵ بفەرموو... ئـەی پەروەردگار تکاکانمان وەرناگیرێ تەنها لای تۆ نەبێ و دەرگاکان لە ڕومان داخراون دەرگای تۆ نەبێ... بەندەت زۆرن، بەڵام ئێمە تۆ نەبێ کەسی دیکەمان نی یە... پەسەندمان بکەو لێمان ڕازی بە... آمین آمین آمین أجمعین، خوای گەورە لە ئێمەش و لە ئێوەشی وەربگرێت.

دامەزراویی

دامەزراوەیی چی یە؟

ئایا دەکرێ لاوێك بەدرێژایی تەمەنی بە دامەزراوەیی لەسەر ملکەچـی پـەوەردگارمان بمێنێتەوە؟

بەڕاستی من لێرەدا مەبەستم(هەڵەشەیی) نی یە، بەڵام کێ هەیە لەئێمە، کە هەرگیز هەڵە نەکات؟... بەڵام من مەبەستم کەسانێکی زۆرە کە ژیانی بە ملکەچی پەروەردگار دەست پێ دەکات و، پاشان زۆر بە سەختی دەکەوێت ئەو لە ماڵەکەیدا بە شێوەیەکی نایاب و نزیك لە خودا و لەسەر ملکەچی ئەو پەروەردە دەبێت، بەڵام لەپڕ لێی دور دەکەوێتەوە و ڕوو لە کێشانی ماددەی بێ هۆشکەر و مەی نۆشی دەکات و چی دی نوێژ ناکات و، پاشان جارێکی دیکە دەگەڕێتەوە سەر ڕێبازی خوایی...

پرسیارێك دێتە پێش: ئایا دەگونجێ لاوێك بدۆزینەوە کە پارێزگاری لە خۆیی بکات و بڵێ: من ئەم کارە و ئەو کارەم نەکردوە و لەسە ملکەچی خوای گەورە بمێنێتەوە، یان ئەمە شتێکی ئەستەم و خەیاڵی یە ؟

جارێك پێغەمبەر(ﷺ)دانیشتبوو، پێشەوا عومەر(ﷺ) هات وسەیری مووی پێغەمبەری(ﷺ)کرد ئەمە لە کاتێکدا کە پێغەمبەر(ﷺ)لەدوا دوای ژیانیدا بوو عومەر ژمارەیەکی زۆر موی سپی لەسەری حەزرەت(ﷺ)دا بەدی کرد و فەرمووی: پیر بوی ئەی پێغەمبەری خوا ؟ عومەر(ﷺ) دەیویست شۆخی لەگەل پێغەمبەر(ﷺ)دا بکات، ئەویش فەرموی: (بەڵێ ئەی عومەر هود پیری کردم) عومەر فەرمووی: بۆچی ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئایەتێکی تێدایە پیری کردوم ئەی عومەر) ئەویش فەرموی: کام ئایەتەیە ئەی پێغەمبەری خوا؟ ئەویش فەرمووی ئەو وتەی خودایە کە دەفەرموێ: ((فأستقم كما أمرت ومن تاب معك)).

سەرنجم بدەن پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ئایەتە پیری دەکات... کەس نی یە لە ئێمە بۆ تەنها چرکەیەکیش بایەخی بەم ئایەتەدابێ... بەڵکو هەمانە هێشتا بەر گوێشی نەکەووتوە.

پیاوێك هاتە لای پێغەمبە(ﷺ)و پێی ووت: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ): شتێکم پێ بڵێ لە ئیسلامدا کە پاش تۆ لە هیچ کەس پرسیاری لێوە نەکەم، حەزرەت(ﷺ)فەرمووی: بڵێ: ((آمنت بالله ثم إستقم)).[1]

---

١ـ إمام أحمدلە ((مسند))ەکەی لە عبداللە کوڕی ئەبو سفیان و ئەویش لە باوکیەوە دەیگێڕێتەوە .

## كە زانیت پابەند بە

خۆزگە لاوێك هەبێت بە درێژایی تەمەنی لەسەر ملكەچی خودا دامەزراو بێت؟

ئێمە ئەم پەیڤە پێشكەش بەهەموو ئەو كەسانە دەكەین كە دەیانـەوێ بگەڕێنـەوە بـۆ لای پەروەردگار... پێشكەش بەهەموو ئەوانەی دەكـەین كـە تـا ئێـستا لەسـەر ڕێگـەی سەقامگیری نین، بەڵام ئەقڵی فریوی داوە كە لە ڕێگای ئیسلام لابدات.

پێغەمبەر(ﷺ) چاوی كەوت بە حارثة (ﷺ)، كە تەمەنی١٧ ساڵ بوو واتە لە تەمەنی هەرزەكاریدا بوو... بەمانایەكی دیكە لاو لە تەمەنی ئەودا زاڵ دەبێت بەسەر هزریدا كـە چۆن لابدات؟! چۆن فێڵبازێك بێت؟! چۆن بخواتەوە ؟ بەداخەوە كیـژانیش هەربـەم شـێوەیە لەم بوارەدا بیر دەكەنەوە.

بەڵام حارپە كە تەمەنی ١٧ ساڵ بوو نمونەی دامـەزراوی بـوو جـەختی دەكـردەوە كـە دەیەوێت كەسانێك هەبن تەواوی تەمەنیان لەسـەر ڕێگـەی خـودایی دامـەزراوبن ڕۆژێـك حەزرەت چاوی پێی كەوت... بەشێوەیەكی ئاسایی گفتوگۆیەك لەنێوانیاندا ڕوویدا ( ئـەی حارپە تۆ چۆنیت؟) وەڵامێكی ئاسایی لەسەر ئەم پرسیارە هەربەم شێوەیە دەبێت: سوێند بەخوا باشم وە، یان سوپاس بۆ خودا تەواوم، یان باری ئابوریم شـەكەتە وە، یـان كێـشەم هەیە، ئەمە وەڵامی ئێمەیە، بەڵام ئەو لاوە دامەزراوە وەڵامی دایـەوە و وتـی باشـم و وا دەزانم، كە عەرشی پـەروەردگارم دەبینـم لێمـەوە دیـارە وا دەزانم دانیـشتوانی بەهەشـت دەبینـم ولـەنێو نـاز و نیعمەتیـدان وا دەزانم دانیـشتوانی دۆزەخ دەبینـم هـەر هـات و هاواریانە، منیش دەرونی خۆم لە دونیا دەژەنم و شەوانە شەونخونی دەكێشم و بە ڕۆژیـیش خۆم تینو دەكەم.

سبحان الله... خەڵكانێك هەبوون لە ئومەت لـە دونیـا ژیـان و مـردن , ڕۆژێـك بـە بیریانـدا نـەهاتووە، یـان بیریـان لـە بەهەشـت نەكردۆتـەوە وەیـان نەپاڕاونەتـەوە: ئـەی پەروەردگار بمان خەرە بەهەشت و لە ئاگرمان پارێزی... ١٧ساڵ لەسەرتای تەمەنیدا... بیر لەوە بكەنەوە كە حارپە دەیڵێت دونیای لە قەبارەی خۆی دانـاوە... لەچـاوانی دا بـچوك

بۆتەوە: بەشەو نوێژ و بەڕۆژ ڕۆژوگرتن، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فـەرموو: (ئـەی حارثـە کـە زانیت پابەند ببە)، کە زانیت پابەند ببە، ئایا حارثـە پابەند بووە، یان لاوێکی هەرزە بووە و تەنها گوێ ی لە دوو ووشە بووە لە کەسێکەوە، کە ئامۆژگاری کردوە و کارەکەی تـەواو بووە ؟ نا بەدڵنیایی یەوە حارثة پابەند بوە بەڵگەش ئەمەیە کە پاش سـاڵێك لـە ڕوودانـی ئەم چیرۆکەی کە دەیگێڕنەوە پێغەمبەر(ﷺ) تیایدا فەرمویەتی: (کە زانیت پابەند ببـە) غەزای بەدر دێتە پێشەوە و موسڵمانان بۆ غـەزا دێنـە دەرێ و پـێش دەسـت پـێ کردنـی سیناریۆکانی ئەو غەزایە بچوکترین تێکۆشەر لەڕوی تەمەنیـەوە حارپـە دەبێـت وە پـێش دەست پێ کردنی غەزاکە تیرێك لە دەستی کافرەکانەوە ئاڕاسـتەی موسـڵمانان دەکـرێ و لەنێو ئەو ٣٠٠ هاوەڵەدا لەدوای ئەو لاوە دەگـەڕێ کـە پابەنـد بـووە، تیرەکـە دەدات لـە گەردنی حارپە و ئەویش دەکەوێ(ﷺ)و شـەهید دەبێـت، پاشـان دایکـی حارپـە دێـت و دەڵێت ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)ئایا حارپە لە بەهەشتدایە تـا بەختـەوەر بم وە، یـان لـە جێگەیەکی دیکەیەو هەوڵی بۆ بـدەم لـە نزاکانـدا؟ پێغەمبـەر(ﷺ) فـەرمووی: ( ئـەی دایکی حارثە ئەوە هەریەك بەهەشت نی یـە، بـەڵکو کۆمەڵـە بەهەشـتێکە و کوڕەکـەت فیردەوسی لی بەدەست هێناوە کە بەرزترینیانە).[1]

## هۆکارەکانی لادانی لاوەکانمان

## هاوەڵی خراپ

چی لە نەوەکانمان ڕویداوە؟ بۆچی لادان ڕوودەدات؟ بۆچی خەڵکی لە ڕێگـەی ڕاسـت و ڕەوان دوور دەکەونەوە، ئەو هۆکارنە چین، کە لە نێو کۆمەڵگـە و لاوانمانـدا بـە تایبـەتی دەبنە هۆی لادان؟

یەکێك لە هۆیەکانی لادانی لاوانمان ئەوەیە، کە کەسێك هەوڵ دەدات لـە خـودا نزیـك بێتەوە ڕەنگە لە کاتێکی وادا بێت، کە لەگەڵ دۆستێ، یان هاوەڵێکیدا دابنیـشێت، ئـەم دۆستەی لەکەش و هەوای ئەو پابەندی یەی دەری دەکات گەر بۆ یەك کات ژمێریش بێت،

---

١ـ بوخاری لە ئەنەسی کوڕی مالکەوە دەیگێڕێتەوە.

ئیتر ئەم كەسە ناتوانیٚ بۆ جاری دووەم بگەڕێتەوە، دەكریٚ بڵێین كە یەكەمین هۆ لە هۆكارەنی لادان هاوەڵی خراپە، زۆر سەختە كە لاوێك بەتەنها لابدات بەڵكو دەكرێت كەسێك پاڵی پێوە بنیٚ بۆ ئەو لادانەی.

ئەم وتەیە پێویستە لە ماڵان دا ئاراستەی گەنج بكرێت... چونكە دایكان و باوكان هەمیشە بە كوڕەكانیان دەڵێن لە فلان كەس دوور بكەرەوە و لە فلانە كچ دور بكەرەوە... لاوان لەوانە تەنگەلانن، بۆچی بەم شێوەیە مامەڵەمان لەگەڵ دەكەن و بۆچی ئاوا دونیامان لەسەر تەسك دەكەنەوە... بەڵام بە داخەوە وون بون بەم شێوەیە دەست پیٚ دەكات.

## ئەندێشەی بەختەوەری

هۆكای دووەم: گەڕان بە دوی بەختەوەریدا، هەندیٚ لەلاوان گومانیان وایە كە بەختەوەری لە لادانەوە دێت، بۆ نمونە مادەی بیٚ هۆشكەر دەخواتەوە، ئەمە مرۆڤێكە هیچ ئامانجێكی لە ژیاندا نی یە، دەیەویٚ خۆی لە دونیا ون بكات تا بەدوای بەختەوەری یەكی ئەندێشەییدا بگەڕێت.

ئەمە خاڵێكی گرنگە شەیتان هەمیشە دەیەویٚ ئەو شتانەت لا جوان بكات، كە دەستت پێیان ناگات واتە ئەوەی كە تۆ دەستت نایگاتیٚ ئەو لای تۆ و لەبەرچاوانت دەیرازێنێتەوەو پێت دەڵێت: ئەمە كامەرانی یە پیاوێك خێزانیكی زۆر جوان و ڕەوشت بەرزی هەیەو لە تەواوی كارەكانیدا بەختەوەری دەكات، بەڵام شەیتان هەڵدەستیٚ كە كارێكی حەرام لەبەر چاوی ئەم پیاوە شیرین دەكات و ئەویش دەڕوات بۆ لای ئافرەتیٚ، كە لەوەی خۆی كەمترە لە جوانی و ڕەوشت دا، چونكە شەیتان وات لێدەكات، كە ئەوەی نا توانی بەدەسی بهێنی شیرین تر بێت لات لەو كەسە باش و حەڵاڵەی، كە لەبەردەستت دایە... زۆرێك لەلاوان ئەمەیان لیٚ ڕو دەدات... زۆرێك لەلاوان بەناوی بەدەست هێنانی بەختەوەری یەوە مادەی هۆشبەر بەكارهێنن, ئەمەش فریوت دەدات و، قاچەكانت دەگریٚ هەڵدەخلیسكیٚ و تیا دەچیت.

## منداڵەکانتان بپارێزن

لەو باوەڕەدام کە گرنگترین هۆکارەکانی لادان: دور کەوتنەوەیە لە خـودا و وازیهێنانـە لە نوێژو کۆڕی یاد کردنەوەی خودایەی... واتە: گرنگترین شت نزیك بونەوەیە لـە خـودا و پێویستە پەیوەندی یەك لە نێوان تۆ و خودادا هەبێت...ئەمەش ئامۆژگاری یە بۆ کەس و کارێ کە لە لادانی کوڕەکەی دەترسێ کاتێ کە گەورە دەبێـت... تـۆ دەتـەوێ کوڕەکـەت ڕەوشت پاك بێت، باشە چیت پێش کەش کردوە بۆ ڕێگری لـە لادان... بـاش پـەروەردەت کردووە؟ جوانە، بەڵام ئەمە بەس نی یە، ماڵـەوە ڕەوشـتیان بـەرزە ؟ ئـەم پەیڤـەش زۆر جوانەو بریتی یە لە بنەماو ئەمەش ڕەگی سەرەکی یە... بەڵام ئاین منداڵەکەت بە باشی ڕەوشت پاك دەکات ,ئاین, نرخێك دەدات بە ڕۆڵەکەت وە وای لێ دەکات کـە لـەو پـەڕی هێز و لەوپەڕی دامەزراویدابێت و ڕۆڵەکەت لە یەکەم ڕۆژەوە لـە نوێـژ کـاران دەبێـت... وازهێنان لە نوێژ لەو کارانەیە کە چەندین دەرگای مەینەتیت لەسەر دەکاتەوە، هەر لەبەر ئەوەیە، کە پێغەمبەر(ﷺ) فێرمان دەکات (کە نوێـژ کۆڵەکـەی دینـە)[1] (منداڵـەکانتان فێری نوێژکردن بکەن).[2]

## پەلەکردن

لە هۆکانی لادان ئەوەیە کە لاوێك بڵێت من لە ئاینگەریدا هەڵدەستم بە هەموو شتێ، پاش ماوەیەك لە ناخیدا دەبینێ توانای ئەوەی نی یە کە بەردەوام بێت لەسەر هەموو ئەو کارانە، ئەو خۆی دەبینێ دەڕوخێ و دا دەمرکێت ئێمە هەروەك پێغەمبەر(ﷺ)پێی دەڵێن کە ئەو پێ ی دەفەرموێ ( ئەم ئاینە زۆر بەتینە ئێوە بە نەرمی تیایدا ڕۆبچن).[3]

کەواتە لە هۆکارەکانی لادان ئەوەیە کە دەکرێ تۆ لە ئاین شتێك وەربگری کە لەسەر و توانای خۆتەوە بێت بەمەش کاردانەوەی پێچەوانە لە هەندێ کاتدا ڕودەدات.

---

١ـ بەیهەقی لە إبن عمرەوە دەیگێڕێتەوە.

٢ـ لە ئەبو هریرەوە دەگێڕێتەوە.

٣ـ((مسند)ەکەی امام أحمد لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە وەرگیراوە.

## لاسایی کردنەوەی کوێرانە

یەکێك لە هۆکارەکانی لادانی ڕاسەقینە: لاسایی کردنەوەی کوێرانەیـە بەتایبـەتی بـۆ ڕۆژئـاوا، کـە ئەمـەش لـە ڕێگـەی پەخـشی تەلەفزیۆنـەکان و ڕاگەیاندنەکانـەوە پێمـان دەگەن... ئێمە هەمیشە شوێن ئەو دیاردە ڕۆژئاوایی یانە دەکەوین کە دەبنە مایەی لادان لەو جۆرە لاسایی کردنەوانەش کورت کردنەوەی قژی سەر و پۆشینی جل و بەرگـە... پـێم بڵێ شوێن کی دەکەویت ؟ دەتەوێ خۆت بەچی بزانیت؟ تۆ لە کوێی؟ ئەی بـۆ کەسـایەتی یـەکی هەڵکـەوتوی شارسـتانیەتەکەت و ئاینەکـەت و پێغەمبەرەکـەت و یـارانی پێغەمبەر(ﷺ) نەبیت ؟ ئەی بۆچی ئەوانەی کە ناومـان بـردن پێـشەنگت نـەبن، ئەمـە یەکێك لە هۆیەکانی لادانە کە بریتی یە لە شوێنکەوتنی کوێرانە.

## بەتاڵی و بەفیڕۆدانی کات

هـەروەها بـەتاڵی و بـێ کـاریش هۆیـەکی دیکـەی لادانـە هـەروەك هەمیـشە پێغەمبەرمان(ﷺ) دەفەرموێ: (دوو نیعمـەت زۆرێـك لـە خـەڵکی زەرەرمەنـدن تێیـدا ئەوانیش تەندروستی و بەتاڵێن).[1]

کێشەی ئەوەی کە لادان بەهەردوو ڕەگەزەوە کاتێکی زۆری بێ کاریان هەیە ئەمـە لـە زۆرترین ئەو هۆکارانەیە کە دەبێتە مایەی کارەسات خێزانی عەزیزی میسر کە دەیویـست یوسف(ﷺ) بە خۆی فریو بدات کێشە سەرەکی یەکەی ئەوە بوو کـە ئـەو بەدەسـتی بـێ کاری و زۆری بەتاڵیەوە دەینالاند... سەرنجی ئەو بەتاڵی یە بدەن کە ئەو کۆمەڵگا تێیـدا دەژیـــا ﴿ وَقَالَ نِسۡوَةٞ فِي ٱلۡمَدِينَةِ ٱمۡرَأَتُ ٱلۡعَزِيزِ تُرَٰوِدُ فَتَىٰهَا عَن نَّفۡسِهِۦۖ قَدۡ شَغَفَهَا حُبًّاۖ إِنَّا لَنَرَىٰهَا فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ﴾ یوسف: ٣٠

لەبەر ئەوە ئامۆژگاری هەر کیژێك دەکەم کـە بـەم شـێوەیە کـاتی بـەتاڵی زۆرە بـەو شێوەیە نەمێنێتەوە، بەڵکو بڕوات خۆی فێری شۆفێری بکات و ڕێگریش نی یە لەوەی کە

---

١ـ بوخاری لە ابن عباسەوە وەری گرتوە.

لە هۆڵێکی داخراودا وەرزش بکات بەمەرجێ لەنێو خەڵکیدا نەبێت، باخۆی فێری یەکێك لە زمانەکان بکات یا فێری کۆمپیوتەر بێت، باخۆی فێری ئەنتەرنێت بکات، چونکە ڕاست نی یە کە هەرگیز کاتی خۆی بەفیڕۆ بدات .

عبدالله ی کوڕی مەسعودیش دەفەرموێ: موسڵمان ناگاتە ڕاستی باوەڕەکەی هەتا ساتەکانی ژیانی لە ماڵ و دارایی یەکەی لا بەڕێزتر نەبێت، هەروەها لە (الاثر)دا هاتووە، ڕۆژێك هەڵنایەو خەڵکێکی تێدا بێت، ئەوا ئەو ڕۆژە بەخەڵکەکە دەڵێت: مـن ڕۆژێکی نوێم و لەسەر کارەکانی تۆ شاهیدی دەدەم، غەنیمەتم دەستبخە، چونکە مـن ناگەڕێمەوە تا ڕۆژی قیامەت.

ئەو ڕۆژەی، کە بەسەرتدا تێدەپەڕێ و سودت لێ وەرنەگرتوە ئەوا تۆ زۆرت تیا دۆڕاندوە، دەروی تۆ سەرمایەتە، بنەمای تەمەنی تۆ تەنها چەند نەفەسێکە و هەر کەس لە دەستیان بدات سوێند بەخوا ڕۆژی دوایی پەشیمانی بۆ دەکێشێ.

ئیبن قەیم دەفەرموێ هەمو نەفەسێك و هەمو ئارەقێ ڕشتنێ کە لە دونیادا بەبێ ملکەچی خوای گەورە بێتە دەر لە ڕۆژی زیندو بونەوەدا دەبێتە حەسرەت و پەشیمانی... ئەو هەناسە و ئارەق ڕشتنەی کە لە دونیادا بۆ هەر شتێ بڕژێ و بێتە دەر... لە بەتاڵیدا... لە بەفیڕۆدانی کاتدا ئەوا ڕۆژی دوایی وەك حەسرەت و پەشیمانی دێتە دەر.

## دەمامکی ساختە بۆ حەرام

دەبینم، کە فیتنە لە دەورو بەرماندا زۆر زۆرە، گرفتی ئەو فیتنانەش ئەوەیە وادێتە پێش کەهیچ گرفتێکی تێدانی یە، یان حەلاڵە و ئێمە دەست بەجێ و بەبێ بیرکردنەوە ئەنجامی دەدەین.

کەواتە لە هۆیەکانی لادان ئەوەیە:کە ناوەکان سەراو ژێر کراوە تاوانە گەورەکان و حەرامە بەتینەکانیش (خۆشگوزەرانی و بەشارستانی بونە)، کە کێشەکە ئەوەیە، کە لاوان بە باشی سەما نازانن! بۆ نمونە کە کیژێك دەبینێ لە خۆشیدا دێتە سەما و جۆش و کەلێی دەپرسی بۆچی وا دەکەیت؟ پێت دەڵێت: نا من سەمام لەبەردەم کەسدا نەکردوە، بەلاًم لەبەر ئەوەی کە ئەمە شادومانی یەو ئەگەر ئەوە نەبوایە من هەرگیز کاری وام نەدەکرد.

ئەمە ڕاست نی یە و هیچ سودێکی نی یە وەرن با پێوەرەکان دابنێین ئەوەی پەروەردگارمان پێمان دەفەرموێ حەرامە ڕاست نی یە ئێمە هەڵسین ئەگەر چی بە شارستانی بونیش بێ، یان ناوی لێبنری پاڵدانەوە.

لەو بڕوایەدام لە هۆکارەکانی لادان نەفامی و تێنەگەیشتنە لە سۆز و میهری خودا، مرۆڤ کاتێ کە پابەند دەبێت و هەندێ تاوان دێتە پێشەوە دەڵێت: دڵنیام کە پەروەردگارم لێم نابورێ، چونکە من زۆر کاری لەوە گرانترم کردوە کە ئەو لێی ببورێ، کارەکە لێرەدا بەوە کۆتایی دێ واز لە ڕێگەکە دێنی کە بەهۆی ئەوەی لە یادی نامێنی کە ئادەم هەڵەی بەخۆی کرد، هەر ئادەم بوو کە خوای گەورە فریشتەکانی بۆ هێنایە سوژدە بردن لەگەڵ ئەوەشدا هەڵەی کرد، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِنِّي لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ثُمَّ ٱهْتَدَىٰ﴾ طه: ٨٢

لەڕاستیدا بنەمای سۆز و لێبوردن و لێخۆش بوون لای خودای گەورەیە، ئەو کەسەی کە ئەم مانایە نازانێ دەکەوێتە هەڵەوە و دەڵێت: هیچ هیوایەکم بەوە نەماوە کە خوای گەورە لێم ببورێ... ئەمە پێویستی بەڕاست کردنەوەی کارەکە هەیە.

## ژەهری تەلەفزیۆنی فەوتێنەر

یەکێك لە هۆکارەکانی دیکە خۆ خەریك کردنی لاوانە بە بینینی کەناڵە ئاسمانی و ئەوروپی یەکان و ئەو فلیمانەی کە لە دەرەوەی بازنەی ڕەوشتدان.

لە هۆکانی لادان ئەوەیە کە هەندێ کەس لەسەر سایتی ئینتەرنێت و کەناڵە بەدڕەفتارەکان دەیبینن لەو دیمەنانە، کوڕی گەنج لەبەر زۆری ئەوەی کە دیویەتی وا دێتە پێش چاوی کە هەموو جیهان وەك ئەوە وایە کە دەیبینی و دێتە پێش چاوی ( بە داخەوە کە من ئەمە دەڵێم)، کە هەمو ئافرەتان وەك ئەوانەن، کە بینیویەتی، لەبەرئەوەی کە دیمەنەکانی دیوە و خو بە بینینیانەوە دەگرێ و ئەو کاتە بەو شێوەیە مامەڵە لەگەڵ ئافرەتاندا دەکات.

لە ڕاستیدا ئەمە لە سامناکترین ئەو شتانەیە کە خوای گەورە پەست دەکات، سەرنج بدە کە تۆ لە بەردەم پەروەردگارمان دا وەستاویت و ئەو ئامێرەش ئەو ڕووتی و تاوانەنەت نیشان دەدات کە دیوتن وریابن ئەی لاوان پێویستە تۆ بیڵێی کە من هەرگیز تەماشای ئەوە ناکەم... من پێت ناڵێم ئینتەر نێت و کەناڵە ئاسمانیەکان سەیرکردنیان حەرامە، بەڵام ئینتەرنێت شتانێکی زۆری تێدایە کە ڕەنگە فیلتەر بکرێت و کەناڵە ئاسمانیەکان لەم جۆرە کارانەی تێدایە و دەست بەجێ شفرە دار دەکرێن وە گەر بێت و نەفست بەرەلاّ بکەیت بۆ دیتنی ئەو جۆرە کارانە ئەوا زۆر دۆڕاوی... بۆیە منیش تکا دەکەم لە لاوان کە خۆیان لەبەردەم ئەم کارەدا ڕابگرن و پێویستە بە دەرونی خۆیان بڵێن نا...

پێویستە ئەوە تێبگەین، کە سەرقاڵکردنی دل بەبێ خۆشەویستی خودا و شارەزا کردنی لە هۆکارە بنەڕەتی یەکانە... ئەو نازانێ بۆ هاتۆتە بوون کەواتە پێشبینی چی دەکەیت ؟ دڵنیام کە ئەو لە دونیا سەرگەردان دەبێ وە دڵنیام کەشەیتان دەست دەکات بە گرتنی لە هەموو ڕێڕەوێکدا هەتا خوای گەورە نەناسێ لەبەرئەوە ئەی ئەو کەسەی کە لە خۆت دەترسی لە لادان... گوێ بۆ ئەم فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ)بگرە کە دەفەرموێ: ((احفظ اله یحفظك، إحفظ الله تجده تجاهك و اذا سألت فاسأل الله و اذا إستعنت فاستعن بالله )) وشەی ((إحفظ الله)) واتە: با خوای گەورە دڵت پڕ بکات، با خوای گەورە فاکتەری ژیانت بێت، سەیری شیاوی و جوانیت بکە با بت گەیەنێتە خوای گەورە، پەروەردگار لە فەرمودەیەکەی قودسیدا دەفەرموێ: (بەردەوام بەندەکەم بەچاکە کردن لێم نزیك دەبێتەوە) سوننەتی زۆر بەجێ بهێنە با خوای گەورت لە یادبێ... دورکات نوێژ بەشەو بکە ـ ڕۆژو بگرەو چاکە بکە (هەتا خۆشم بوێ ئەگەر خۆشم ویست دەبمە ئەو هەستانەی کە پێی دەبیستێ و دەبینێ و ئەو دەستانەی کە زەبر و زەنگی پێ دەنوێنێ و ئەو پێ یانەی کە پێی دەڕوات) چۆن؟ حەرامت پێ نیشان نادات، گەر ویستت سەیری کەناڵێکی بەد ڕەوشتی ئاسمانی(سەتەلایت) بکەیت ڕێگەت پێ نادات، ئەگەر حەرامت دیت ڕێگە نادات بڕواتە دڵتەوە وە ئەگەر چویە دڵتەوە دوچاری فیتنەت ناکات، ئەگەر کارێکی حەرامت کرد وات لێدەکات کە بڵێی من ئەم کارە هەرگیز دوبارە ناکەمەوە.

لەبەر ئەوە گەر ویستت لە فرەیی ئەو لادانەی کە ڕوبەڕوی ئەم کۆمەڵگایە بۆتەوە لە ئێستادا ڕزگارت بێت، پەنا بۆ خودا بەرەو برۆ نێو قەڵای خودایی یەوە، سبحان الله.

## ئامانجی خۆت دیاری بکە

گرنگترین هۆکارەکانی لادان بریتی یە: لە دیاری نەکردنی ئامانجەکان لەژیاندا، دەکرێ هاوەڵێکم بێت و پێم بڵێ من دڵتەنگم وەرە بڕۆین بۆ جێگایـەك، ئـەو پۆشـاکە بپۆشـە و ئەوەیان تاقیبکەرەوە ترسناکترین شت کە گەنج سەرگەردان دەکات ئەوەیە کە نازانێ چـی دەوێت، من چیرۆکێکی زۆر سەیرم لایە کەناوی (ئەلیس لە وڵاتی سەرسـوڕهێنەرەکاندایە) ئێمە منداڵ بـووین چـیرۆکی کیژۆڵەیـەکمان دەخوێنـدەوە بـەناوی (ئـەلیس)ەوە ئـەو بـە ڕێگەیەکی چەند ڕێچکەدا ڕێی دەکرد، بەڵام نەیدەزانی بەکامیاندا بـڕوات، لێـرەوە، یـان لەوێ، چاوی بەکەروێشکێك کەوت پێی ووت ئەی ئەلیس بۆ کوێ دەڕۆیت ؟ ئەویش ووتی نازانم... کەروێشکەکە پێی وت: بەو ڕێگەیەدا بڕۆ کە بەردەوام نازانی بۆ کوێـت دەبـات، ئەم پەیڤە سەردەمێ بە ئێمە وتراوە کە منداڵ بوین و ئێستا کـە لـە تەمـەنی٣٠ سـاڵی و٢٠ ساڵیدان لەگەڵمان ڕوودەدات.

هەرچیت دەوێ لە دونیا دەست نیشانی بکە... وە بە چێژترین شت ئەوەیە لە دونیا کە ملکەچ و بەندەی خوا بیت و لەدوارۆژدا بچیە بەهەشتەوە.

لە ڕاستیدا هۆیەك هەیە کـە ئێمـە ئاماژەمـان پـێ کـرد لـە دورەوە، بـەڵام مـن لـە گرنگترین ئەو شتانەی دەبینم کە وتران و لەگرنگترین هۆکارەکانی لادان ئەویش بریتی یـە لە هەڵوەشانەوەی خێزانی، وە هەڵوەشانەوەی خێزانیش شتێکە کە کۆمـەڵگای ئـەمڕۆمان بەدەستیەوە دەناڵێنێ و ژمارەیەکی زۆری لاوانی سەرگەردان کردوە وە بەڵگەش بـۆ ئەمـە ئەو چیرۆك و بەسەرهاتانەیە کە لەسەر زاری خاوەنەکانیان دەیخوێنینەوە.

# چەند چیرۆکێکی ڕاسەقینە

## خودایە فریاد ڕەسێکم بۆ بنێرە

من ناوم مستەفایە و لەکۆلێژی یاسام لە زانکۆی قاهیرە و تەمەنم ٢٥ ساڵە و هێشتا لە قۆناغی دووەمدام، بەڕاستی تەمەنی ٢٥ ساڵی و لەقۆناغی دووەمدا شتێکی نامۆیـە، بەڵام ئەمە هۆکاری تایبـەتی خـۆی هەیـە و مـن باسـیان دەکـەم، لەیـەکێك لـە ساتە وەختەکانی ژیانمدا خێزانەکەم هەڵوەشایەوە و ئەمەش کاری کردە سـەرم. واتـە ماّمەڵـەی باوکم زۆر توند بوو لەگەڵمان و ئێمە دایکیشمان نەبوو، دیارە دایکیش ڕۆڵی زۆر گرنگـی لە ژیانی منالەکانیو من زۆر پەیوەست بووم بە دایکمەوە، نا سەقامگیری من و گرفتـە هەمیشەیی یـەکان وای لێ کردبـووم لـەماڵ هـەڵبێم و دور بکەومـەوە، بـەدۆخێکی زۆر گـەورەی سـەرگەردانی و ئاوارەیـدا تێپـەڕیم، مـن نـە شـوێنێکم هـەبوو تیایـدا بخـەوم نەسەرچاوەیەکی دارایم هەبوو کە پێی بژیم، ژیـانم بـە تـەواوی و بەهـەموو ماناکانیـەوە سەرگەردانی بوو، هەتا وام لێهات لەسـەر شـەقام و پارکەکانـدا دەنوسـتم، ڕوبـەڕوی زۆر شتێك دەبومەوە و بەدوای خۆمدا دەگەڕام، بە دوای ژیانێکدا دەگەڕام جگە لـەو ژیانـەی کە تیایدا هەڵهاتبوم لە دەستی ماڵ و خێزان، هەتا نەخۆش کەوتم و دوچاری هەڵئاوسـانی سنگ بوم بەهۆی ئەوەی کە هەمیشە لەسـەر شـەقامەکاندا دەژیـام، دواتـر بـەهۆی ئـەو چارەسەرانەی کە پزیشك پێیدام چەند جارێ هەوڵی کوشـتنی خـۆمم دا، چـل دانـە حـبم وەرگرت ئەوە بەسبو بـۆ کوشـتنم، بـەڵام نەیکوشـتم، بەداخـەوە مـن لـەم کاتـەدا هـیچ پەیوەندی یەکم بە خوداوە نەبوو لەبەرئەوە پەنام بـرد بـۆ خـواردنی مـەی و مـادەی بـێ هۆشکەر و ئەمە یەکێکە لەو هەڵانەی کە هەندێ لەلاوان پەنای بۆ دەبەن، لەو کاتەی کـە لاوێك خۆی تێدا نادۆزێتەوە، یان کەسێك لەدەوروبەری خۆی نادۆزێتەوە جا پەنا دەباتەبەر شتێك کە دووری کاتەوە لەبیرکردنەوە لەو ژیانـەی کـە تیایـدا دەژی، ئەمـە لەکاتێکـدا ڕوویدا من دەستم دایە کارکردن و پارەی هەموو ئەم شـتانەم دەسـتەبەردەکرد پـارە پەیـدا کردن بۆ من ئاسان بوو هەر ئەمەش بوو کـە گەیاندمیـە سـەرگەردانی خـۆمم لـە هـیچ شتێکدا نەدەدیتەوە، ئەوە بەسە کە مـن هێـشتا لـە قۆنـاغی دووەمـی زانکـۆ دام و دوا

کەوتوم لەهەمو پاڵنەرەکانی ئەم چوارساڵە بێ کارم و باری کۆمەڵایەتیشم ناتەواوە و هیچ شتێکم تەواو نی یە، هەوڵم دا هەرچۆن بێت ژیانم ڕێك بخەم، بەڵام من جگەرە کێش بوم و بەردەوام و ڕۆژانە مادەی بێ هۆشکەرم دەخوارد وە ئەمە لە ژیاندا زۆر بـوو بـۆ مـن لـە خواردن و خواردنەوە گرنگتر بوو، ئەی پەروەردگار فریاد ڕەسێکم بۆ بنێرە... یـەکێك لـە هاوڕێکانم لەگەڵ خۆی بردمی بۆ مزگـەوت بـۆ بـەجێ هێنـانی نوێـژی خـەوتنان... مـن نەمدەویست لەگەڵی نوێژ بکەم و دەم ویست کە بیانویـەك دروسـت بکـەم، بـەڵام خـوای گەورە هەر کاتێ ویستی بەشتێك بڵی ببە دەبێت و کەس ناتوانێ ویست و ئیرادەی خـوای گەورە بگۆڕێ... ئەمە یەکەمین هەنگاوم بوو بۆ نزیك بونەوە لە خوای گەورە، چومە نێـو مزگەوتەوە و نوێژم خوێند و، گوێم لە وانە کانی دوای نوێـژ گـرت، ئەمـە زۆر کـاری لێ کردم و ئەمەش یەکێك بو لەو هۆکارانەی کەوای لێ کردم، کە سەرزەنشتی خـۆم بکـەم و ژیانی ڕابردومی تێدا هەڵبسەنگێنم و، پاشان بەردەوام بـووم لەسـەر گـوێگرتن لەوانـە و نوێژەکانم، بەڵام پاش ئەوەی کە لە خوای گەورە نزیك بوومەوە بەچـاوی خـۆم دیـتم، کـە مرۆڤ چۆن هەست بە ئارامی و بەختەوەری دەکات کاتێ کەنزیکە لە خوای گـەورە وە لـە پەیوەندی بونی بە خوداوە و ملکەچـی کردنـی، تاقیکردنەوەیـەك هاتـە پێـشێ و تیایـدا کـەوتم، هـاوەڵێکی دێـرینم هـانی دام کـە بخۆینـەوە و بڕۆینـە دەرێ و جـارێکی دیکـە بگەڕێمەوە سەر ئەو ڕەفتارانەی، کە بڕیارم دابوو لێی دور بکەومەوە. پێکەوە دەرچـوین و مادەی سڕکەرمان خواردەو و دیتم کە من زۆر بەخێرایی پێشوازی لە هەڵەدەکـەم و هـەتا وریاش بومەوە، ویستم بچم بۆ مزگەوت، بەڵام هەستم کرد کـە خـوای گـەورە ئەمـەم لێ قەبوڵ ناکات و ڕێگەم پێ نادات کە بچمە مزگەوتەوە ئەوە ئەو ئەو ساتە بوو کـە تیایـدا بڕیارم دا نەگەڕێمە سەر هەڵە و تاوان و سەرپێچی کردنی خوای گـەورە و گـوێ بـۆ هـیچ قسەیەك نەگرم کە بە جگەرەیەك، یان خواردنەوەیەك وە، یان کیژێك وەیـان هـەر کارێـك دیکە بێت لە خشتەم بەرێت، لەبەر ئەوەی کە ئەمە سزای لای پەروەردگار زۆر خێرایە.

من زۆر خۆم بە بەختەوەر دەزانم و لە خۆشترین کاتـەکانی ژیانمـدام پـاش ئـەوەی کـە گەڕاومەتەوە بۆ لای پەروەردگارم وە وا هەست ناکەم کە ئەوەی لە دەستم دەرچووە تیایـدا ژیاوم.

من پرسیارم لە مستەفا كرد: چۆن بەپەلە وازت لە مادەی بێ هۆشكەر هێنا ؟ ئەویش ووتی چارەسەری خودایی بوو بۆ ماوەی ٣٠ ڕۆژ لە مزگەوت خەڵوەتم كێشا، ئەم خەڵوەت كێشانە شتێكی زۆر نامۆ تێدا ڕویدا، لە دە ڕۆژی یەكەمدا زۆر دەچومە گەرماو(حمام)ەوە وەك ئەوەی بڵێی مادە سڕكەرەكان لە جەستەم دەردەپەڕین، وەمن هیچ كەسێكم، تا ئێستا بەم شێوەیە نەدیوە كە چارەسەر كرابێ و هەروەك ئەوەی خوای گەورە پێی خۆش بوە پێم بڵێ: تۆ لای منی و شیفات دەدەم بەڕێگەیەك كە هەرگیز لەگەڵیدا ماندو نەبیت و هەرگیز تیایدا هەست نەكەیت، لەگەڵ ئەوەشدا كەسێك، كە دەست دەكاتە كێشانی جگەرە و مادەی بێ هۆشكەر زۆر بەلایەوە سەختە كە لێی دور بكەوێتەوە ئەگەر لەلایەنی جەستەیی یەوە بێت وەیان دەرونی خوای گەورە منی لە ماڵەكەی خۆیدا ڕێز دار كرد سوپاس بۆ خودا.

پاش گەڕانەوە لەم گەشتە دوور و درێژە زۆر تامەزرۆیی كەسەكانم بووم من تەنها داوای ڕەزامەندی ئەوانم دەكرد و هیچی دیكەم نەدەویست من هێندەی بیر لە بیرو باوەڕەكەم دەكەمەوە هێندە بیر لە پارەو پول ناكەمەوە... واتا بیرم كردەوە و دیتمەوە كە گرنگترین شتێك كە خوا فەرمانمان پێ دەدات پەرستنی خوای گەورەیە، چاكە كردن لەگەڵ دایك و باوك و ڕەزامەندیانە، من گەر لەسەر ڕێگا بم و ملكەچی خودا بم و كەسەكانم لێم ڕازی نەبن وەك ئەوە وایە كە هیچم نەكردبێ.

لە ڕاستیدا دەمەوێ ئەم هەلە بقۆزمەوە و ئەم پەیامەم ئاڕاستەی هەر مرۆڤێك بكەم كە بۆ ماوەیەكی كورتیش بێت بۆتە مایەی دڵ ڕەنجاندنی دایك و بابی...

فرمێسك ڕشتنی دایكان و سور هەڵگەڕانی باوكان لەتای تاوانەكاندا لەوانەیە بەقەد گوناهی یەك ساڵ بێت , و هەندێ كات ئێمە زاڵ نابین بەسەر ئەم گرفتەدا، ئەو لاوەی كە هەمو ساڵی لە كۆلێژدا دەكەوێ و هەست بە نیگەرانی دایك و باوكی ناكات ئەوا تاوانێك ئەنجام دەدات كە بێ سەرەتا و كۆتایی یە با ئاگاداری خۆمان بین، چونكە دایك وباوك گەر مردن و لێت پەست بوون، پەنا بەخوا تۆ لە تەنگ و چەڵەمەدا دەبیت وە خوا دەزانێ كە لێت خۆش دەبێت، یان نا؟

## چیرۆكی عبد الله (ذی البجادین)

لە كۆتایدا دەمەوێ چیرۆكی مرۆڤێك بگێرمــەوە كــە ژیــانێكی زۆر ســەخت و دژواری هەبووە، بەڵام توانیویەتی لەسەر ملكەچی كردنی خوای باڵادەســت دەمــەزراو بێــت، ئــەم نمونەیە خەڵات و دیاری بێت بۆ مستەفاو هەمو ئەو كەسانەی كە لەگەڵیدان، هەروەها بــۆ ئێمەش ئەمە نمونەیەكە بۆ یەكێك لە هاوەڵان كە نــاوی ( عبــد الله ذو البجــادین) بــووە، بەڵام ئەمە ناوی ڕاستەقینەی نەبووە بەڵكو ناوی ڕاستەقینەی عبــد العــزای المزانــی بــووە لەتیرەیەك بوە كە ( المزانیە) و لەنێوانی مەككە و مەدینە نیشتەجێ بوون.

هەر لە منداڵیدا دایك و باوكی مردون و مامەی بەخێوی كردوە، مامی پیــاوێكی زۆر سەرمایەدار بووە و پارە و پولێكی زۆری بۆ خەرج كردوە، عبد العزی المزانی گەورە بوو تا تەمەنی گەیشتە ١٦ ساڵان و بینی، كە سەرمایەیەكی زۆری هەیە و زۆریش نازدار بوو بە ڕادەیەك ڕازی نەبوو بەوەی ئەو پۆشاكانە لەبەر بكات كە دروســت كــراوی وڵاتەكەیــەتی، بەڵكو هەمویانی لەدەروە بۆ دەهات، ئەو دو ئەسپی هەبوو هەر جارەی ســوای یــەكێكیان دەبوو خەڵكی شارەكەی هەموو بت پەرست بوون، لــەم نێوەنــدەی كــە هــەمووان پولــەكی (مادی)ن و نــوقمی خۆشــگوزەرانین، ئــەم كاتــە هاوكــات بــوو لەگــەڵ كۆچــی هــاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) لە مەككەوە بۆ مەدینە و خوای گــەورە ویــستی وابــوو كــە عبــد العــزی المزانی چاوی پێیان بكەوێت و گــوێ لــە پەیڤــەكانیان بگرێــت و پێیــان كاریگــەر بێــت و ئیسلامەتی خۆی ئاشكرا بكات و ژیانی خۆی بە ١٨٠ پلە بگۆڕێت، عبــد العــزی هــەموو ڕۆژێ دەكەوتە شوێن یاران لە نێوان مەككەو مەدینە دا و پێی دەوتن چاوەڕی بكەن هــەتا قورئانم لە ئێوەوە گوێ لێ بێت و ئایەتێكی نوێ لەبەربكەم... سەنج بدەن كــە ئــەو چــۆن فێری قورئان بوو، لە حاڵەتی دڵەڕاوكیٚدا و یاران دەترسان لەوەی كە لەگەڵ ئەودا چاوەڕێ بن هەتا چاوی ناحەزانی قورەیشیان نەگاتێ، بەڵام لە مێشكی عبد العزی دا نەمادە و نە سەرمایە و نەخۆشگوزەرانیش نەمایەوە بەڵكو ئەی ویست لــە پــەروەردگار نزیــك بێتــەوە هەتا یەكێك لە هاوەڵان پێ ی ووت بۆ لەشارەكەتدا چاوەڕوانی ؟ كۆچ بكــە بــۆ مەدینــە، ئەویش دەڵێت ئەی واز لە مامم بێنم ؟ من كۆچ ناكەم تا دەستی مامم نەگرم بۆ ڕێنمونی

ئەو لە نێو تیرەکەیدا بۆ ماوەی سێ ساڵ مایەوە... سێ ساڵ لە جێگایەکدا کە هەموویان دوربون لە ملکەچی خوای گەورە، شاری هەموو دانیشتوانەکەی بت پەرست بوون و کەسێك نەبو تیایاندا پەنای بۆ بەرێت... سێ ساڵ ئەو سوور بوو لەسەر ملکەچی خوای گەورە و دامەزراوی ئەو دەیویست خوای گەورە بپەرستێ و بڕواتە دەری شارەکەی، لەنێو بیابانێکدا بێت کە کەس نەیبینێ، چونکە ئەو ئیسلامەتی خۆی دەشاردەوە و دەوەستاو نوێژی دەکرد، هەمو ڕۆژێ دەچویە لای مامی و دەیوت ئەی مامە من گوێم لە کەسێك بوو ناوی محمد بوو، کە ئاواو ئاوای دەوت قورئانی بەسەر مامیدا دەخوێند، بەڵام مامی بەچەند قسەیەکی ناشیرین وەڵامی دەدایەوە، سێ ساڵ لە نێو ژینگەیەکدا، کە زۆر سەخت بوو وە عبد العزی المزانی بە ئارام و دامەزراو بوو هەتا ئارامی یەکەی گەیشتە ئەوەی کە چویە لای مامی و پێی ووت: ئەی مامە لە پێغەمبەری خوات(ﷺ) دوا خستم، من ئیتر نامەوێ لێ ی دور بم وەمن ئاگادارت دەکەمەوە کە شاهیدیم داوە بەوەی، کە ((أشهد أن لا اله ألا الله وأن محمدا رسول الله)) ومن کۆچ دەکەم بۆ لای ئەو، گەر بتەوێ لەگەڵم بێیت ئەوا من بەختەوەرترینی بەختەوەرەکان دەبم، مامەی پێی وت: ئەی ئەگەر ئیسلامم پەسەند نەکرد و هەرچیت هەیە لێم سەندیتەوە، ئەویش ووتی چیت دەوێ بیکە من لە خودا و پێغەمبەری خوا(ﷺ)زیاتر هیچی دیکەم ناوێ.

## جەخت کردن و دامەزراوی و جێگیری...

ئینجا مامی عبد العزی بەباوەڕ پێ نەبونەوە هەڵدەستێت و پێی دەڵێت: ئەگەر سور بیت لەسەر ئەم کارە هەڵدەستم و لە ناو جل و بەرگەکەت دەرت دێنم!! و، پاشان هەڵدەستێ و جل و بەرگەکەی لەبەردا دەدڕێنێ، ئەو خۆیی بەجۆرێ بینی، کەشەرمی دەکرد، بەڵام هەر سور بوو لەسەر چونە دەرەوە بۆ لای حەزرەت، ئەو پارچە قوماشێکی خەتداری دۆزی یەوە کە لە خوری چنرابوو عەرەب پێی دەڵێ، بجاد و خۆمان پێی دەڵێین: (مەوج) کردی بە دوو کەرتەوە و وەك جل و بەرگی ئیحرام لەبەری کرد... دواتر کۆچی کرد و چویە لای پێغەمبەر(ﷺ) حەزرەت پێ ی فەرموو: تۆ کێی ؟ ئەمە یەکەمین جار بوو کە پێغەمبەر(ﷺ) بیبینێ، سەرنجی ئەم دامەزراوی یە بدەن . بۆ ئەوەی کەس نەڵێت ئەوانە لەسەر دەستی حەزرت پەروەردە بوون ئەوەتا ئەم پیاوە پێشتر پێغەمبەری(ﷺ)

نەدیوە بۆ یە وتی مــن: (عبــد العــزی)م پێغەمبــەر(ﷺ) فــەرموی ئــەی بۆچــی ئەمــەت پۆشیوە؟ ئەویش ووتی مامەم ئاوای لێکردم و منــیش تــۆم هەڵبــژارد ئــەی پێغەمبــەری خودا(ﷺ)سێ ساڵە خۆم دەگرم, و تا ئاواو دروست لەسەر ملکەچی خوای گەورە هاتومــە خزمەتت، پێغەمبەر(ﷺ)فــەرمووی (یــانی ئەمــەت کــرد؟) ئــەویش ووتــی: بــەڵێ ئــەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو (لەمڕۆ بەدواوە تۆ عبــد العــزی نیــت تــۆ (عبد الله ذوالبجادین) یت، خوای گەورە لەبەری ئەم دو مەوجە خانویەك و عابایەکی لــە بەهەشت بۆ داناوی چۆن لەبەریان دەکەیت و چۆن لێیــان دەخۆیــت ئــارەزوی خۆتــە) ئــەو لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)دا مایەوە هەتا لە تەمەنی ۲۳ ساڵیدا لەکاتی غەزای تەبوك کۆچی دوایی کرد، عبــد الله کــوڕی مەســعود چــیرۆکی بەســەرهاتی مردنەکــەی دەگێڕێتــەوە و دەفەرموێ من لە ترسی سەرما و تاریکی شەو نوستبوم گوێم لە دەنگی هەڵکەنــدی چــاڵ بوو لە زەویدا، سەرسام بووم !کێ بەم شەوە و بــەم ســەرمایە چــاڵ هەڵدەکــەنێ ؟ ســەیری شوێنەکەی حەزرەتم کرد، بەڵام لێی نەمابوو، پاشان ســەیری شــوێنەکەی عومــەرم کــرد، بەڵام نەمدیتەوە دواتر سەیری شوێنەکەی ئەبوبەکریــشم کــرد چــۆڵ بــو لــە شــوێنی خــۆم هەستام ئەبو بکر و عومەرم دی کە چرایەکیان گرتبوو بەدەســتەوە و پێغەمبــەریش(ﷺ) چاڵی هەڵدەکەند چومە لای و پێم ووت: ئەوە چی دەکەیت ئەی پێغەمبەری خــوا؟ ســەری پیرۆزی بەرز کردەوە دیتم چاوی نوقمی فرمێسك بووە و پێی ووتم: (( ذو البجادین ی برات مرد) سەیری خۆشەویسی حەزرت بکە بۆ ئەم لاوە دامەزراوە، سەیرێکی عومــەر و ئــەبو بکرم کرد و ووتم ئێوە دەوەستن و حەزرەت چاڵ هەڵکەنێ ئەبوبکر پێــی ووتم: پێغەمبــەری خوا(ﷺ) سورە لەسەر ئەوەی کە بەدەستی خۆی گۆڕەکەی بۆ هەڵبکەنێ، پاشان حــەزرەت دەستی درێژ کرد بەڕوی ئەبو بکر و عومەر و فەرموی براکەتانم بۆ دابهــێڵن ئــەبو بکــر و عومەریش جەستەی عبد العزی، یان دایــە دەســتی پێغەمبــەر(ﷺ)، پاشــان فــەرمووی: (بەزەیتان بێتەوە بە براکەتاندا... بەزەیتان بێتەوە بە براکەتاندا ئــەو خــوا و پێغەمبــەری خوای خۆش دەویست، پێغەمبەر(ﷺ) بەدەستەکانی گرتنی و فرمێسکەکانی کەوتە ســەر کفنەکەی عبد الله ذو البجادین و لە گۆڕەکەی داینا، پاشان حەزرەت دەســتی بــۆ ئاســمان بەرز کردەوە و فەرمووی: (خوایە من بەشاهید دەتگرم کە من ڕازی بووم لە ذی البجادین و ئەی پەروەردگار تۆش لێی ڕازی ببە).

پێغەمبەر(ﷺ) بە دەستە پیرۆزەکانی عبدالله ذو البجادین بەخاك دەسپێرێ و دەفەرموێ: (ئەی پەروەردگار بەزەیت پێدا بێتەوە ئەو قورئان خوێن و خودا و پێغەمبەرەکەی(ﷺ) خۆش ویستوە، ئەمە نمونەی خەروارێکە بۆ لاوی دامەزراو و جێگیر، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ لە رۆژێکدا کە هیچ سایە و سێبەرێك نی یە جگە لە سایەوسێبەری خودا حەوت کۆمەڵ لەژێر سایەی خودادا دەبن یەکێك لەوانە لاوێکە کە لە سایەی خودادا گەورە بووبێ).[1]

ئای لەو خۆشبەختی و مزگێنی یە !! ئەی لاو!!

ملکەچی پەروەردگارت ببە ئەگەر چی پێشتر سەرپێچیت کردبێ، خوای تۆ دەبورێ و لە گوناهان چاوپۆشی دەکات... ملکەچی بۆ پەروەدگارمان تەواو بکە ئەوا تۆ لەرۆژی گەرمی فەسلاندا لەژێر سایەی ئەودا دەبیت... رۆژێك جگە لەسایەی ئەو هیچ سایەیەکی دیکە نی یە.

## نزا

### نزا پەرستشە

نزا یەکێکە لە پەرستشەکان، بەلاّم پێش ئەوەی دەربارەی ئەم پەرستشە بدوێین پێویستە من ئەوەت پێ بڵێم کە هەستی پێ دەکەم.

لە ڕاستیدا ئێمە هەموومان هەندێ جار بەدەستی کۆمەڵە گرفتێکەوە دەناڵێنین و پێویستیمان بە پەوەردگارمانە هەموومان هەژارین بۆ پەروەردگارمان،وە هەموو کەسێك لە ئێمە ئاواتێکی هەیەو دەیەوێ بۆی بێتەدی، هەیە لەناو ئێمەدا هەڵەیەك، یان تاوانێکی کردوەو خوازیارە کە پەروەردگار لێی ببورێ، بەلاّم هەمومان بێ جیاوازی داوا لەخوا دەکەین و ئەمەش پێی دەوترێ نزا.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِ ۖ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ﴾ فاطر: ١٥... هەژاری یەکی ڕەها هەژاری لە هەمووشتێکدا، لە

---

[1] ـ بوخاری لە ئەبو هریرەوە وەری گرتووە.

دەربڕینەکەدا کەسی جیا ناکرێتەوە , دەوڵەمەند هەژارە، هەژار هەژارە، دادوەر هەژارە ئەو کەسەی یاسای بەسەردا سەپێنراوە هەژارە گەورە هەژارە خزمەت کراو هەر هەژارە.

هەموومان هەژارین لای خودا، ئەو بەتەنیا بێ نیازو دەوڵەمەندە... لەبەرئەوە ئێمە هەمیشە پێویستیمان بەخودایە... کاتێ کە پەروەردگارمان دەفەرموێ: ﴿وقال ربکم ادعوني استجب لکم﴾ غافر: ٦٠، ئەمەوێ لەگەڵ مندا بیر لەم واتایە بکەیتەوە خوای گەورە پێت دەفەرموێ بەتەنها پاڕانەوەت لە ئەو نزاکەت وەڵام دەداتەوە، ئایا ئەم ووتەی پەروەردگار بەڕاست دەزانی، یان نا؟، خوای گەورە بە ڕونی فەرمویەتی و سەیر لەوەدایە پیاوێك دێتە خزمە پێغەمبەر(ﷺ)و پێی دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا ئایا پەروەردگارمان لێمانەوە دورە بانگی بکەین وە، یان لێمانەوە نزیکە و لەگەڵ خۆیدا ڕازو نیاز بکەین ؟ ئایا ئەو لێمانەوە دورە و ئێمە هاواری لێ بکەین و بڵێین ئەی پەروەردگار، ئەی پەروەردگار وە، یان لێمانەوە نزیکەو بەهێمنی ڕاز و نیازی خۆمانی لەگەڵدا بکەین ؟ پێغەمبەر(ﷺ)بێ دەنگ بوو هەتا پەیڤی خودای گەورە هاتە خوارێ و فەرموێ: ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ﴾ البقرە: ١٨٦.

ئەم هەڵوێسە پێویستی بەڕوولێنەری پێغەمبەر(ﷺ) نیە، خوای گەورە پێ ی نە فەرمووە: پێیان بڵی ئەی محمد من نزیکم، بەڵام دەست بەجێ فەرمویەتی هەواڵیان پێ بدە: ((إني قريب أجيب دعوة الداع إذا دعان ))، پێغەمبەر(ﷺ) فێرمان دەکات و پێمان دەفەرموێ هەر کەس لە خودا داوا نەکات ئەوا لێی دەڕەنجێ ).[1]

هەرکەس داوا کردن لەخودا نەکاتە باو ئەوا خوای گەورە لێی دەڕەنجێ، بنەڕەت لە تۆدا ئەوەیە ئەی موسڵمان کە هەمیشە دەستت بەرز بکەیتەوە و لە پەروەردگارت بپاڕێیتەوە پێغەمبەر(ﷺ) فێرمان دەکات و پێمان دەڵێت: (نزا بریتی یە لە پەرستش).[2]

---

١ـ ترمذي لە ئەبو هريرەوە وەری گرتوە.

٢ـ ترمذي و نسائي و ابو داود و ابن ماجە لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە وەریان گرتوە.

هەروەها لە فەرمودەیەکی شیریندا پێغەمبەر(ﷺ) فێرمان دەکات کە هیوادارام هەمومان بیری لێ بکەینەوە، چونکە ئەو فەرمودەیە گورِ و تینمان دەداتێ و لەناخماندا وزەیەکی گەورە دەخولقێنێ کە ئەگەر بە بەردەوامی و گوێ رایەڵی لەخودا بپارێینەوە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (خوای گەورەخاوەن شەرمە و بەخشندەیە شەرم دەکات گەر بەندەیەك دەستی لەڕوو بەرزبکاتەوە و بەخاڵی و نائومێدی بیان گێرِێتەوە بۆلای).[١]

...سەیری هەڵبژاردنی پێغەمبەر بکە بۆ ناوی (خاوەنی شەرم و بەخشندە)... واتە: شەرمێك کە شایستەی پەروەردگار بێت وە بەخشندەش ئەوەت دەداتێ کە لێی داوادەکەیت... خوای گەورە بەخشندەیە و دەستی لەڕوو بەرز دەکەیتەوە و ئەویش بە نائومێدی نایگێرِێتەوە بۆلات بەهەرگیزی... ئایا دڵتان تامەزرۆی نزا بووە؟

## بۆچی نزا کانمان وەرناگیرێن؟

گرفت و کێشە لەوەدایە کە هەندێ کەس سکاڵای ئەوە دەکەن کە دەپارێنەوە و وەڵامیان نادرێتەوە دەبێت ڕاڤەی ئەمە چی بێت، ئەگەر خوای گەورە پەیمانی داوە وەڵام بداتەوە.

ڕەنگە کەمی دڵنیایی بێت، واتە من بەدڵنیایی یەوە ناپارێمە و وەڵامم نادرێتەوە، ڕەنگە حیکمەتێ لە ڕێگەی بەخشینەکەدا هەبێت واتە ئەو شتەی کەمن داوای دەکەم خوای گەورە پێم نابەخشێ، چونکە سوودی بۆ من نی یە؟

لەڕاستیدا ڕەنگە دواکەوتنەکەی ئەوەبێ کە خوای گەورە ئەم بەندەیەی خۆش دەوێت و شتێکیش هەیە جەخت لەسەر ئەم قسەیە دەکاتەوە: (خوای گەورە دەفەرموێ: ئەی جبریل بەندەکەم لێم دەپارێتەوە ؟ ئەویش دەفەرموێ: بەڵێ ئەی پەروەردگار، خوای گەورە دەفەرموێ: ئەی جبریل، بەندەکەم ئایا سور بوو لەسەر داواکردن ؟ ئەویش فەرموی بەڵێ ئەی پەروەردگار، خوای گەورە دەفەرموێ: ئەی جبریل ئەم گرفتەی بەندەکەم دوا دەخەم، چونکە پێم خۆشە کە گوێم لە دەنگی بێت).[٢]

---

١ ـ ترمذی و ابو داود و ابن ماجە لە نەنەسەوە وەریان گرتوە.

٢ـ لە نەنەسەوە لاوازی تێدایە .

هەندێ جار پەروەدگار دەیەوێ پەرستشت فێر بکات وات لێ دەکات لێی بپاڕێیتەوە و وەڵام دانەوەت دوا دەخات تالێ نزیك بونەوە لە پەروەردگار بزانیت، گوێ بگرە بۆ ئەم فەرمودە یەی پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (بەندەیەك تا ئێستا نی یە کە بە نزایەك پاڕابێتەوە ئەگەرنا خوای گەورە ئەو شتەی پێ بەخشیوە کە داوای لێ کردوە، یان بە وێنەی ئەو شتە لە گوناهی بوراوە ئەگەر بە خراپە، یان بە پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی داوای نەکردبێ).[١]

بەقەبارەی ئەوەی کە داوای دەکەیت لە تاوانەکانت کەم دەکرێتەوە، بێنە بەرچاوی خۆت بۆ ماوەی یەك هەفتە بەردەوام، یان یەك مانگ دەپاڕێیتەوە و وەڵام دوا دەکەوێت گوناهەکانت لێی دەبوردرێ هەموو نزایەك وەڵام تیایدا دوا دەکەوێ.

پوختە: خوای گەورە وەڵامدانەت دوا دەخات، چونکە پێی خۆشە کە گوێی لە دەنگت بێت، هەندێ جار وەڵام دانەوەت دوا دەخات تافێرت بکات لە دژی شەیتانەکەت تێ بکۆشی کاتێ دێت و دوچاری دڵەڕاوکیی ئەوەت دەکات کە پەروەردگار لێت گەڕاوە و وەڵامی نزاکانت ناداتەوە .

پەروەردگارمان وەڵامدانەوەت دوا دەخات تا تاقیت بکاتەوە و فێرت بکات کە شەیتان لە خۆت دور بکەیتەوە و پێی بڵێیت: خوای گەورە هەر وەڵام دەداتەوە، بەڵام هەندێ جار دوا دەکەوێت و ئەمەش لەبەرژەوەندی تۆیە و هەندێ جار دواکەوتنەکە بۆ ئەوەیە کە تێت بگەیەنێ کە تۆ بەردەوامیت لەسەر گوناه کردن لەو گوناهانە تەوبە بکە و خواش وەڵامت دەداتەوە.

## نزا مۆخی پەرستشە

لێم گەڕێن با پرسیارێك بکەم سەبارەت بەو فەرمودەیەی، کە ئەفەرموێ: (نزا پەرستشە)، گەر نزا پەرستەشە ئەی نوێژ چی یە بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) تایبەتمەندی پێداوە و پەرستشی لەسەر ئەم کورت کردۆتەوە.

---

١ ـ ترمذي و ئەبوداود و ابن ماجە لە ئەنەسەوە وەریان گرتووە.

(العبادە) پەرستش لە بنەڕەتدا لە (عبد)ەوە هاتوە واتە لە بەندایەتیەوە، بەمانایەکی دیکە من بەندەی گەورەیەکم و یەکەمین شتێك کە وشەی بەندەمان باس کرد چیە بە دڵی تۆدا دێت؟ ملکەچی، گەردن کەچی، پەنابردن، پێویستی.

کەواتە وشەی پەرستش ماناکەی لە بنەڕەتدا: گەردن کەچی یە، دەکرێ مرۆڤ نوێژ بکات و هەست بەگەردن کەچی نەکات، ئەوە نی یە کە کەم و کورتی یەك لە نوێژەکەیدا هەبێت بەڵکو ئەوەیە کە تەرکیز ناکاتە سەری وە دەکرێ کە زەکات بدەیت، بەڵام هەست بە مانای گەردن کەچی ناکات و دەکرێ کە پەرستشەکان بەزۆری ڕاپەڕێنی و هەست بەمانای گەردن کەچی نەکەیت، تۆ کاتێ کە دەست بەرز دەکەیتەوە و دەڵێیت: ئەی پەروەردگار من پێویستم بە تۆیە... کەس لەم گرفتە ڕزگارم ناکات تەنها تۆ نەبێ... ئەمە ناکرێ ببێت و تۆ هەست بە پەرستش نەکەیت... لەبەر ئەوە لوتکەی پەرستش ئەوەیە کە تۆ لە خودا بپاڕێیتەوە، لەبەرئەوەی کە تۆ زیاتر لە خودا نزیك دەبیتەوە و دەزانیت هەرئەو پەروەردگاری تۆیە و بەهێز و باڵا دەست و تۆش بەندەیەکی لاواز و نەداریت و پێویستیت بە ئەوە.

لەبەر ئەوە دەکرێ بپاڕێیەوە تا لێی تێبگەیت نەك تەنها بۆ ئەوە بێ پاڕانەوەکەت لە لایەن خوای گەورەوە وەڵام بدرێتەوە هەروەها تۆ دەپاڕێیتەوە تا مانای گەردن کەچی فێر بیت مانای پەرستش فێربیت هەتا زیاتر و زیاتر لە خودا نزیك بیتەوە.

## نزا لە ژیانی کەسانێکدا

ئەوانەی کە پێیان گەیشتوم و دواندومن لە هونەرمەند (وجدی ئەلعەرەبی)و پرسیارم لێ کرد:

کاریگەری نزا لە ژیانی تۆدا چی یە؟ وە ئەم پەرستشە لە ژیانی تۆدا لە کوێ یە؟

مرۆڤ کاتێ، کە لەخودا دەپاڕێتەوە پێویستە ئەو لە دۆخی گەردن و مل کەچیدا بێت، ملکەچی بۆ کێ؟ بۆ چ هێزێك... ئەو هێزە بریتی یە لە خودا، پێغەمبەرمان(ﷺ) لەم بابەتەدا هیچی بۆ ئێمە بەجێ نەهێشتوە و هەموی بەجێ هێناوە، بەمانای ئەوەی کە

هەمو ژیانمان نزا و پاڕانەوەیە، هەمو پەرستەشەکانمان نزایە واتە نزا کردن لە کاتی لەخەوهەستان، نزا کردن لە کاتی خەوتندا، پێش خەوتن، لەماڵ چونە دەرەوە، نزا کردن لە گەڕانەوە بۆ ماڵ، نزا کردن لە چونە نێو چۆڵەوانی و دەرچون لێی و نزای چونە لای خێزان و نزای پۆشاکی نوێ، وە من خۆم چەندین ئەزمونم لە پاڕانەوەدا هەیە و زۆر ئاساییە کە کاتێ دوچاری قەیرانێ دەبم، یان گرفتێ پەیوەندی بە دایکمەوە دەکەم و پێی دەڵێم تۆ لەم ڕۆژانەدا کەم تەرخەم بوی لەگەڵ من؟ ئەویش پێم دەڵێت: نا سوێند بەخوا هەرگیز وا نییە، تۆ هەمیشە لەدوعاکانمدا لەگەڵمدای لەبەرەبەیاندا وە هەروەها گەر پێویستیم بە هەندێ پارە هەبێت دەست بەجێ پەنا بۆ سورەی (الواقعه) دەبەم، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) لە بارەیەوە دەفەرموێ: (گەر ئەم سورەتە لە هەر ماڵێك بخوێنرێ ئەوا ئەو ماڵە هەرگیز نەبونی ڕوی تێناکات).[1]

دو ڕۆژ لەگەڵ خێزانەکەمدا دوام کە حەزم لە هەندێ پارەیە، دیتم کە پێی ووتم، بۆچی زۆر لەم گرفتە بدوێین و ئێمە ڤیتامینمان هەیە ؟ وە خێزانەکەم — خوای گەورە بمان بەخشێ ـ دەست پێشخەری تەنانەت لە کڕینی پێڵاوەکانیشیدا ناکات تەنها بە ئیستخارە کردن نەبێ تا خوای گەورە کڕینەکەی بۆ ئاسانبە کات، ئەگەر خوای گەورە ئەمەی نەدەویست، خوای گەورەش لە فەرمودەیەکی قودسیدا دەفەرموێ: (بەردەوام بەندەکانم بە ڕاپەڕاندنی سوننەتەکان لێم نزیك دەبنەوە تا خۆشم دەوێن، ئە گەر خۆشم ویستن ئەوا دەبمە ئەو هەستەی کە پێی دەبیستێ و ئەو چاوەی کە پێی دەبینێ و ئەو دەستەی کە زەبر و زەنگی پێ دەنوێنێ و ئەو پێ یەی کە هەنگاوی پێ هەڵدەگرێ و گەر داوام لێ بکات پێی دەبەخشم و گەر داوای پەنام لێ بکات ئەوا پەنای دەدەم).[2]

سبحان الله... گرنگ ئەوەیە کە من سەرقاڵی سورەی واقعەم وە شەو و ڕۆژ کردوومەتە وێردی سەر زارم و لەو کاتانەی کە پێم خۆش یادی خودای تێدا بکەمەوە دەیخوێنم... دوای نوێژی بەیانی و پێش خۆرئاوابوون سوێند بە خوا ڕزق و ڕۆزیمان لە شوێنێکەوە بۆ دێ کە بۆمان نایەتە هەژمار، من بە خێزانەکەمم ووت ((واقعە سەرقاڵ کەرە) لە بەڵگەکانی سۆزی خوای گەورە ئەوەیە کە وەڵامی داواکانم دەداتەوە من دەمەوێ

---

١ ـ ماناکەی بەیهەقی و ئەبو یعلی لە إبن مسعودەوە وەریان گرتوە.

٢ ـ بوخاری و ئیمام أحمد لە عائیشەی دایکی ئیماندارانەوە وەریان گرتوە.

شتێك بڵێم ئێمە بەچەند لێژی یەکدا تێپەڕ وین وە هەریەکێکمان نزایەکی تایبەت بەخۆی وتوە، یان کەسێك بۆی پاڕاوەتەوە ئەو نزایە تۆی لە دۆخێکەوە گۆڕیوە بۆ دۆخێکی دیکە وە بابەتی نزا پەیوەندی بە دایکانەوە هەیە، پەیوەندی یەکی زۆر نامۆ وە ئەگەر نا پێغەمبەر(ﷺ) نەیدەفەرموو:(بەهەشت لە ژێر پێی دایکاندایە)[1] پەیوەند یەکی خوادایی لە نێوان نزا و دایکدا هەیە.

سوێند بە خوا من ڕۆژی ٤ پاکەت جگەرەم دەکێشا من پەنام بۆ نزا بردو سور بوم لەسەری... هەمیشە دەم ووت: ئەی پەروەردگارم ئەی پەروەردگارم وە یەکەمین نزا کە وتم لەیەکەمین سەرداندا بۆ کەعبەی پیرۆز بوو، من دەزانم کە نزاکەم لێ وەردەگیرێ لەگەڵ یەکەم نیگام بۆ کەعبە، بەهیچ شتێك لەخوا نەپاڕامەوە تەنها بەوە نەبێ کە خوای گەورە دورم بخاتەوە لە جگەرەکێشان، سوپاس بۆ خودا ماوەیەکی زۆری نە خایاند تا لێی دوورکەوتمەوە، من بەتەنها نەدەپاڕامەوە بەڵکو خێزانەکەم و دایکیشم بۆم دەپاڕانەوە.

# چەند چیرۆکێکی ڕاسەقینە:

## مردویەك بوم لە شێوازی ئادەمیزاد دا

من ناوم عبد الله یە، تەمەنم ٢٤ ساڵە و هاوڵاتی یەکی میسریم و لە کۆمپانیایەکی خزمەتگوزاری ڕاگەیاندندا کار دەکەم سەر بوردەی پابەندیم بە ئاسانی کەمن گەیشتمە تەمەنی ١٦ ساڵی دەستم کردە نمایشی جل و بەرگ و مۆدێلەکان لە ڤیدیۆ کلیپ و ئاگاداری یەکاندا، پاشان کەشو هەوایەکی پڕ لە خراپە کاریم ناسی ئەگەر چی دایك و باوکم زۆر بە باشی پەروەردەیان کردبووم . من نکوڵی ڕێز و چاکەی دایکم ناکەم لەسەرم... واتە لە منداڵیمدا لەسەر نوێژکردن پەروەردەبووم، بەڵام بەداخەوە تێکەڵیم لەگەڵ هاوەڵی خراپدا زۆر لەماڵ و پەروەردەکەمی دوور خستمەوە... گرنگ ئەوەیە من دۆخم زۆر گۆڕاو شەیتان هاوکاری باشی کردم... کێشەکە سەرەتا بەدەرچون و پەرش و بڵاوی دەستی پێکرد و، پاشان نان خواردن لە چێشتخانەکاندا و بەوشێوەیە، بەڵام دواتر وتمان پێویستی یەکان بەتەنها خواردن و خواردنەوەنین، ئەمانەوێ کارێکی نوێ تر بکەین،

---

١ـ مام أحمد و إبن ماجه و نسای لە معاویەی سەلەمی یەوە وەریان گرتوە.

ماوەیەك ماینەوە تا بەدوای کارێکی نوێ بگەڕێین هەتا کار گەیشتە مەی و مادە بێ هۆشکەرەکان، چەندین ئاهەنگی سەمای کۆمەڵیمان ڕێکدەخست و شەو لە دەرەوە دەماینەوە.

من هەرکاتێ کە بەتەنها دابنیشتمایە لە خۆمم دەپرسی: ئایا من بەم کارەی، کە دەیکەم بەختەوەرم، یان من ئەمە بۆیە دەڵێم تا خۆم ڕازی بکەم؟

کاتێ کە لەگەڵیان دادەنیشتم و دەم دیێن هەتا دەم ووت: هەموو ئەم خەڵکانە هەڵەن و تەنها من ڕاست دەکەم و لەگەڵیاندا هەموو ئەو کارانەم دەکرد کە ئەوان دەیان کرد .

گەر ئەوان هەمویان لەسەر هەمان کار کۆبونەوە ئەوا ئەمە ڕێگەی ڕاستە وە تێکەڵیم لەگەڵ ئەواندا وەك بێ هۆشیەك وابوو کە من وەك مردویەك نەم دەتوانی سەیری دەورو پشتی خۆم بکەم زیندەیەکی مردو لەهەموو شتێکدا وە من بوێری یەکی خراپم هەبوو تا هەمو کارێکی هەڵە بکەم بە جۆرێ هەڵە لای من ڕاست و ڕاستیش ئەوە بوو کەچۆن بتوانم دور کەومەوە لە نوێژ و قورئان خوێندن.

لە یەکێك لە ڕۆژگارەکاندا لەگەڵ هاوڕێکانم دانیشتبوین سەیری فلیمێکی خەیاڵیمان دەکرد کە کاتێ مرۆڤێك دەمرێ، وە شەیتان چۆن گاڵتەیان پێ دەکات و دەیان خاتە دۆزەخەوە، هەستم کرد من یەکێکم لەوان و شەیتان سوکایەتیم پێ دەکات و پێم پێ دەکەنێ، لەم کاتەدا جۆرە ترسێکی نامۆ ڕوی تێکردم... ترسێکی هستیری بەجۆرێ هاوارم کرد بەسەر هاوڕێکانمدا و وتم من ناتوانم لەم ماڵە بمێنمەوە وا هەست دەکەم ئەم ماڵە شەیتانی تێدایە وە پێم وتن کە من دەمەوێ بڕۆم گەڕامەوە بۆ ماڵەوە لار دەبومەوەو جەستەم هەموی دەلەرزی، نازانم چی بکەم، گوێم لە بانگی بەیانی بوو وتم دەست نوێژێك دەگرم و سورەی( یاسین) دەخوێنم، بەڕاستی توانای خوێندنەوەی هیچم نەبوو، چونکە شەیتان لە ناخمدا بوو وە هەرکاتێ کە قورئانم دەخوێند جەستەم دەلەرزی و زیاتر دەترسام بۆیە وتم نوێژ دەکەم، لەگەڵ ئەوەی، کە ماوەی نێوان من و مزگەوتەکە١٠مەتر بوو، بەڵام هەستم دەکرد وەك ئەوەی من لە قاهیرەوە بۆ ئەسوان ڕێم کردبێ، زۆر بە ترسەوە ڕێم دەکرد هەتا شەیتان دەستی کردە دڵەڕاوکێم بەجۆرێ کە من شێت بووم نوێژم لەسەر نی یە من بۆ ماوەی سێ مانگ (٩٠ڕۆژ) دژایەتی و بەرهەڵستکاری شەیتانم کرد وە سوپاس بۆ

خودا،کە بەخشیمی و سەری خستم بەسەریدا، چونکە زۆر بەتوندی بەدوامەوە بوو لە کاتی دەست نوێژ دوام دەکەوت، لەکاتی نوێژ دوام دەکەوت، لەکاتی قورئان خوێندن دوام دەکەوت، بەجۆرێ کە بە دایکمم ووت من شێت بووم ئەویش لێی پرسیم چیتە؟ هەمو شتێکم بۆ باس کرد و پرسی ئەمە کەی؟ وتم لە ڕۆژێکی ئاوا ووتی سبحان الله، ئەو هەر هاواری دەکردو دەیوت الله اکبر ئەوە هەر ئەو ڕۆژەیە کە من بە دڵێکی خاوێنەوە تیایدا دوعام بۆ دەکردی کە خوای گەورە بە پوختی ڕێنمونیت بکات.

لە ڕاستیدا من وا هەستم دەکرد کە ڕێنمونیم لەسەرە وەك شتێك کراوە بەبەرمدا و نزاکەش بەرز بۆتەوە بۆ ئاسمان و خوای گەورە قبوڵی فەرمووە، من خێرا دابەزیم و لەلای چەپەوە دەست بەجێ گۆڕام بۆ لای ڕاست و پێم ووت: ئەی ئێستا چی بکەم ؟ ئەویش ووتی (بەویستی خوا پەروەردگارمان نزاکەی لێوەرگرتوم و ڕێنمونیت دەکات بۆسەر ڕێگای ڕاست... بۆ مزگەوت تۆ پێویستیت بەوەیە کە دژایەتی دەرونی خۆت و بەرهەڵستی شەیتان بکەیت، لەو ڕێگەیەی خودا هەوڵ دەدەیت بەردەوام دەبیت تیایدا هەتا خوای گەورە بەهەشتت پێ دەبەخشێ لە ڕاستیدا من چاوەڕوانی ئەوە نەبوم کە بەرگەی ئەم دۆخە بگرم، جگە بەجەنگ ناتوانم ئەم دۆخە بە هیچ پەیڤێکی دیکە پێناسە بکەم، جەنگێك لە ناخمدا و جەنگێك لە جەستەمدا بە درێژایی شەو و ڕۆژ... هەتا کار گەیشتە ئەوەی کە من چوم بۆ یەکێك لە مزگەوتەکان و بە مامۆستام ووت چیم لێ بەسەر هاتووە لەو ترس و تۆقینە توندە و شەیتان چۆن دەیەوێ فریوم بدات بەوەی کە من شێتم، ئەویش پێی وتم ئەوە ڕەفتاری شەیتانە ئەو کاتێ کەدەزانێ کە یەکێك لێی دور دەکەوێتەوە چەکەکانی بەکاردێنێ کە ئادەمیزاد بەرهەڵستی بکات ئەوا ئەو لاواز دەبێت و چەکەکانی لەدەست دەکەوێتە خوارێ، تەڵەکەی شەیتانیش لاوازە و ئەو وردە وردە لێت دەگەڕێ هەتا یاری یەکانی لە ناختدا دەمرێت، وە تۆش پێوستیت بەوەیە کە بەچەکەکانت کە نوێژو و قورئان خوێندو پابەندیتە بەرەنگاری ببیتەوە.

بەم شێوەیە مامەوە، تا ڕۆژی ٢٨ ی ڕەمەزان و یەکێك لە هاوەڵام بانگی کردم بۆ یەکێك لە مزگەوتەکان بۆ شەونوێژ، کەسێکم دی کە خواردی پارشێوی بۆ ئامادە دەکردم، پێی ووتم هەردەبێ لەگەڵ ئێمە پارشێو بکەیت، وتم ئەم خەڵکانە زۆر باشن و من سەر

سامم پێ یان، چونکە من هەمیشە هەستم دەکرد کە هەر مرۆڤێك کـە خزمـەتێك پـێش کەش بکات ئەوا چاوەڕوانی شتێکم لێ دەکات لەبەرامبەرەکەیدا، دیارە ئەمەش بە فەزڵی هاوڕێی خراپەوەیە، بەڵام من ئەو کەسانەم دی کە بەدوی پاداشتدا دەگـەڕان و شـتێکیان پاشکەوت دەکرد بۆ دوارۆژیان، وە کاتێ کە لەلایان مامەوە، شەیتان بە تەواوی لـێم دور کەوتەوە، تەنانەت کاتێکیش کە دەهات بۆلام پێی دەوتم: ئەمانە چیان لە تۆدەوێ ؟ بۆچی ئاوا بەباشی مامەڵەت لەگەڵ دەکەن؟ هەر تەنها بەهەڵس و کەوتم لەگەڵیاندا و بە بینینی بزەی سەر لێویان هەستم دەکرد کە دڵەڕاوکێی شەیتانم لێ دەڕوات، گرنگ ئەوەیە کە مـن پاش ئەوەی کە لە مزگەوت بۆ ماوەی دو ڕۆژ خەڵوەتم کێشا گەڕامەوە ماڵەوە و سـەر لـە نوێ شەیتان دەستی کردەوە بە دڵە ڕاوکێ پێ کردنم، دەستم کرد بە پەیوەندی و تەلـەفۆن کردن بۆچەند کیـژێك کـە پێـشتر خوازیـار بـووم کـە یـەکێکیان لێمـی بڕوانیایـە، یـان ئیشارەتێکی بۆ بکردمایە، من ئەمەم لە تەلەفۆنەکەدا دیتەوە کە پێی ووتم وەرە بـابڕۆین بۆ شەرم الشیخ، بەداخەوە لەگەڵ هەندێ لەو هاوەڵانەدا چووم و شەیتان تێر پێ کەنی پـێم و ووتی: تاقی بکەرەوە، بەڵام من بڕیارم دابوو کە هـەرگیز مـەی نەنۆشـم و مـادەی بـێ هۆشکەریش نەکێشم... بەڵام تەنها لەگەڵیان شەو بمێنمەوە من بـە نائـارامی مامـەوە و نەمتوانی مامەڵەیان لەگەڵ بکەم وەك ئەوەی کە بڵێی مـن بـەوان نـامۆ بم، پـاش ئـەوە گەڕامەوە بڕیاری یەکجاری خـۆمم دا. پـەروەرگار بـە ویـستی خـۆی دامـەرزاوم بکـات لەسەری... کە بە هیچ جۆرێ لە هاوەڵـەکانی مزگـەوتم نەگـەڕێم، بەڕاسـتی مـن نـاتوانم بەراورد لەنێوان ژیانی ڕابردوو ژیانی ئێستامدا بکەم، چونکە ئێستا ژیانی من مانایـەکی ڕاسەقینەی هەیە . ژیان مانا و مەبەستی خۆی هیە... تۆ دەژیت تا بەبەهەشت بگـەیت، خێزان پێکەوە دەنێی هەتا نـەوەی چـاك بخەیتـەوە و بـە هۆیانـەوە بـچیە بەهەشـتەوە . کاردەکەم بۆ ئەوەی سامانێکی حەڵاڵم دەست بکەوێت، هەستم کـرد کـە هـەمو کـارێکی چاك لە دویناداا بە پاداشتێکی چاك لە دوارۆژدا دێتە وەڵام بۆیـە ووتم سـوێن بـەخوا: بـە هەشت دەکڕم و تەواو، چونکە من لە دونیا زۆر بەختەوەرانە دەژیم إن شـا و الله، سـوپاس بۆ خودا خوای گەورە ڕێزداری کردوم و لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە کـە دامـەزراوم بکـات لەسەر ڕێگەی ڕاست...

عبدالله وتی من مردویەك بووم لە شێوەی ئادەمیزاددا، ئەو ئـەوەی ووت سـبحان الله ڕەنگە ئەو ئایەتەشی نەزانی بێ کـەخوای گـەورە تیایـدا دەفـەرموێ: ﴿أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَـٰهُ وَجَعَلْنَا لَهُۥ نُورًا يَمْشِي بِهِۦ فِي ٱلنَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُۥ فِي ٱلظُّلُمَـٰتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا ۚ كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلْكَـٰفِرِينَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾الانعام: ١٢٢

واتە عبدالله هەستێکی درکاندوە بێ ئەوەی کـە ئـەم ئایەتـەی زانیبـێ وە هەرکەسـێ خودا نەناسێ بەڕاستی مردوە و زیندوو نی یە...

خاڵێکی دیکە ئەوەیە کە: عبد الله دەڵێت دایکی لەو ساتەدا نزای بـۆ کـردوە وە ئـەم ساتە لەو ڕۆژەدا بووە کە عبد الله ی تێدا گۆڕاوە وە مامۆستا وجدیش دەڵێت: ئـەو داوای لە دایکی کردوە کە هەمیشە بۆی بپاڕێتەوە، ئەم سـور بـوون لەسـەر پاڕانـەوەی دایکـە دەکرێ هەمیشە تەرکیزی بخەینەسەر... تەنها هەر دایك نا بەڵکو دەبێت سور بیت لەسەر ئەوەی کە خەڵکی بۆت بپاڕێتەوە، لەبەرئەوەی کە هەندێ جار دوعای خەڵکی بۆ تۆ بەهێز ترە لە دوعای خۆت بۆ خۆت.

فەرمودەیەکی پێغەمبەر(ﷺ) هەیە کە دەفەرموێ: ( نزای مرۆڤی موسڵمان بۆ براکەی لەپاش ملە وەرگێراوە، لەسەر سەریدا فریشتەیەکە کە وەکیلی ئەوە وەستاوە هەرکاتێ کـە دوعای چاك بۆ براکەی دەکات ئەوفریشتەیە دەڵێت: ئامین وە بۆ تۆش هەروایە).[1]

ئەو پرسیارەی کەلێرەدا دێتە پێشێ ئەوەیە کە دایکی عبـد الله، بـۆی پاڕاوەتـەوە لـە کاتێکدا کە ئەو ملکەچی خودا بووە، ئەو دەسـتی کردۆتـە بـاش بـوون و بـەرە و خـودا ڕۆیشتن و خوای گەورەش دوعاکەی قەبوڵ فەرموە و لێ ی وەرگرتووە، بـەڵام چـۆن دەبـوو گەر ئەو دوعایە لە کاتێکدا بوایە کە عبد الله لەم ڕاستە شـەقامە بەدوربوایـە ئایـا ئـەو دوعایە وەردەگیرا؟

---

١ـ الجامع الصغير للسيوطي لە ئەبو دەردائەوە وەری گرتوە .

بەڕاسی سوفیانی پوری پەیڤێکی زۆر جوانی هەیە کـە ئـەو یـەکێك لـە تـابعین بـووە دەڵێت، ئەمە واتایەکی زۆر جوانە و بەڵگەشی لەسـەر خـوای گـەورە وەڵامـی خـراپترین خولقێنەری خۆی دەداتـەوە کـە ئیبلیـسە و کاتـێ دەفـەرموێ: ﴿قَالَ أَنظِرْنِيٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ۝ قَالَ إِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ﴾ الأعراف ١٤-١٥.

## مەرجەکانی وەڵامدانەوەی نزا

وەرن با بە پەیڤێکی کرداری یانەوە بدوێین، گەر ویستت نزاکانت وەڵام بدرێنـەوە ئـەوا چوار مەرج هەیە کەوا دەبێ بەجێیان بهێنی ئەوانیش ئەم مەرجانەن:

١- دڵنیایی، یان بێ گومانی: واتە دڵنیا بیت کە پەروەردگارمان نزا گیرادەکات.

٢- ملکەچی: هەر بەهۆی ملکەچی یەوە ئەمەوێ لە ڕێگـەی یـەکێك لـە تابعینـەوە پەیڤێکی جوانتان پێ بڵێم کە دەفەرموێ: مـن دەزانم کـەی وەڵامـی نزاکـانم دەدرێتـەوە: خەڵکی ئەمەیان پێ سەیر بوو وە پێیان ووت چـۆن ؟ ئـەویش فـەرموی کاتـێ، کـە دڵـم ملکەچ و چاو بەفرمێسك و ئەندامەکان و دەمارەکانی جەستەم ئارام بن، ئـەم واتایـە لـە فەرمودەیەکی پێغەمبەر(ﷺ)دا یە کە دەفەرموێ: ئەوەش(بزانن کە خوای گەورە وەڵامـی دڵێکی بێ ئاگا ناداتەوە).[1]

واتە: تۆ دەڵێی ئەی پەروەردگارم من ئۆتۆمبیلێکم دەوێ... ئەی پەروەردگارم بم خەرە نێو بەهەشت و تۆ بێ ئاگایت و دەتەوێ خوای گەورە وەڵامت بداتەوە!! هەرگیز ئەوە نابێ و، نـاکرێ دەکـرێ دڵـت گـەردن کـەچ و مـل کەچـی لای پـەروەردگار بێـت... ئـەی پەروەردگارا... ئەی پەروەردگارا... ئەی پەروەردگارا.

بە جۆرێ ئیمام أحمدی کوڕی حەنبەل دەفەرموێ: بۆ موسڵمان هیچ نمونەیەکم پێ نی یە کاتێ کە نزا دەکات و خودا وەڵامی نزاکەی دەداتەوە ئەوە نەبێ کە ئەو وەك کەسـێ وایـە لەسەرداریێك بێت لەنێو دەریایەك و شەپۆلەکانی توندو تیژبن و بێ گومان بێ لەمردنی.

---

١ـ ترمذی و اما أحمد لە ( مسند)ەکەی لە ئەبو هریرەوە.

گوڕ و تین و گەرمی نزا چۆن دەبێت ؟ ئـەو دەپاڕێتـەوە و پـەنا بـۆ خـودا دەبـات... دڵنیابە کە هانای پێ دەدرێت.

لەبەر ئەوە کاتێ کە ملکەچی لای پەروەردگارت دەبیت و ملکەچی و گـەردەن کەچـی بۆ دەردەبڕی لەناوەوە دەهەژێی و پێـی دەڵێیـت، ئـەی پـەروەردگارا فریـام کـەوە، ئـەی پەروەردگارا فریاد ڕەسم بە ئەو کاتە خوای گەورە بە ویستی خۆی وەڵامت دەداتەوە.

هـەر لەبەرئەوەیـە کـە پـەروەردگار سـەبارەت بـەخۆی دەفـەرموێ: ﴿أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَآءَ ٱلْأَرْضِ ۗ أَءِلَـٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ﴾ النمل: ٦٢.

بۆچی داماو؟ چونکە داماو و ناچار ملکەچی لای خودایە.

٣- پەلە نـەکردن: ئاگـات لـەم خاڵـەبێت... پێغەمبـەر(ﷺ) دەفـەرموێ: (وەڵامـی کەسێکتان دەدرێتەوە گەر پەلە نەکات، دەڵێت پاڕامەوە و وەڵام نەدرامەوە).[1] واتە: مرۆڤ دەڵێت: پاڕامەو و پاڕامەوەو خوای گەورە وەڵامـی نەدامـەوە و، پاشـان واز لـە پاڕانـەوە دێنێ، ئێمە ئەوەمان ڕون کردەوە کە بۆچی پەروەردگارمان پاڕانەوە دوا دەخات.

٤- دەبێت ماڵەکەت حەڵاڵ بێت: چونکە پێغەمبەر(ﷺ) دەفـەرموێ: (خـوای گـەورە پاکەو جگە لە پاکیش هیچی دیکە پەسەند ناکات).

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) وەسفی پیاوێکی قژبچری جەپۆل دەکات واتە هەژارو نەبوو بە پەروەردگارمان کە دەست بەرزدەکاتەوە و بە ملکەچی یەوە دەڵێت: ئەی پەروەردگارا ئەی پەروەردگار ئەم ملکەچی یە دەبینی ملکەچی یەکەی تەواوە، بەڵام خواردن و خواردنەوە و پۆشاك ماڵ پەیدا کردنی بەڕێگەیەکی حەرامە چۆن وەڵامی دەدرێتەوە؟

پرسیارێکی دیکە دێت بە هزرتدا (لە ڕاستیدا ناتوانم لە خودا بپاڕێمەوە بـە پـەیڤێکی ڕازاوە و ڕێك و پێکەوە، ئایا دەکرێ بەو شێوەیە بپاڕێمەوە کە دێت بەسەر زارمدا؟

---

١- بوخاری لە ئەبو هریرەوە.

الله... ئایا باوەڕ بەم پرسیارە دەکەیت، یەکێك پرسیاری ئەمەی لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد... بێنە پێش چاوی خۆت... پیاوێك هاتە لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و پێی فەرمو ئەی پێغەمبەری خوا من ناتوانم وەك تۆ و مەعاژ چوتە چوت بکەم واتە بەجوانی و بەرازاوەیی بپاڕێمەوە پێغەمبەر پێی فەرموو: (لە نوێژدا چی دەڵێیت ووتی دەڵێم: خوایە من داوای بەهەشتت لێ دەکەم... خوایە ڕزگارم بکەی لە ئاگری دۆزەخ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی:(ئێمەش بە دەوری ئەوەدا ورتە ورت دەکەین).[1]

## ئەی خەڵکینە بەوە بپاڕێنەوە،کە لەدڵتاندایە.

### ئامۆژگاری

ئامۆژگاری یەك کە باسەکەی پێ کۆتایی دێنم ئەوەیە کە بەو شێوەیە بپاڕێنەوە کە هەستی پێ دەکەن... پەیڤ مەرازێننەوە لە دڵتەوە بڵێ ئەی پەروەردگارا... من پێویستیم بە تۆیە ئەی پەروەردگارا... من هەژارم ئەی پەوەردگارا... من کاتێ کە گوناهێك دەکەم لێی پەشیمان دەبمەوە و دەگەڕێمەوە بۆ لای هاوکاریم بکە ئەی پەروەردگارا هاوکاری... ئەی پەروەردگار بمخەیتە بەهەشتەکەت... ئەی پەروەردگارا لێم خۆش بی... ئەی پەروەردگارا لێم ڕازی بی... ئەی پەروەردگارا جگە لە تۆ کەسی دیکەم نی یە... من سست و لاوازم.

خوای گەورە لە فەرمودەیەکی قودسیدا دەفەرموێ: (ئەی بەندەکانم هەموتان سەرگردان بوون ئەوەتان نەبێ کە ڕێنمونیم کردوە داوای ڕێنمونیم لێ بکەن باهیدایەتتان بدەم... ئەی بەندەکانم هەموتان برسی بوون ئەوەتان نەبێ کە تێرم کردوە، داوای خواردنم لێ بکەن با تێرتان بکەم... ئەی بەندەکانم هەموتان ڕووت بوون ئەوەتان نەبێ کە پۆشتەم کردوە داوای پۆشتەیم لێ بکەن تا پۆشتەتان بکەم ئەی بەندەکانم ئێوە شەو و ڕۆژ هەڵە دەکەن و منیش لەهەموو تاوانێك دەبورم داوای لێ بوردنم لێ بکەن با لێتان ببورم).[2]

---

١ـ مسلم و إمام أحمد لە ئەبو هریرەوە.

٢ـ ترمذی و مسلم لە ئەبوذەری غفاری یەوە.

سەیر بکە، کە پەروەردگار چەند جار داوامان لیٚ دەکات، کە لێی بپاڕێینەوە.

واتە هەرکاتیٚ شتێکت ویست... هەرشتێك ئەوا پەنا بۆلای خودا ببە.

لە کۆتایدا: پێم خۆشە بەم نزایە کۆتایی بە باسەکەم بهێنم بەڵکو پـەروەرگار وەڵامـان بداتەوە و ئەگەر مەرجەکانی نزامان دەستەبەر کرد دڵنیا دەبین لەوەی کە پـەروەردگارمان وەڵامان دەداەوە.

بەواتایەکی دیکە ئێمە پەلە ناکەین... کاتیٚ ملکەچ و گەردن کەچ دەبین هەوڵ دەدەین کە ماڵمان حەڵاڵ بێت و دەپاڕێینەوە و دەڵێین ئەی پەروەردگارا سوپاس بۆ تۆ و بـۆ سـەر بەرزی و گەورەیی دەستەڵاتت سوپاس بۆ خودا سوپاس بۆ خودا... سوپاس بۆ خودایە کـە خولقێنەری زەوی و ئاسمانەکانە... سوپاس بۆ خودایە کە خولقێنەری شەو و ڕۆژە سـوپاس بۆ خودایە کەبەم شێوەیە ڕێنمونی کردوین و ئێمە ڕێنمونە کراو نەدەبوین گەر ئەو نەبوایە سوپاس بۆ خودا بە ئیسلام و سوپاس بۆ خوا بە ئیمان و سوپاس بۆ خودا بە قورئان...

الله صل على سيدنا محمد في الأولين وصل عليه في الآخرين وصل عليه في الملأ الاعلى الى يوم الدين... خوایە لە گوناهەکانمان ببوری لە گوناهەکانمان ببـوری لـە گوناهـەکانمان ببوری عەیبەکانمان بپۆشی بەزەیت بە لاوەزەکانماندا بێەوە وە کتێبەکانمان بە دەستی ڕاست وەربگرین و لێپرسینەوەمان ئاسان بکەت... ئێمە داوای بەهەشتت لیٚ دەکـەین و پـەنات بە ئاگر لیٚ دەگرین... خوایە لە ڕیزی بەهەشتیان بمان نوسـی... خوایـە بـەزەیت پێمانـدا بێتەوە تۆ بە ئێمە میهرەبانی ئەی ئەو زاتەی کە دەفرموی لێم بپاڕێنەوە وەڵامی نزاکانتان دەدەمـەوە لێمـان خـۆش بیـت، ئـەی خۆشەویـست ئـەی بـە بـەزیی ئـەی نزیـك ئـەی وەڵامدەوەرەی نزا ئەی گەورە و ئەی بەخشندە... خوایە ئێمە داوات لیٚ دەکەین کە لێمان ببوری... ئەی پەروەردگاری خـاوەن بـەزەیی و مـەزنی و بەخـشندەیی هیدایـەتی لاوان و ژنانی موسڵمان بدەیت و لەهەمومان ڕازی بیت، آمين آمين وصل اللهم على سـيدنا محمـد والسلام عليكم ورحمه الله وبركاته

# هاوڕێیەتی

## هاوڕێکانت کێن؟

ئەم بابەتەمان بابەتێکە زۆرێك لە دایکان و باوکان نیگەران دەکات ئەوەی کە دەکرێت لاوێك سەرگەردان بکات و ولاوێکی دیکە ڕێنمونی بکات هاوەڵی کردنە.

هاوەڵـەکانی تـۆ کەسـانی خـراپن، یـان چـاکن ؟ کەسـانێکن کـە لەسـەر ملکەچـی پەروەردگارت داتدەمەزرێنن، یان لەسەر دورکەوتنەوە لە ملکەچی ؟ کەسانێکن کـە بـەو شێوەیە پەروەردە کراون کە تۆ لە ماڵەکەتدا پێی پەروەردە کراوی، یان نا؟

زۆرێك لە منداڵان هەن کە بە شێوەیەکی نایـاب پـەروەردە کـراون و کـەس و کاریـان خەڵکانێکی بەڕێزن، بەڵام نازانین چۆن ئەو لاوە کە لە مـاڵێکی باشـدایە ئـەوەی دەیـەوێ بیکات دەیکات ! بە جۆرێ کە کەس و کارەکەی خۆیان سەرسام دەبن کاتێ دەزانن کە ئەو بەو جۆرە کارانە هەڵدەستێ، یان بەشتێکی کت و پڕی دێتە پێش چاویان کە کوڕەکەیان لە بنکەیەکی پۆلیس وەر دەگرنەوە و ئەوان سەریان سوڕماوە, لەبەر ئەوەی کـە نـازانن کـێ هاوەڵی کوڕەکەیانە... لەم خاڵە دا هیچ تەرکیزێکیان نـەبووە، زۆرتـرین شـت کـە مـرۆڤ سەرگەردان دەکات هاوەڵیەتی وە زۆرترین شتیش کە مرۆڤ ڕێنمونی دەکات هەر هاوڕێ یە لە ڕاستیدا وتەی ئێمە و ئەم ڕۆژگارەش نی یە بـەڵکو پـەیڤی قورئـان و سـونەتە کـەهی ساڵانێکی دور و درێژی لەمەوبـەرە، بـەڵکو دەگەڕێتـەوە بـۆ سـەردەمی موسـی( علیـە السلام) کـە دەفـەرموێ: ﴿قَالَ رَبِّ ٱشْرَحْ لِي صَدْرِي ﴿٢٥﴾ وَيَسِّرْ لِيٓ أَمْرِي ﴿٢٦﴾ وَٱحْلُلْ عُقْدَةً مِّن لِّسَانِي ﴿٢٧﴾ يَفْقَهُوا۟ قَوْلِي ﴿٢٨﴾ وَٱجْعَل لِّي وَزِيرًا مِّنْ أَهْلِي ﴿٢٩﴾ هَٰرُونَ أَخِي ﴿٣٠﴾ ٱشْدُدْ بِهِۦٓ أَزْرِي ﴿٣١﴾ وَأَشْرِكْهُ فِيٓ أَمْرِي ﴿٣٢﴾ كَيْ نُسَبِّحَكَ كَثِيرًا ﴿٣٣﴾ وَنَذْكُرَكَ كَثِيرًا ﴿٣٤﴾ إِنَّكَ كُنتَ بِنَا بَصِيرًا﴾طه: ٢٥-٣٥.

موسی پێغەمبەر لە خاوەن نیازەکان (اولی العزم) بووە لە نێو پێغەمبەراندا وەك ئەوەی کە دەبینێ بەتەنها ناتوانێ یاد و بەندایەتی خودا بکات و پێویستی بە کەسێکە

كه دايبمەزرێنیێ، هەر بۆیە پەروەردگار پێغەمبەر دەدوێنیێ و پێی دەفەرموێ: ﴿وَٱصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ ۖ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُۥ عَن ذِكْرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمْرُهُۥ فُرُطًا﴾ الكهف: ٢٨.

قورئانی پیرۆز لە سورەی (الفرقان) نمونەیەكمان دەخاتە پێش چاو و بۆ مرۆڤێك كە رۆژی دوایی دێت و قەپ بە دەستی خۆیدا دەكات، ئەم حەسرەتە بێنە پێش چاوی خۆت:﴿وَيَوْمَ يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيْهِ يَقُولُ يَٰلَيْتَنِى ٱتَّخَذْتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلًا ﴿٢٧﴾ يَٰوَيْلَتَىٰ لَيْتَنِى لَمْ أَتَّخِذْ فُلَانًا خَلِيلًا ﴿٢٨﴾ لَّقَدْ أَضَلَّنِى عَنِ ٱلذِّكْرِ بَعْدَ إِذْ جَآءَنِى ۗ وَكَانَ ٱلشَّيْطَٰنُ لِلْإِنسَٰنِ خَذُولًا ﴾ الفرقان: ٢٧-٢٩.

ئەو تەنها قەپاڵ لە دەستێكی ناگرێت بەڵكو لە هەردو دەستی... ئەم حەسرەت و نارەحەتی یە بێنە پێش چاوی خۆت، زۆرێك لە لاوان هەن كە بە رێگەی هیدایەتدا دەڕۆشتن و هاوڕێ یەك هات و لە رێگەی ژیانیان وەستا و چەند هەنگاوێكی زۆر زۆر بۆ دواوەی گەڕاندنەوە، لەبەر ئەوەیە كە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (مرۆڤ لەسەر ئاینی هاوڕێ و دۆستەكەیەتی، هەركەس با سەیر بكات كە كێ دەكاتە دۆستی ).[١]

ئەو كەسە هاوڕێ نی یە كە بارودۆخ دەخاتە سەر رێگاكەت، بەڵكو هاوڕێ ئەو كەسەیە كە تۆ دەست نیشانت كردووە وە گونجاوی تێدا بەدی دەكەیت بۆ پەروەردەت و ژینگە و ڕەوشت و ئاین و سروشتت...

لەبەر ئەوە پێغەمبەر(ﷺ)ئەفەرموێ: (مرۆڤ لەگەڵ ئەو كەسەدا یە كە خۆشی دەوێت).[٢]

١ ـ ترمذی و امام أحمد و ابو داود لە أبو هریرەوە روایەتیان كردوە.

٢ـ بوخاری و مسلم .

کێت خۆش بوێ ڕۆژی دوایی لەگەڵ ئەوەدا دێیت، کەسێك بۆ خۆت دەست نیشان بکە کە خۆشت بوێت دەتەوێ لەگەڵ کێدا بیت ؟ من پێغەمبەر(ﷺ) و یارانیم خۆش دەوێن، کەسانی پاك و بێ گەرد و بەڕەوشت و ڕێزدار و ئاینیم خۆش دەوێن.

**دوو نمونە لە هاوەڵی چاك و هاوەڵی خراپ**

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (وێنەی هاوڕێ ی چاك و هاوەڵی خراپ وەك هەڵگری میسك و فوتێکەری کورە وایە).[١]

سەرنجی ئەو جیاوازی یە گەورەیە بدە هەروەك ئەوەی،کە پێغەمبەر(ﷺ) تیایدا پێناسەی هاوڕێی چاك و هاوەڵی خراپی کردوە.

سەیر لەوەدایە کە مێژوی ئیسلامی چیرۆکی کەسانێك دەگێڕێتەوە کە وا بەستە بوو بە کەسانێکەوە کە دوچاری سەرگەردانیان کردوون , ئەمەش بەسەرهاتێکی شیاوە بۆ بابەتەکەمان... کە بریتی یە لە ئەبو جەهل و، وە ئەبو جەهلیش یەکێك لە سەرانی بێ باوەڕ بووە ئەو زۆر بێ باوەڕ بووە و هیچ هیوایەتی چاك بونی لا نەکراوە، ئەو هاوڕێیەکی هەبووە بەناوی عوقبەی کوری ئەبو معیط و زۆری خۆش ویستووە و لەگەڵ ئەبو جەهلدا پەیوەندی یەکی دۆستانەیان هەبووە ئەو هاوەڵی بوە و زۆری خۆش ویستوە، بەلام عەقبە لە ناخەوە زۆر لە ئەبو جەهل باشتر بووە، ئەو ئومێدێکی لێ دەکرا، خەریك بو باوەڕی دەهێنا، بەلام کەمێك دو دڵ بوو گوێی لە فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) دەگرت و پێ ی کاریگەر بوو و دەهەژا، لەم ماوەیەدا ئەبو جەهل بە گەشتێك چوبویە دەری مەککە، ئەو کاریگەری یەی،کە ڕێگری دەکرد لە موسڵمان بوونی ڕۆیشت، عەقبە چویە لای پێغەمبەر(ﷺ)و ئەویش داوای لێ کرد کە باوەڕ بهێنێ، عەقبە ووتی بەڵێ، بەلام چاوەڕێم بکە هەتا سبەینێ بەیانی، بەلام بە داخەوە ئەو کاتە هەر هەمان کات بوو کە ئەبو جەهل لە گەشتەکەی گەڕایەوە، عەقبە پێی ووت سبەینێ دەمەوێ بچم بۆلای محمد تا موسڵمان بم، ئەبو جەهل پێی وت: سوێندت دەدەم بەو هاوەڵی یەی کە لە نێوان من و تۆدا یە

---

١ـ بوخاری و مسلم.

بگەڕێوە بۆلای محمد و یەك تف بکەرە نێو چەوانی، عەقبە کاتێ کە دەیویست بڵێ أشهد أن لا اله الا الله و دەستی حەزرەت ماچ بکات، بەڵام هاوەڵەکەی هانی دەدات بە پێچەوانەوە کارەکەی ئەنجام بدات هەڵبژاردنیش ئەوەیە کە ئەبو جەهل پێی دەڵێت: ئاینەکەت، یان هاوڕێ کەت ؟ کەس و کارت، یان هاوڕێکانت ؟ بەڵام بەداخەوە هەڵبژاردنەکە وێنەی ئەو زۆرینە خەڵکانە دەبێت کە دونیایان هەڵبژاردوە و کەوتون و تیاچوون . عوقبەی کوڕی ئەبو معیط ئەبو جەهلی هەڵبژارد بەسەر پێغەمبەر(ﷺ)دا، عەقبە گۆڕا بۆ کەسێك کە زۆرترین ئەشکەنجەی پێغەمبەری(ﷺ) دەدا، وە هیچ کەسێك وەك عەقبە بوێر نەبوو لە بەرامبەر حەزرەتدا، عەقبە ئەو کەسبوو کە دڵی بەرامبەر ئیسلام ڕەق دەبوو، ئەو خەریك بوو کە بێتە نێو ئایەنەوە، بەڵام کاتێ کە حەزرەت لە کەعبەدادەبینێ کە نوێژ دەکات، عاباکەی دا دەکەنێ و لە دەوری گەردنی پێغەمبەر(ﷺ)ی دەپێچێ و هەوڵ دەدات کە بیخنکێنێ، عاباکەی توند دەکات هەتا حەزرەت هێزی تێدا نامێنێ هەتا لەسەر ئەژنۆ دەکەوێت، ڕۆژێك پێغەمبەر(ﷺ) نوێژدەکات و لە سوژدەدا دەبێت لە کەعبەدا عەقبە پاشەڕۆی حوشتری مردوو دێنێ و دەیکاتە سەر پشتی پێغەمبەر(ﷺ)و پێغەمبەر(ﷺ) نەیتوانی هەستێتەوە هەتا زەینەبی کچی هات و پیسی و پاشەڕۆکەی لەسەر پشتی لابرد. ئەمە عوقبەی کوڕی ئەبو معیط کە لە جەنگی بەدر کوژرا پاش مردنی ڕاستەو خۆ جەستەی هەڵتۆقا و کەس و کارەکەی نەیان توانی لەبەر بۆگەنی جەستەی بیخەنە گۆڕەوە بۆیە هەر لە شوێنی مردنیدا خۆڵیان دا بەسەریدا و ئەو بە شێوەیەکی ناشیرین مرد.

وەرن با نمونەیەکی پێچەوانەی ئەمە بەدی بکەین... عەیاشی کوڕی ئەبو ربیعە... عەیاش موسڵمان بوو... ئیسلام هێشتا هەر لاواز بوو کاتێ کۆچ هات و ئەو هاوڕێیەکی دڵسۆزی کێ بوو؟ هاوەڵی عومەری کوڕی خەتاب، ئەو لەگەڵ عومەر کۆچی کرد، ئەوان لە ڕێگەدا بوون، دایکی کەسێکی نارد بۆ لای هەتا پێی بڵێت: دایکت دەمرێ و سوێندی خواردوە کە لە سێبەردا نەوەستێ و خۆی نەشتوات، ئەو لە خۆردا و لەبەر گەرما دەمێنێتەوە تا تۆ دەگەڕێیەوە بۆ لای... عەیاش دەستی کردە شڵەژان... ویستی بگەڕێتەوە بۆ لای دایکی، بەڵام عومەری کوڕی خەتاب دەستی کردە دڵدانەوە و خۆڕاگری

کردنی و پێی فەرموو ئەی عەیاش گەر ئەمڕۆ لە بەرخۆر بمێنێتەوە ئەوا سبەینێ دەچێتە بەر سێبەر وەگەر ئەمڕۆ خۆی نەشوات ئەوا ئەسپێ لێی دەدات و خۆی دەشوات واتە تۆ بۆ هێندە نیگرانی دایکتی، ئەو دوای دوڕۆژی دیکە سکاڵای چەپەڵی لە خۆی دەکات و خۆی دەشوات، گەر ئەمڕۆ کەمێك بەرگەی بەرخۆر بگرێ ئەوا سبەینێ ماندو دەبێت و لێی دور دەکەوێتەوە و دەڕواتە سێبەر، عومەر(ﷺ) ئەو سەقامگیر دەکات و عەیاش دەڵێت هەر دەبێت بگەڕێمەوە عومەریش پێی دەفەرموێ گەر بگەڕێیتەوە دوچاری خراپەکاری دەبیت...

سەرنجی ئەو نرخە بدە کە تۆ هاوەڵێکت هەبی و پێت بڵێ: کاری وامەکە... براکەم ئەوە حەرامەو دەکەویتە هەڵەوە... بەدوای ئەو هاوەڵەدا بگەڕێ، وێنەی ئەم جۆرە هاوەڵانە ئێستا زۆر کەمن...

عەیاش ووتی هەر دەبێ بگەڕێمەوە، کاتێ کە عومەر(ﷺ) زانی قسە کردن لە گەڵێدا هیچ سودێکی نی یە و عەیاش سورە لەسەر ئەوەی بگەڕێتەوە هەستا کارێکی زۆر سەر سوڕهێنەری لەگەڵدا کرد... لە حوشترەکەی هاتە خوارێ ئەو دەمە عەیاش حوشتری پێ نەبوو وە پێی فەرموو: ئەی عەیاش تۆ کە نکوڵی دەکەیت لەسەر گەڕانەوە ئەوا بە حوشترەکەی من بگەڕێوە ڕەنگە ڕۆژێك منت وەیاد بهێنێتەوە و پێی بگەڕێیتەوە . حوشتریش وەك ئۆتۆمبێل گرانە واتە لەڕوی نرخ و بەرزی نرخەکەیەوە... عەیاش حوشترەکەی بردو گەڕایەوە نێو کەسانی و ئەشکەنجەیان دەدا و لێیان دا نزیك بوو دوچاری خراپە ببێت، حوشترەکەی عومەر(ﷺ) وەك یادگاری یەك لە لای عەیاش مایەوە هەرکاتێ کە دەبینێ باوەڕ و ئیسلامی وەیاد دەهاتەوە، پاشان عەیاش بە چاکەی عومەر گەڕایەوە بۆ نێو ئیسلام.

پرسیار: ئێمە لە کوێی ئەم کارە داین؟ هاوڕێکانمان لەکام جۆریانن؟ کێ هەڵبژێرین؟ من ئەمەم دەوێ لە ئێوە کە دیاری بکەن و بەڕاستی وەری بگرن.

# ڕای لاوان

## هاوەڵ و ڕاستگۆیی:

لە ڕاستیدا من ئەزموونێکم لەم بابەتە دا هەیە، من هاوڕێ یەکم هەبوو لە لایەکی ترەوە بە تەواوی لە سەرەتای پابەندیمەوە، ئەو هاوڕێ یەم زۆر لە منەوە نزیك بوو، ئەو هاوکارێکی باشی من بوو لە ڕوی پابەندیمەوە کاتێ یەکترمان دەدی بۆ نمونە پێی دەوتم دوای نوێژی عەسر دەتبینم، یان لە فلانە شوێن پێکەوە نوێژەکانمان دەکەین، ئەمە کارێکی زۆر گرنگە کە مرۆڤ هاوڕێیەك بدۆزێتەوە دامەزراوی بکات لەسەر ملکەچی خوای گەورە.

## کاریگەری پەروەردە:

من دەمەوێ بڵێم کە ئەم بابەتە لەپەرسەندن و پەروەردەی ئاینی یەوە دەست پێ دەکات هەرچەند مرۆڤ ڕوبەڕوی مەترسی بێتەوە، یان ڕوبەڕی سەختی و هەڵە بێتەوە و پێویستە جارێکی دیکە و سەر لەنوێ بگەڕێتەوە سەر ڕاستی یەکان، چونکە ئەو سەرەتاکەی ڕاستە، من کیژێکم سەرەتا لە قوتابخانەیەکی ئیسلامیدا... سبحان الله ئێمە لە کاتی نوێژەکاندا فەرشمان ڕادەخست و نوێژمان دەکرد، زۆر هەستم بە مانای ئیسلام و ئاین دەکرد لە هەمو ساتێکدا، بەڵام بەداخەوە گرفتێ لە قوتابخانەکە هاتە پێشێ و لەسەر خواستی باوکم گوێزرامەوە بۆ قوتابخانەیەکی دیکە... سبحان الله کاتێ کە چومە قوتابخانەی دووەمم دوچاری گرفتی هاوەڵی گرتن بووم، من زۆر ماندو بوم هەموو جارێ دەچومە لای دایکم و تێر دەگریام و پێم دەوت کوا دین و ڕەوشت ؟ من دەترسم و ڕا دەماڵرێم ئەی دایکە وە لەم کاتەدا من لە پۆلی یەکەمی ئامادەیدا بووم و دەمویست باڵا پۆشی ئیسلامی بکەم و هەموان لەسەر من دەدوان کە هیچ هاوەڵێکی نی یە، کوا هاوڕی کەت ؟ وەك ئەوەی من کیژێکی سەر مەریخ بم، سبحان الله ئارامم گرت لە پەروەردگار دەپاڕامەو و دەم وت: پەروەردگارا لەسەر ملکەچی دامەزراوم بکە سبحان الله نزاو ئارامی بەچاکە و فەزڵی خودا بوو لەگەڵ پشت بەستن بە ئەو من توانیم سەرکەوم بە

بەدەست هێنانی هاوڕێ یەك كە ئێستا هاوڕێمە خوای گەورە ئەوی كردە هاوەڵی مـن تـا هەریەكەمان ئەوی دیكەمان دامەزراوتر بكات سوپاس بۆ خودا ئەو حیجـابی دەپۆشـی و منیش بومە یەكێك لە پالأپۆشەكان وە كاتێ كە چوینە كۆلێژ ئەو هاوكارێكی باشـم بـوو ئەو لە نێو وانەكاندا بە منی دەوت وەرە با سبحان الله و إستغر الله بكەین.

## پەنا بگرە بەخودا لە خراپە:

سەبارەت بە هاوەڵی چاك و هاوەڵی خراپ كە هەریەكێك دەتوانێ خۆی گورج بكاتـەوە بۆهەر تێگەیشتنێ... یادی هاوەڵێكی ئازیز خۆم دەكەمەوە و لە خـوای گـەورە دەخـوازم ئەو پەیڤانەی بێتەوە یاد كە بە ئێمـەی دەوت، ئـەو كەسـە زۆر لـە خـوداوە نزیـك بـوو، پەیوەست بوو بەهاوەڵی چاكەوە و هەموو نوێژەكانی لە مزگەوت دەكـرد و بـەردەوام بـوو لەسەر زیكرەكانی و زیكری بەیانیان و ئێوانی هەبوو وە ڕۆژانە ویرد و ملكەچـی هـەبوو، بەلأم ئەم كەسە بۆ دۆخێكی دیاری كراو چەند هاوەڵێكی دیكەی پێشی كەوتن ئەم هاوەڵێ گرتنە ئاهەنگ و شەوانە مانەوە لە دەرەوەی ماڵ و ڕازانەوەی تێدا بـوو، بـەلأم بەداخـەوە ئەو هاوڕێیەتی ە پێشڕەوی كرد لە ژیانی ملكەچی و پەرستنەوە بردی بۆ ژیـانێكی تـەواو جودا تر، بەجۆرێ حەزی لەوە دەكرد كە شەوانە لـەدەرەوە بمێنێتـەوە وای لێ هـات خـۆی ڕازی دەكرد: و خۆی قابل بكات (ئـەی چـی ڕو دەدات گـەر هەفتـەی ڕۆژێـك لەگـەڵیان بمێنمەوە)، ئەو هەمو شەوانێكی پێنج شەممە تا بەیانی لەگەڵیان دەمایەوە و دەیوت مادام نوێژی بەیانیم كردوە گرفتم نی یە، بەلأم هەمو ڕۆژگارەكـانی گـۆڕان بـۆ ئـەم ژیانـە ئـەو سەرەتا وازی لە زیكرەكان هێنا و، پاشـانیش لـە نوێـژكردن و ژیـانی تـەواو گـۆڕا، ئـەو ڕۆیشتە نێو چوارچێوەیەكی دیكەوە ئەو هەموو جارێ دڵنیای دەكردینەوە كەتەوقە لەگـەڵ كچاندا نەكەین، ئێستا پێشڕەوی كردنەكەی بەم هاوەڵێ گرتنـە خـۆی هاوڕێیـەتی كـچان دەكـات و تەوقـەیان لەگـەڵ دەكـات، ژیـانی بەتـەواوی گـۆڕا بـە جـۆرێ چـویە نێـو چوارچێوەیەكی دیكە لە ژیانی دوور لە خودایی، من داوا لە خودا دەكەم كە ئـەو هاوەڵـە بمان بینێ و بیر لەو پەیڤانەی بكاتـەوە كـە زۆرێـك لـە هاوەڵـەكانی بـۆ كەسـانی چـاكتر گۆڕی...

لە ڕاستیدا دەمەوێ پرسیارێك بوروژێنم گەر هاوەڵێکی گوناهبارم هەبێ ئایا ڕاستە لێی دور بکەومەوە و وازی لێ بهێنم و دەستی نەگرم و لەگەڵی دانەنیشم، یان لەسەر ئەو حاڵەتەی لێی گەڕێم وبڵێم گرنگ ئەوەیە کە پارێزگاری لە خۆم بکەم؟

تۆ خوڵقێنراوێکی کۆمەڵایەتیت لەبەر ئەوە کە تۆ لە هاوەڵەکانت دەگەڕێی دەبێ لە خودای گەورە بپاڕێیەوە و بڵێی: ئەی پەروەردگارا، بە هاوەڵێ باشترم ئاشنا بکەی... هاوەڵانی ڕێزدارو ئیماندار کە دامەزراوم بکەن لەسەر ئەوەی لە تۆ نزیك ببمەوە و لە خراپەکاری دورم بخەنەوە وە هاوەڵیش سێ جۆرە کە ئەمانەن: هاوەڵە گوێ ڕایەڵەکان، هاوەڵە بێ ئاگاکان، هاوەڵانێکی گوناهباری دور لە ئاین و دور لە ڕەوشت.

هاوەڵە گوناهبارەکان، پێویستە لێیان دور بکەویتەوە، بەڵام هیچ ڕێگری یەك نی یە کە لە نێوانی تۆو ئەواندا پەیوەندی یەك هەبێت، چونکە هەر ڕۆژێك دێت و دەستیان بگریت و ڕێنمونیان بکەیت بۆسەر ڕاستە شەقامی ئیسلام لەبەر ئەوە پارێزگاری لەو پەیوەندی یە بکە بۆ نموونە جەژنەکان و بۆنەکاندا، بەڵام بێ ئاگاکان ئەوانە چین و توێژێکی بەڕەوشتن، بەڵام نە گوناهبارن، نە گوێ ڕایەڵن، تۆ هەوڵ دەدەیت، کە دەست گرۆیی بکەیت و لەگەڵیدا دەمێنیتەوە و هەوڵی لەگەڵدا دەدیت بەهەر ڕێگایەك بێت، بەڵام ملکەچ و گوێڕایەڵەکان بەدەست و دەم هەروەك دەڵێن دەیان گری و هەوڵ بدە کە پەیوەندی، یان پێوە بکەیت و لەگەڵیان بڕۆیت، چونکە ئەوان هاوەڵ و کەشی تۆن و ئەوان لە تۆوە نزیکن.

# چەند چیرۆکێکی ڕاستەقینە

## خۆشەویستی و برایەتی لە پێناوی خودا

ناوم ئەحمەدە لەدایك بووی ٥ی نۆڤەمبەری ١٩٧١م لەشاری ٦ی ئۆکتۆبەر لە یەکێك لە کۆمپانیاکانی بەرهەمهێنانی ئۆتۆمبێل کاردەکەم، لەگەڵ سەرەتای ماوەی خوێندنی ناوەندیدا, بەهیچ شێوەیەك لە ژیانی خۆم ڕازی نەبووم، لەبەر ئەوە شێوازێکی دیکەم گرتەبەر، فێری جگەرکێشان بووم هەوڵ و کۆشەکانی دایك وباوك سودیان نەبوو، لە دوور خستنەوەم لێی وە ئاستی خوێندم دادەبەزی وە کێشەیەکی دیکە ڕوی لەناخم کرد، چونە دەرەوە ی زۆر لەماڵ و مانەوە لە دەرەوە و گەشت کردن لەگەڵ هاوڕێکانم، ئەمەش کاری تێکردم و وای لێ کردم کە نمرەیەکی کەم بەدەست بهێنم، چومە کۆلێژی سەربازی یەوە هەمیشە گرفتم لەگەڵ گەورەکاندا، یان لەگەڵ هاوڕێ کۆنەکانم دا دەخولقاند وە لە کۆتایدا و دوای ساڵانێکی دوور و درێژی کۆلێژ بڕیار ڕوون و ئاشکرا بوو ئەویش ئەوە بوو،کە من ناتوانم خوێندنەکەمی تێدا تەواو بکەم دیارە ئەمەش وای لێ کردم کە بڕیار بدەم و وازی لێ بهێنم لەگەڵ ئەوەشدا کەسەکانم هانیان دەدام و ڕازییان دەکرد کە درێژە بە خوێندنەکەم بدەم، ئەوان تەواوی داخوازی یەکانی منیان بەجێ دەهێنا کە بڕیای دەست بەجێ و بەپەلە سەبارەت بە وازهێنان لە کۆلێژ دەر نەکەم دیارە ئەمەش کاریگەری خۆی هەبووە زیادەڕۆیی لە لادان لەلای من بە پلەیەکی گەورە بەم شێوەیە ژیانم ڕێڕەوێکی دیکەی گرت بە جۆرێ هاوڕێکان ناویان نام شەیتان بەهۆی زۆری بیرکردنەوەم... واتە ئێمە هەموو کارێکمان دەکرد لە خواردنەوە.. دەرچون... کیژان... هەتا گەیشینە ئەوەی کە پرسیار لە خۆمان بکەین کە ئەو کارە حەرامە چی یە تا ئێستا ئێمە نەمان کردوە، سوو خواردنمان دۆزیەوە، بۆیە بڕیارماندا کە کاری سوخواردن بکەین بە پیشەکی پارەدان و وەرگرتنەوەی بە زیاتر لە ڕۆژی دواتر... بەم شێوەیە تەواوی کارەکانمان حەرام بوو... بە واتایەکی دیکە ئێمە دەمان ویست، کە بیسەلمێنین بۆ خۆمان، کە کاری حەرام دەکەین... چومە کۆلێژی بازرگانی و بڕیارم دا کە بایەخ بە خوێند نەدەم ئەگەر چی بڕوا نامەم دوای ١٠ ساڵ وەرگت لە سەرەتادا دەرچوم، بەڵام پاشان کەوتم.

لە ڕاستیدا دەستم کردە گێرە شێوێنی لە ژیانمدا و هەستم دەکرد، کە من لە نائـارامی یەکی تەواو دام وە هیچ شتێك ناتوانێ بەجۆرێ لە جۆرەکانی بەختەوەریبێتە ناخمەوە، یان بەجۆرێ لە جۆرەکانی ڕازیی، لەساڵی دوهەمدا بایەخم دایە خوێند تا ڕایدەیەك و بەجۆرێ بیرم دەکردەوە و هێور دەبومـەوە و دەسـتم کـردە دورکەوتنـەوە لـە هاوڕێکـانم تەنانـەت حەزیشم نەدەکرد کە چاوم پێیـان بکـەوێ تـەنها یـەکێکیان نـەبێ کـە لـە تەنیـشتمەوە دادەنیشت و ناوی ئیهاب بوو، ئەو لە کۆلێژدا لەگەڵ من بوو باوکی لە یـەکێك لـە وڵاتـە عەرەبی یەکان کاری دەکرد، ئیهاب لە نیوەی مانگی ڕەمەزاندا چـو بـۆ لای بـاوکی ئـەو کاتێ کە گەڕایەوە زۆر گۆڕابوو بەو شێوەیە نەبوو کـە ڕۆیـشت بـۆ ئـەوێ دیـتم دەسـتی کردۆتە نوێژ کردن لە مزگەوت و شێوازی ئاخاوتنی جۆرێکی دیکە یە و ئەو باسی ئـەوەی بۆ دەکردم کە گۆڕاوە و ژیانیشی گۆڕاوە، بەڵام سەبارەت بە من ئەوە شتێکی گاڵتە جاری بوو و وتم: ئەوە شتێکە و داویە لە کەللەی وەکو هەر شتێکی دیکە لـە کەللـەی ئێمـەش دەردەپەڕێ دەڕوات گرنگ ئەوەیە پەیوەندی نێوانمان گەیشتە ڕادەیەك کـە دڵـە ڕاوکێـی و نزیك بوو لە پچڕان.

من سەبارەت بەخۆم کاتێ کە سەرقاڵی وانەکانم دەبم لە نزیکی خۆم ڕادیۆیەك، یان تەلەفزیۆنێ دادەگیرسێنم و بایەخی پێ نادەم هەر بەڕێکەوت بێزار بووم لە تەواوی کاسێتەکانم، کاسێتێکی نەناسراوم دیتەوە و خستمە نێو تەسجیلەکەم کاتێ کەدیتم لە قورئان دەچوو، بەڵام پاشتر زانیم کە نزایە، ئەو کاسێتە زۆر جوان بوو وە یەکەم جار وو کە من گوێم بۆ دەگرت، نزای جوان و گریان و کۆمەڵە شتێك کە یەکەمین جار بوو گوێم بۆ دەگرت، ڕۆژێك دابەزیم و نوێژی عەسرم لە مزگەوت کرد، کەچومە مزگەوتەکەوە هەموان سەرسام بوون کە چۆن کەسێکی وەك من گەیشتۆتە مزگەوت؟ واتە کە نوێژی هەینی نەکات دەکرێ بچێە مزگەوت و نوێژی عەسر بکات؟ چووم و نوێژی عەسرم کرد... پاش ئەوەی کە لە نوێژەکەم لێ بومەوە دیتم کە سێك وەستاوە و دەست بەسەرمدا دێنی و، پاشان دانەو یەوە و سەری ماچ کردم، بەڕاستی زۆر، بەڵامەوە سەیر بوو دەست بەجێ کەسێکم دیت کە دراوسێ مان بوو لە کۆڵانەکەدا و هاوڕێی باوکم بوو، هەستم بە ئارامی یەکی نامۆی دەرونی کرد و هەستم کرد کە جەستەم هەڵدەلەرزێ و چاوەکانم پڕ ئەسرینن،

هەستێك بوو کە پێشتر هەستم پێ نەکردبوو، وپاس بۆ خودا هەر ئەو ڕۆژە نوێژی شێوان و خەوتنانم لە مزگەوت کرد و مامۆستای پێش نوێژیش کۆتایی سورەی (الزمر)ی دەخوێند، کە ئەفەرموێ: ﴿قُلۡ يَـٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسۡرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ لَا تَقۡنَطُواْ مِن رَّحۡمَةِ ٱللَّهِۚ﴾ الزمر: ٥٣، کاتێ کە گوێم لەم ئایەتە بوو هەستم کرد کە ئەم پەیڤە بەر من دەکەوێ... کاتێ کە لە مزگەوت هاتمە دەرێ ئیهابم دی کە وەستا بوو وە لەبەر دەرگای مزگەوتەکەدا یەکەمین هەنگاو کە لە مزگەوت چومە دەرێ ئەو بەرومدا هات و بەگەرمی باوەشی پێدا کردم بە جۆرێ کە هەرگیز لەبیرم ناچێ ئەو منی ماچ کرد و چەند پەیڤێکی جوانی پێ وتم و ووتی: دڵنیابە هەرچەند بڕۆیت جگە لەم جێگایە هیچ شوێنێکی دیکە نابینیتەوە و جارێکی دیکەش بۆی دەگەڕێیەوە... ئالەم کاتەوە من لە ناخی خۆمەوە هەست دەکەم کە گەڕاوەمەوتەوە... هەرگیز فەزڵی خوای گەورە لەیاد ناکەم کە ئیهابی بۆ من نارد، بە جۆرێ گەر سەرپێچی خوای گەورەشم بکردایە لە بەردەمیدا ئەو ئارامی لەسەر دەگرت و ئامۆژگاری دەکردم، تەنانەت ئەو وازی لە مزگەوت دەهێنا کە نوێژی تەراویحی تیا دەکرد لەگەڵ من دەهات بۆ مزگەوتێکی تر کە زۆر زوو لە نوێژ دەبنەوە دواتر زانیم کە ئەو دەگەڕێیتەوە بۆ ماڵەوە و نوێژی تەراویح لە ماڵەوە تەواو دەکات.

ئیهاب خوای گەورە ڕێزداری بکات هەوڵیدا کە کۆمەڵگەیەکی دیکە بۆ من بدۆزێتەوە ئەو منی ناساند بە چەند لاوێکی نامۆ لە نێو کۆلێژدا من وام دەزانی کە پیاوی ئاینی دەبێت کەسێکی بەساڵا چووی ڕیشدار بێت و دەم و چاوێکی گرژی هەبێت و دزداشەی کورت بپۆشێ، بەڵام من ئەو لاوانەم دی کە هەمویان نایاب و پابەند بوون سوپاس بۆ خودا، لە هەمان کاتدا دەچونە دەرێ و یاریان دەکرد و خۆشحاڵ دەبوون و ممارسەی هەمو چالاکی یەکی ژیانیان دەکرد لە سایەی ملکەچی کردنی خودا و لە پێناو ملکەچی خوای گەورە... وە لە کۆتایدا کۆمەڵگەیەکی دیکەم دۆزی یەوە و تیادا هەستم بە ئارامی کردو چی دی پێویستیم بە کۆمەڵگا کۆنەکەم نەما، هاوەڵە دێرینەکانم بۆ نمونە من لەگەڵیان دەبوم و پێدەکەنیم و لەگەڵیان دەدوام و گەر پشتی ی خۆمم دایەنێ ئەوا بە جۆرێ قسەیان پێ دەوتم من هەستم کرد کە هەندێ کێشانەیەکی دیکەم هەیە کە ڕەفتار و کردارەکانی پێ دەکێشم: برایەتی و خۆشەویستی لە پێناو خوادا.

ئەمە چیرۆکی ژیانی ئەحمەد بوو لە ڕاستیدا ئەحمەد لە لێدوان لەبارەی هاوڕێی خراپە دەمنبات بۆ باس کردنی هاوڕێ ی باش, بەواتایەکی جوان، کە بریتی یە لەخۆشەویستی و برایەتی لەبەر خودا، ئەحمە دەڵێت:(ئەو بە جۆرێ لە کۆشی گرتم کە هەتا لە ژیانـدا بم هەرگیز لە یادی ناکەم) وەك ئەوەی کە کۆشی سەقامگیری بێت وەك ئەوەی کە کۆشێك بێت یەکێك لەسەر ڕێگای خودا یی جێگیر بکات، هەمیشە و تا مردن ئەحمەد یادی ئەم کارە دەکاتەوە و ئەمەش کارێکی نوێی یە کە ئێمە لە ژیانماندا نایزانین (خۆشەویستی لەبەر خودا)، (برایەتی لەبەر خودا) تۆ مرۆڤێکت هەیە کە خۆشت دەوێ، لە دونیادا هیچت لێی ناوێ جگە لەوەی کە تۆ لە پێناوی خودا خۆشت دەوێ و دەستت دەگرێ بۆ مەبەستێك کە بە هۆیەوە بتخاتە بەهەشتەوە لە ڕاستیدا کە ئەحمەد باسی ئیهابی کرد فەرمودەیەکی حەزرەت(ﷺ)ی وەیاد هێنامەوە کە دەفەرموێ: (حەوت کەس لە سایەی خودا دا دەبن لە ڕۆژێکدا هیچ سایەیەك نی یە جگە لە سێبەری ئەو... لەوانە... دو پیاو لەبەر خاتری خودایەکتریان خۆش بوێت).[1]

خەڵکی هەموان ڕۆژی فەسلان لەبەردەم خۆرێکی گەرمی بەتین دەوەستن و گەرمایی یەکەی لە کەڵەی سەر نزیك دەبێتەوە و ئارەق و ماندو بووم و گوێ قوڵاخی و چاوەڕوانی بۆماوەی چەند ساڵێکی درێژ دەبێت، بەڵام لەو ڕۆژەدا حەوت چین لە خەڵکی، نا لە سێبەری داردا بەڵکو لە سایەی عەرشی پەروەردگارماندا دەوەستن لەوانە دو پیاو کە لەبەر خوا یەکتریان خۆش ویستووە، وەرن لەم واتایە بدوێین کە زۆرێك لە خەڵکی لیّ ی بێ بەش بووە (دو پیاو لە بەر خاتری خودا یەکتریان خۆش ویستوە لەبەر ئەو کۆبونەتەوە و لەبەر ئەویش لێك ترازاون)، ملکەچی پەروەردگار کۆیان دەکاتەوە و ڕۆژێك دەترازێن، ئەوان لێك دەترازێن و ئامۆژگاری یەکدی دەکەن بە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خودا چۆن هەڵدەستین بۆ نوێژی بەیانی و کێ پەیوەندی بەوی دیکەوە دەکات یەکێکیان بەوی دیکە، یان دەڵێت لەبیرت نەچێ ئەمڕۆ دو ڕکات نوێژ بکەیت، ئاگات لەو تاوانە بێت، ئەمەیە برایەتی و خۆشەویستی لە پێناوی خودا...

---

١ـ بوخاری دەرهێناوە.

کاتێك کە خوای گەورە یەکێکمان ڕێمونە دەکات، با ئەوە بکەینە بنەما بۆ خۆمان، کە خەندە لە ڕومان نەبڕێت و کاری سەرەکی ئەوەیە کە تۆ شادومان بیت و هەمیشە بە نەرمی مامەڵە لەگەڵ خەڵکانی بەرامبەرتدا بکەیت، سەرشانی ئەو بتەکێنی و دەست بەسەر ئەوی دیکەدا بێنی...

ئایا ئێوە وریای چیرۆکەکەی ئەحمەد بوون، کە وتی: (فلان کەس دەستی هێنا بەسەرمدا)و (فلان کەس باوەشی بۆ گرتمەوە) ناخی مرۆڤ ئارەزوی ئەم جۆرە کارانە دەکات... ئێستا زۆرێك لە خەڵکی ئەمە ناکەن، بەڵام ئەمە کاری بنەڕەتی بووە لەسەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ)، ئەم واتایانە دڵەکان نەرم و نیان دەکات و ئەمەش بریتی یە لە ئیسلام...

ئیسلام بریتی نی یە لە توندی و گرژی و هەڵچون و توندوتیژی بەڵکو بریتی یە لە ناسکی و نەرمی و سۆزو گیانی ئیسلام بریتی بوو لەوەی کە ئیهاب مامەڵەی لەگەڵ ئەحمەد پێ دەکرد.

ئای لەو بەختەوەری یە خوای گەورە مرۆڤێکی بۆ ڕەوانە دەکات کە لە پێناوی خودا دا خۆشی دەوێت... عومەری کوڕی خەتاب(ﷺ) دەفەرموێ: (گەر کەسێکتان خۆشەویستی یەکی لە براکەی بەدی کرد با دەستی پێوە بگرێت چونکە کەم کەس ئەوەی چنگ دەکەوێ) لە(الاثر) یشیدا هاتووە،کە(لەپاش ئیسلام هیچ شتێك نەدراوەتە بەندەی خوا کە چاکتر بێت لە برایەتی باش گەر لە یادی چو بیری دەخاتەوە و گەر بیری کەوتەوە هاوکاری دەکات)...

کاتێ کە گوێ بۆ ئەم فەرمودە قودسی یە دەگرین هەست بە چێژی برایەتی دەکەین کە مەعاژی کوڕی جەبەل لە پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش لە خوای گەورەوە بۆمان ڕیوایەت دەکات کە خوای گەورە تیایدا دەفەرموێ: (خۆشەویستی خۆم بەخشیوە بۆ ئەو کەسانەی کە لەبەر من یەکدیان خۆش دەوێ)[1]... خۆشەویستیم واجب بووە واتە گەر دو کەس

---

١ ـ ترمذي و ابو داود و إمام احمد له (مسنده))كەی.

یەکێکیان ئەوی دیکەیانی لە پێناوی خودا خۆش بوێ لە پێناو خواردن و پارە پەیدا کردن نەبێت... واتە: ئێمە هەندێ کەس دەناسین تا خوا بپەرستین و هەموویان شایستەی ئـەوەن کە خۆشەویستی خوایان پێ ببەخشرێت.

نرخی خۆشەویستی خـودا لای ئێمـە کاتـێ بێگومـانی تێدەکـەوێ کـە گوێمـان لـەو فەرمودەی پێغەمبەر(ﷺ) دەبێت: کە دەفەرموێ: (لـەنێو بەنـدەکانی خـوادا خـەڵکانێك هەن کە نـە پێغەمبـەرن و نەلـە توێـژی شـەهیدانن، بـەڵام ڕۆژی دوایـی پێغەمبـەران و شەهیدان ئیرەیی بەو جێگەیە دەبەن کە خوای گەورە پێی بەخشیوون) یاران ووتیـان ئـەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)پێمان دەڵێیت ئەوانە کـێن ؟ ئـەویش فـەرمووی:(ئەوانـە گـەلێکن یەکتریان خۆش دەوێ بەگیانی خوداو نە لەسەر بەسۆزی نێوانیـان و ئـەو ماڵـەی کـە بـە یەکدی دەیبەخشن سوێند بەخوا نێو چەوانی ئەوان هەر نورە و خۆشیان لەسەر نـورن گـەر خەڵکی ترسا ئەوان ناترسن و، گەر خەڵکیش دڵتەنگ و غەمبار بوون ئەوان دڵەنگ نابن، پاشـان ئـەم ئایەتـەی خوێنـد﴿أَلَآ إِنَّ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ﴾[1] یونس: ٦٢

هەروەها حوژەیفەی کوڕی یەمان لە پێغەمبـەر(ﷺ)وە دەگێڕێـەوە کـە دەفـەرموێ:( باوەڕدار گەر گەیشت بە باوەڕدار سـڵاوی لێ دەکـات و بەتەوقـە دەسـتی دەگوشـێ، بـە هۆیەوە گوناهەکانیان وەك گەڵای دار دەوەرێ ).[2]

زانیمان بۆچی پەروەردگار بە پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرموێ: ﴿وَٱصۡبِرۡ نَفۡسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥ ﴾ الکهف: ٢٨.

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) تا چ ڕادەیەك ڕێزی ئەم پەیوەندی یەی دەگـرت... پەیوەنـدی خۆشەویستی لە پێناوی خودا... ڕێزی زۆری لێ دەگرت هەروەها زۆر پـەرەی پـێ دەدا...

---

١ـ ئەبو داود ریوایەتی کردوە .

٢ ـ طبراني لە کتێبی (الأوسط) .

تەنانەت لە غەزای ئوحود ژمارەی کوژراوانی موسڵمانان گەیشتە ٧٠ شەهید و برینداران زۆر بوون و ماڵ نەبوو خاوەنی شەهیدێك نەبێ، حەزرەت(ﷺ)داوای لێ کردن کە هەر دوانیان بخەنە گۆڕێکەوە، یاران دەستیان کردە بەجێ هێنانی فەرمانەکەی پێغەمبەر(ﷺ)ئەویش لە کاتێکدا کە دەگریا و دڵتەنگ بو بۆ شەهیدبوونی حمزە، بەڵام لەو کاتەدا فەرموی بگەڕێن بەدوای عبد الله کوڕی حەرام و عەمری کوڕی جموح و لەیەك گۆڕدا بە خاکیان بسپێرن، چونکە ئەوان لە دونیا زۆر یەکدیان خۆش دەویست حەزرەت(ﷺ) لەنێوەندی ئەم کەشەدا لە ماڵەکەی دێتە دەرێ و لەنێو هەمو یاراندا بەدوای عومەر و ئەبو بکردا دەگەڕێ و، پاشان دەستیان دەگرێ و لەڕەوزەکەیدا دەفەرموێ: (ڕۆژی دوایی بەم شێوەیە زیندوو دەکرێینەوە).[١]

لە ڕاستیدا پەیوەندی خۆشەویستی لە پێناوی خوادا پەیوەندی یەکی زۆر جوانە لە نێوەندی ساتە وەختێکدا مرۆڤێکت لە دەست دەچێت کە دەستت دەگرێ هەتا بەرەو پەیڕەوی خودایت بەرێت... کەسێك لەگەڵی دا دەنیشی هەردووکتان پێکەوە دەدوێن و خوای گەورەش لێتان ڕازی یە لەهەمان کاتدا چاکەتان بۆ دەنوسێ و خوای گەورە بەم کۆبونەوە و دانیشتنەتان خۆشەویستی خۆیتان بۆ واجب دەکات.

ئێمە زۆرێك لە هاوڕێیان دەبینین کە لە دونیادا خیانەت لە یەکدی دەکەن و یەکتری بەرەو گومڕایی و سەرگەردانی دەبەن، بەڵکو یەکدی ئەشکەنجە و ئازار دەدەن، بەڵام گەر کەسێکت لە پێناوی خودا و لەبەر خودا خۆش ویست ناکرێت ئەو سەرگەردانت بکات.

## تۆ بەشێکی لەمن:

سەیری ئەم چیرۆکە بەچێژە بکە سەلمانی فارسی لەگەڵ ئەبو درداو دەبنە برا، ئەبو دەرداو لە تەمەنی منداڵیدا ژن دێنێ و سەلمان ئەو کارە دوا دەخات، سەلمانی گەڕۆك بە دوای ڕاستیدا دەمێنێتەوە و بەدوای چێژی ئیماندا دەگەڕێ، سەلمان لە کاری هاوسەرگیری دوا کەوت و ئەبو درداو پێشی دایەوە، بەڵام کاتێ سەلمان بڕیاری پێکەوە نانی خێزانی دا کیژێك ی دەست نیشان کرد لە یەکێك لە هۆزەکانی ناوچەکە کە زۆر سەرسامی کرد بوو،

---

١ـ ترمذی و إبن ماجە لە عومەرەوە وەریان گرتوە.

بەڵام ئەو هەستی کرد بو کە لە تەمەندا گەورەیە بۆیە شەرم دەیگرێ کە بڕواتە داخوازی، ئەو هەستی کرد کە گەورەیە بۆ ئەم کارە چی بکات؟ هەستا و ئەبو دەردای نارد بۆلای باوکی کچەکە، ئەوە بوو دەرداو ڕۆیشت باوکی کچە پەیڤێکی زۆر سەیری ووت: (سەلمان من پێی سەرسام نیم و کچی خۆمی پێ نادەم، بەڵام تۆم دەوێ بۆ کچەکەم) بێنە چاوی خۆت!!

ئەبو درداو ئەمەی پەسەند نەکرد و ووتی داخوازی لەسەر داخوازی براکەم ناکەم... پیاوەکەش ووتی:هەرگیز کچی خۆم نادەمە سەلمان، بەڵام من تۆم دەوێ بۆ کچەکەم بڕۆ بۆ لای سەلمان و ئەمەی پێ بڵێ ئەبو درداو هەر بەرپەرچی دەدایەوە، پیاوەکەش پێی ووت:سوێندت دەدەم دەبێ بگەڕێیتەوە بۆلای سەلمان و من تۆم دەوێ بۆ کچەکەم واتە: کچەکەم دەدەمە خۆت ئەبو دەرداو گەڕایەوە لای سەلمان و خەریك بوو شێت دەبوو... سەلمان بینی و پێی ووت:چیتە ئەی ئەبو درداو چیت کرد ؟ ئەویش بێدەنگ بوو... بۆیە سەلمان لێی نەگەڕا هەتا ئەبو دەردا ووتی باوکی پێی ووتم:کچم نادەمە سەلمان بەڵکو بەتۆی دەدەم... سەلمانیش سەیرێکی ئەبو دەردای کرد و پێکەنی و پێی ووت:تۆ نازانی ئەی ئەبو دەرداو وێنەی من و تۆ وەك وێنەی ئەو ئایەتە وایە کە خوای گەورە تیایدا دەفەرموێ: ﴿وَنَزَعۡنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنۡ غِلٍّ إِخۡوَٰنًا عَلَىٰ سُرُرٖ مُّتَقَٰبِلِينَ﴾الحجر: ٤٧... خوازریام من و تۆش بەم شێوەیە بین... ئەی ئەبو دەرداو ئەو کچە بخوازە تۆ برای منی و بەڵکو تۆ پارچەیەکی لەمن!!

سبحان الله ئایا دەکرێ دوکەس بەم شێوەیە و تا ئەم ڕادەیە یەکتریان خۆش بوێت... هەرکەس خۆشەویستی یەکەی لەپێناوی خوادا بێ دەتوانێ زیاتر لەوەش بکات...

دەگێڕنەوە کە عەکرەمەی کوڕی ئەبو جەهل لە ڕۆژی جەنگی یەرموك بریندار دەبێت و برا موسڵمانەکەی لە تەنیشتیەوە دەمرێت... هەروەها عەکرەمەش دەمرێت هەردوك لە تینوێتی دا دەمرن ئاوگێڕێك دێت و عەکرەمە پێی دەڵێت ناخۆمەوە تا براکەم دەخواتەوە ئەویش دەڕوات بۆلای براکەی و ئەویش پێی دەڵێت ناخۆمەوە تا عەکرەمە دەخواتەوە، بەم شێوەیە ئاوگێڕەکە بەنێو دەکەس لەو بریندارانەدا دەگەڕێ و هەریەکان پێویستی بەقومێ ئاوەکە ڕەنگە ژیانی پێ ڕزگار بێت، بەڵام هەریەکێك لەوانە دەڵێت ناخۆمەوە تا

براکەم دەخواتەوە هەتا دەگەڕێت بەسەر دە کەسەکەدا و دەگەڕێتەوە بۆلای عەکرەمە دەبینێ ئەو لەپێناوی خوادا گیانی سپاردوە، باوەڕ بەم نمونانە بکەن، چونکە خۆشەویستی لە پێناوی خوادا زیاتر لەمەش دەکات، کاتێ کە پێغەمبەری خوا برایەتی خستە نێوان یارانیەوە یەکێکیان دەچێت بۆ لای یەکێکی دیکەیان و لەدەرگای ماڵکەی دەدات و پێی دەڵێت وەرە با پێکەوە دانیشین و چەند ساتێك بڕوامان بەهێز بکەین.

ئێستا ئەمە لەکوێ دەدۆزنەوە ؟ ئێمە زۆرمان پێویستی پێ یەتی، بەڕاستی دڵەکان زیاتر لە توانای خۆیان کولاًن... من ئەم پەیڤە دەڵێم و خوازیارم تۆش هەمو ڕۆژێ بپاڕێیەوە و بڵێیت: (خوای گەورە برایەکی چاکم پێ ببەخشێ کە دامەرزاوم بکات لەسەر ملکەچی و گوێڕایەڵیێ تۆ) من دڵنیام کە إن شاو الله ئەمە دێتەدی... کەسێك دەدۆزیتەوە کە دەستت دەگرێ و تۆش دەستی ئەو دەگریت هەتا خوای گەورە پێکەوە و لە بەهەشت کۆتان دەکاتەوە .

لە بەشی یەکەمدا لەسەر ئەوە دواین کە: هاوڕێکانت کێن؟ لەبەشی دوەمدا گواستمانەوە بۆ: بەدوای کەسێکدا بگەڕێ کە لە پێناوی خودا خۆشت بوێت، هەرکەس لە دونیا کەسێك ی دەست نەکەوێ کە خۆشی بوێت لەبەر خودا ئەوا لە دونیادا ژیاوە و چێژی شیرین ترین هەستی ئەم ژیانەی نەچەشتووە... دەکرێ کەسێك هەبێت کە لە پێناوی خوادا خۆشی بوێت، ئەمە زۆرترین شتە کە ئارامت دەکاتەوە و دەبێتە دڵسۆزی و لەگەڵیدا بە دڵنیایی و ئارامی یەوە دەمێنیتەوە.

لە کۆتایدا کوڕان و کیژان تکایە هاوڕێی خۆتان دەست نیشان بکەن، هاوڕێی خۆتان دەست نیشان بکەن تا لە تەواوی ساتەکانی تەمەنتاندا پەشیمان نەبن...

## خۆشەویستی:

ئەم بابەتەمان لە گرنگترین ئەو بابەتانەیە کە کوڕان و کیژان دەیزانن وە بەشێوەیەکی زۆر قوڵ کە بریتی یە لە خۆشەویستی... دەمانەوێ لە دڵەوە بەڕاستی لێوەی بدوێین.

با بەشێوەیەکی ڕوون باس لە هاوەڵی نێوان کوڕان و کچان بکەین و هەوڵ بدەیت ڕاست گۆ بین و دڵمان بکەینەوە...

بەڕاستی من زۆر وریایی دەدەم لەوەی کە ڕاستەوخۆ بچمە نێو باسەکەوە، هەندێ لە کوڕان و کچان دەڵێن: ئێمە دەزانین کە چی لەم بارەیەوە دەوترێ لەبەر ئەوە بەرپەرچی ئەوە دەدەنەوە کە خوێندنەوە تەواو بکەن.

## غەریزەی زکماکی

ئایا خۆشەویستی غەریزەیەکی زکماکی یە و خوای گەورە لەسەر مرۆڤەکانی نوسیوە ؟ ئایا مرۆڤ دەتوانێ بەبێ خۆشەویستی بژی؟ ئاسایی یە کە ئێوە دەزانن ئێمە باس لە ئاین دەکەین و پێش بینی ئەوە دەکەن کە ئێمە بڵێین: خۆشەویستی ئەوەیە کە تۆ دایك و بابت خۆش بوێ ڕاستە کە ئەمە خۆشەویستی یە و خۆشەویستی سەرەکیش تەنها خۆش ویستنی خودایە، بەڵام ڕێگە بدەن کە بڵێین: ئایا دەکرێ مرۆڤ بێ نیاز بێت لە خۆشەویستی ؟ بژی لەگەڵ ئەوەی کەسێك تۆی خۆش بوێت، یان خۆشیان بوێی... ؟ ئایا ئەمە دەبێ ؟ بەڕاستی نەخێر... کەس نی یە بەبێ خۆشەویستی بژی ئەمە شتێکی سروشتی و زکماکی یە گەر خوای گەورە ئەمەی نەخوڵقاندایە بۆ مرۆڤایەتی ئەوا ئومێد لەبەردەوامی ژیان و زۆر بوون نەدەکرا.

ئەم غەریزە یەکێکە لەو هۆکارانەی کە بۆتە مایەی بەردەوامی خەڵکی لە ژیانـدا کەواتە ناکرێ بیر لە ڕق بون لە غەریزە بکرێتەوە وە ناکرێ کاتێ لەسەری دەدوێین خۆمانی لێ بێ ئاگا بکەین... هەندێ گومانیان وایە کە بەوەی ئێمە مادەم لە دین دەدوێین ئەوە شتێکمان نی یە کە ناوی خۆشەویستی بێت وە ئەمەش بە ڕاستی مەنتقێکی زۆر هەڵەیە و دەلاقەیەکی سەرنەکەوتووە...

غەریزە هەر لەسەرەتای ژیانەوە سەری هەڵداوە... هەر لەسەرەتای دروست بوونی ئادەمەوە(ﷺ) فەرمودەیەکی پیرۆز بیرمان دەخاتەوە، کە ئادەم کاتێ چویە بەهەشتەوە هەستی بە تەنیایی دەکرد... لەگەڵ ئەوەی کە ئەو لە بەهەشتدا دەژیا، بەڵام هەستی دەکرد کە لە شتێکی کەم بوو.

ئەو هەستی کرد کە پێویستی بە حەوایە، ئەم ئاخاوتنە لە ئەفسانەوە نی یە بەڵکو لە فەرمودەیەکی پێغەمبەر(ﷺ)، ئەو کاتێ کە نوستبوو خوای گەورە لە پەراسوی چەپی حەوای بۆ خوڵقاند ئادەم هەستاو حەوای لە تەنیشتی خۆی بینی و پێی وت: تۆ کێی ؟ ووتی من: ئافرەتم، ووتی ناوت چی یە؟ ووتی: حەوا، ئادەم ووتی: بۆچی دروست بووی

حەواش ووتی بۆ ئەوەی لەلام ئارام بگریت، واتە ئەو هێمای ئارامی یـە، تـا لـەلای مـن ئارام بگریت... ئەمە نەك وەك ئەوەی كە حەواء كەنیزەی، یان مولكی ئادەم بێت بـەڵكو بە مانای ئەوەیە كە ئەی ئادەم و ئەی هەمو ئادەمـەكان تـا ڕۆژی دوایـی لـە تەنیـشت حەوادا نـەبێت ئـارامی و دڵنـەواییت نیـە... ئەمـە ئـاینی ئێمـە و ئیـسلامی ئێمـە و تێگەیشتنی ئێمەیە بۆ ئەم مەسئەلەیە.

سەرسامی لەوەدایە گەر تۆ لە هەندێ پەڕاوی ئاسمانی و نائاسمانیشدا و لەئاین زاكانی دیكەدا ئەوەت خوێندبێتەوە كە بە ستەمەوە لە حەوا دەڕوانن... بە داخەوەم بۆ ئەم پەیڤە ئەوان وا سەیری ئافرەت دەكەن كە گوایە لە ڕەگەزی مرۆڤ نی یە، یان پایە و پلەی زۆر كەمترە لە پلە و پایەی پیاوان... هەندێ كەس وا دەزانن كە ئەو بۆتە مایەی ئەوەی كە ئادەم سەرپێچی بكات... وە ئەو هۆی دابەزینی ئادەم بۆ سەر زەوی و لەخواردنی بەری دارەكە بووە، بەڵام ڕاستی یەكەی ئەوەیە كە قورئان هیچێكی لەم بارەیەوە نەووتوە... بەڵام هەردوكیانی لەهەمان پلە و پایە و بەرپرسیارێتیدا داناوە و ئەم ئایەتەش بخوێنەوە بۆ زیاتر دڵنیابووت: ﴿ فَوَسْوَسَ لَهُمَا ٱلشَّيْطَٰنُ لِيُبْدِيَ لَهُمَا مَا وُۥرِيَ عَنْهُمَا مِن سَوْءَٰتِهِمَا وَقَالَ مَا نَهَىٰكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةِ إِلَّآ أَن تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنَ ٱلْخَٰلِدِينَ﴾ الاعراف: ٢٠.

ئایەتەكانی قورئان باس لەوە ناكەن كە ئیبلیس تەنها بەحەوا پێبكەنیبێ، یـان فریـوی دابێت بەڵكو ئەو هەردوكیانی فریو داوە و لە خشتەی بردون و پێكەوە دڵـە ڕاوكێـی پـێ كردوون، بەرپرسیارێتی یەكە هاوبەشە، هەردوكیان لەبەری دارەكەیان خـواردوو دابەزینـە سەر زەوی...

(الاثر)و چیرۆكە پێشوەكان باس لەوە دەكەن كە ئادەم لە هندستان و حـەوا لـە شـاری (جدە)ی سعودیە كەوتونەتە سەر زەوی, ڕەنگە هـەر بـەو هۆیـەوە نـاوی ئـەو شـارە بـەو هۆیەوە ناوزەد كرابێ واتە: (داپیرە)گەورەی نەوەكانی ئادەم...

دەڵێن ئـادەم بـەردەوام گـەڕاوە بـە دوای حـەوا دا تـا لـە كێـوی عـەرەفات بەیـەك گەیشتوون، ئەگەر سەرنج بدەن عەرەفات زۆر لەشاری جدەوە نزیكە و زۆریـش لـە وڵاتـی

هندستانەوە دورە، کەواتە ئەوە ئادەمە کە زۆر ماندو بوە و بەدوای حەوادا گەڕاوە هەتا پێی گەیشتووە! ڕاستی یەکەی ئەوەیە کە لە کتێبی ڕاڤە کارانی قورئاندا پەیڤی زۆر جوان بەدی دەکەیت، ئەم بابەتە هێوری و ئارامی تێدایە نەك ئەوەی کە هەندێ کەس گرژی و ئاڵۆزی تێدا بەدی دەکەن... قورتوبی لە تەفسیرەکەیدا دەفەرموێ فریشتەکان پرسیان لە ئادەم: ئایا حەوات خۆش دەوێ؟ ئەویش ووتی بەڵێ، پاشان بە حەوایان ووت ؟ ئایا ئادەمت خۆش دەوێت ؟ ئەویش ووتی: نەخێر... بەڵام خۆشەویستی لە ناخی حەوادا زۆر زیاتر بوو لەو خۆشەویستیەی لە ناخی ئادەم دا هەبوو. وە من ئەم چیرۆکە دەگێڕمەوە هەتا ئێمە بڵێین ئەم غەریزەیە هەر لەسەرەتای خوڵقانی ئادەم و حەواوە هەبووە.

لە فەرمودەیەکدا هاتووە، کە (حەوا لە پەراسوی ئادەم خوڵقاوە) پرسیار ئەوەیە کە بۆچی کاتێ خوڵقا ئادەم نوستبوو، ئەی بۆچی کاتێ نەخوڵقا کە ئادەم بێدار بێت ؟... هەتا ئادەم هەست بە ئازاری خوڵقانی حەوا نەکات، وەك ئەوە وایە ئادەم لە ژێر کاریگەری بەنجدا بێت بۆ نمونە لەگەڵ ئەوەدا کاتێ کە ئافرەت منداڵی دەبێت ئەوە لەو کاتەدا بێدارە... دەڵێن لەبەرئەوەی سۆزی حەوا زۆر لە سۆزی ئادەم بەهێزتر بووە، ئەم لەم کارە دڵتەنگ نەبووە و هیچ بایەخێکیشی بە ئازارەکەی نەداوە، لە کاتێکدا ئادەم بەرگەی ئەوەی نەگرتوە کە ئەم کارە بەو شێوەیە کۆتایی پێ بێت.

من چەند بیرۆکەو مانایەك پێشنیار دەکەم تا لە ڕوانگەیەوە بگەینە بۆچوونی ئیسلام بۆ ئافرەتان.

لەو بیرۆکانە ئەوەیە کە ئادەم لە خۆڵ دروست کراوە، بەڵام حەوا لە پەراسو واتە لە شتێکی زیندوو، لەبەرئەوە دەبینین کە ئادەم کاتێ مامەڵە لە دونیادا دەکات ئەگەر چی بازرگانی، یان پیشەکار، یان جەنگاوەر، یان جوتیار بێت ئەوا مامەڵە و هەڵس و کەوت لەگەڵ ئەو مادەیەدا کە لێی خوڵقاوە، ئەو هەڵس و کەوت لەگەڵ زەویدا دەکات، بەڵام حەوا هەڵس و کەوت لەگەڵ ڕوحدا دەکات، لەگەڵ مرۆڤدا ئەو کاری پەروەردەیەو دەبێتە دایك، یان خوشك، یان خێزان وە، یان کیژێك، بەڕاستی مامەڵە لەگەڵ شتێکی زیندودا دەکات هەربۆیەش ناونراوە (حەوا) لەبەرئەوەی کە لە ژیان خوڵقێنراوە.

ئەمە ئافرەتەو ئەوەش ڕۆڵیەتی وە ئێمە چەندین پەیوەندی جوان و ڕەنگینی نێوان ژن و پیاومان لە لایە پێتان چۆنە لەگەڵ دو خۆشەویستی قەشەنگدا کەمێك بژین، گەورەمان

ابراهیم پێغەمبەر و سارە خاتونی خێزانی، ئەو زۆری خۆش دەویست و بەدرێژایی ٨٠ ساڵ لەگەڵیدا ژیا و منداڵی لێ نەدەبوو، بەڵام لە پێناوی خۆشەویستی یەکەیدا نەیدەویست هەرگیز ژنی بەسەردا بهێنێ بەجۆرێ ئەو لەگەڵ هاجەرە خاتونی دایکی ئیسماعیل خێزانی پێکەوە نەنا هەتا سارە خاتون داوای ئەوەی لێ کرد و سور بوو لەسەر ئەوەی خێزان پێکەوە بنێ هەتا نەوە لە دوای خۆی بخاتەوە.

ئایا دەکرێ خۆشەویستی بگاتە ئەم ڕادەیە ؟ ٨٠ ساڵ و ئەو نایەوێ هەستی خێزانەکەی بریندار بکات، پاشان دوای ئەوەی کە هاجەرە خاتون خێزانی پێکەوە ناو منداڵی بوو، سارە چاوی چو بە قوڵا ( ئەمە سروشتی ئافرەتە)و نەیدەویست لەگەڵ هاجەرە لەیەك شوێندا بژی ئیبراهیم (علیه السلام) بەمە ڕازی بوو، دەستی هاجەرەو کۆرپەکەی گرت و بەمەبەستی ڕازی کردنی سارەی خۆشەویستی بردنی بۆ جێگایەکی دور ئایا ڕاتان چی یە بەرامبەر ئەم پەیوەند یە سۆزداری یە بەرزە؟

خۆشەویستی هەر خۆشەویستی یە، خوازراو و قەشەنگە، بەڵام... کام خۆشەویسی ؟ ئەمەیە کە ئێمە دەمانەوێ پێی بگەین.

گوێ لە چیرۆکی بەسەرهاتی عەمری کوڕی عاص بگرن... کاتێ هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) لە دەستەیەك بوو بەناوی (ذات السلاسل)و پێغەمبەر(ﷺ) تیایدا بەسەرکەوتویی گەڕابویەوە، عەمر ویستی لە دڵی پێغەمبەر(ﷺ)دا شوێنی بێتەوە، عەمر پێی ووت: کێ خۆشەویسترین کەسە لە تۆوە ؟ عەزرەت پێی فەرموو: (عائیشە).

ئایا هەرگیز ڕێککەوتوە لە کەسێك بپرسیت خۆشەویسترین کەست کێ یەو و بڵی خێزانەکەم! من تەحەدای ئەوە دەکەم کە ڕۆژنامەیەك بکەینەوە و ژیانی گەورەیەك بخوێنینەوە و زۆرترین کەسێك لە دونیادا خۆشی بوێت خێزانەکەی بێت، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ)زۆر بە ئاسانی ئەوەی فەرموو وە بەناوی خێزانەکەشیەوە فەرمووی...

هەروەها خۆشەویستی عومەری کوڕی خەتاب بۆ خێزانەکەی ,یەکێك لە یاران زۆر دڵتەنگ دەبێت بەهۆی خێزانەکەیوە، چونکە دەنگی بەسەردا بەرز دەکاتەوە، ئێوەش خۆتان دەزانن کە لە نێو ئافرەتاندا هەیە کە هەمیشە گەروی هاوارکردنیان بلندە، ئەم هاوەڵە دەڕوات سکاڵای خۆی لای ئەمیری ئیماندارانی عومەری کوڕی خەتاب بکات

ڕۆیشت تا لە دەرگا بدات، بینی کە دەنگی خێزانەکەی عومەر لەسەری دەنگی عومەرەوە یەو دەگاتە کۆڵان ئەو بێ ئومێد بوو وە ڕۆیشت، ئەم هاوەڵە کاتێ کەویستی بڕوات عومەر(ﷺ) هاتە بەردەرگا و فەرمووی: لەوە دەچێت بۆ لای من هاتبی، ئەویش ووتی: بەڵێ هاتم سکاڵای دەنگی خێزانەکەم بکەم، بەڵام دیتم لای تۆش هەروەهایە... سەیری وەڵامی عومەر و سۆزی بکە، کە دەفەرموێ: (ئەو بەرگەی منی گرتوە و جلو بەرگەکانم دەشوات و پێخەفم ساز دەکات و منداڵەکانم پەروەردە دەکات و ماڵەکەم خاوێن دەکاتەوە، هەموو ئەم کارانە دەکات و خوای گەورەش بەمە فەرمانی پێ نەکردوە، بەڵکو ئەو بە ئارەزوی خۆی هەموو ئەمانە دەکات و بەرگەیان دەگرێت، ئایا من بەرگەی ئەوە نەگرم کە دەنگم بەسەردا بەرز بکاتەوە) ئەمە خۆشەویستی و هەست و سۆزە.

## هاوڕێیەتی نێوان کوڕان و کچان

پەیوەندی هاوڕێیەتی وەك ئەوەی کە کوڕان و کچان ناوی لێ دەنێن و چی لەسەر ڕێکدەخەن کامە گرفت و بەرهەمەکانیەتی ؟ وەرن پێکەوە پاش ئەوەی زانیمان خۆشەویستی بنەمایەکە و گرفتی تێدا نی یە با ئەو پەیوەندی یانە ببینین، ئەمە لە ڕوانگەی ئیسلامەوە دیدێکی زۆر بەرێزی هەیە: کوڕو کچ دەکرێ هەست بە هەندێ سۆز بکەن، پاشان هەست دەکەن بەوەی کە هەڵەیان کردوە و هەوڵدەدەن کە هەڵەکانیان ڕاست بکەنەوە، بەڵام بەداخەوە ئەم هەڵەیە بە ڕێگەیەکی هەڵە و بە هەڵەیەکی دیکە چارەسە دەکەن کە بریتی یە لە پێکەوە نانی خێزان بەڕێگەیەکی لاوەکی... ئەوەی کە پێ ی دەڵێن: ( زەواجی عورفی)، کە کوڕ و کچ گرێبەستی هاوسەرێتی ئەنجام بدەن بێ ئەوەی کەس و کاریان ئاگادار بێت...

بەڕاستی ئەمە ڕێگەیەکی زۆر نامۆیە... لاوێك دەبینێ کە هەڵەی کردوە دەیەوێ چارەسەری ئەو هەڵەیە بە هەڵەیەکی دیکە بکات، چونکە توانای دارایی و تەواوی تواناکانی و سروشتی کۆمەڵگەکەی ڕێگە بەم جۆرە هاوسەرگیری یەی نادات کە ئەو هێشتا هەر لە زانکۆدایە، ئەو بەشێوەیەکی لاوەکی خێزان پێکەوە دەنێ، بەڵام ئایا ئاکامی ئەم هاوسەرگیری یە چی یە ؟ گرفتەکە ئەوەیە کە ئەم لاوە پاش دو، یان سێ مانگ لە کاری هاوسەر گیری یەکەی واز لەم ئافرەتە دێنێ ئەویش نەك لەبەرئەوەی کە

ئەم لاوە خراپە، یان ڕقی لە هاوسەرەکەیەتی، بەڵکو لەبەرئەوەی کە هەست دەکات کە لە دۆخێکی ئاسایدا نی یە و ناتوانێ ڕوبەڕوی کەس و کاری بێتەوە بەوەی کە کردویەتی... ناشتوانێ بەکەس و کارەکەی بناسێنی، چونکە هەست بەوە دەکات، کە (سوکە)و لە ئاستێکی کەمتری کەس و کاریدایە وە بەرگەی ئەو بیرۆکەیە ناگرێ کە ئەمە خێزانیەتی لەبەرئەوە هەوڵ دەدات کە لە دەستی هەڵبێ... وە ئەمەش بەسەر هاتێك نی یە کە چنراوی ئەفسانە بێت بەڵکو ئەمە ڕۆژانە ڕوو دەدات... کیژیش خۆی لە گرفتێکی وادا دەبینێتەوە کە چۆن ڕوبەڕوی کەس و کاری بێتەوە چی بکات و چۆن دەژی بۆیە دوچاری خەم و پەژارە دەبێت ئەو تەنها دو هەفتە بەختەوە بووە و داهاتو ی خۆی بەتەواوی وێران کردوە وە تەنانەت لە هاوسەرگیری سروشتیشدا، بەکارهێنانی دەسەواژەی خراپ بۆ وشەی خۆشەویستی دەبێتە مایەی کارەساتی زۆر گەورە، دڵنیام کە هەمووومان چەندین نمونەی زۆرمان لە ڕۆژگارێکدا دیوە کە باسی وتو وێژی کۆمەڵگایە لە دەوروبەریاندا، ئەی چۆن دەکرێ کە ئەوان یەکتریان خۆش بوێ وەیان چۆن لە قۆناغی ئامادەیدا پەیوەندیان بەیەکەوە هەبووە وە، یان چۆن و چۆن... ؟ بەلاّم پاش هاوسەرگیری هەموو شتێ بە جیابونەوە کۆتایی پێ دێ، دیارە ئەمەش تەنها حاڵەتێك نی یە و بەڵکو زۆر زۆرە.

لە لاوێك دەپرسم پێم دەڵێت: لە چاو ڕابردوودا زۆر گۆڕاوە، کچەش دەڵێت: بۆتە مرۆڤێکی زۆر جیاواز تر لە جاران، ئەو بە جارێ گۆڕاوە!!

لەماوەی پێش هاوسەرگیری یە کە هەریەکە وا خۆی دەردەخات کە لەوی دی چاترە، بەلاّم کاتێ بەیەك دەگەن هەردو لا شتی دیکە بەدی دەکەن لەوانەی کە پێشتر نەیدیوە و کارەکان وەك پێشتر نەڕازێنراونەتەوە گەر پێشتر یەکیدمان نەناسیبا ئەوا دەستمان دەکردە گونجان و ڕێك و پێك کردنی بارو دۆخی خۆمان لەسەر ئەوەی کە دەیزانین لە هاوەڵی ژیانمان، بەلاّم هەریەکێك لە ئێمە لەسە شێوازێکی دیاری کراو خوی گرتووە وە زۆر ئەستەمە کەلەسەر شتێکی دیکە ڕابێت.

## کەم و کورتی یەکانی ئەم هاوڕێیەتی یە

لە کەم و کورتی یەکانی ئەم هاوەڵی یە ئەوەیە کە مرۆڤ دەبێتە هاوڕێی زیاتر لە کەسێك و لە ڕەگەزێکی دیکە پێش پێکەوە نانی خێزان، ئەمەش شێوازێکی ناڕازی بوونی

لاوان لای خێزانەکانیان دەخولقێنێ لە سەرەتای ناکۆکی یەکەدا دەڵێت هاوڕێکەم چاکترە ئەو گوێم بۆ دەگرێ و بەپەرۆشە بۆم... و چەند شتێکی دیکە هەروەها کچەش بەهەمان شێوە.

ئەم گرفتە بەزۆری ڕوودەدات بەتایبەتی لە نێو بیرو هۆشی مرۆڤدا ئەو لاوەی کە خاوەنی ٥ تا ٦ هاوڕێی کچە هەڵسەنگاندن دەکات و دەڵێت: خێزانەکەم چاك و نایابە،، بەڵام کاتێ کە لە خەو هەڵدەستێ پرچی پەرش و بڵاو و تێکچووە و کچانی دیکەش دەبینێ لە تەواوی خۆ ڕازاندنەوەیاندان، ئەو تەنها یەك، یان دوو کات ژمێر دەیان بینێ و ئەوانیش لە تەواوی ئامادە باشیدان. بەڵام خێزانەکەی٢٤ کات ژمێر لە ڕۆژێکدا دەبینێ و بەراورد دەکات و لە ژیاندا ماندو دەبێت، هەروەها کچەش بەهەمان شێوە دەڵێت پیاوەکەم زۆر باش و بەڕێزە، بەڵام تۆ (هاوەڵێ) لاوێك دەکەیت بەشان و شەوکەت و هێز وبازوە و جوانترە، ئەم کوڕە دێت و بە ئامادەیی و لێهاتویەکی تەواوەوە دێت بۆ دیتنی خۆی ڕازاندۆتەوە و جل و بەرگی نوێی لەبەر کردووە، بەڵام هاوسەرەکەی کە ماندوە و هیلاك بووە لە کارکرن لە پێناو بەدەست کەوتنی ژیانێکی بەڕێز بۆ خێزانەکەی.

شەیتان دەڕواتە نێو گرفتەکەی واتە پێش کاری هاوسەرگیری پەیوەندی نێوانیان حەرام بووە، بەڵام شەیتان ئەو پەیوەندی یە دەڕازێنێتەوە و بۆیان سازی دەکات و ئەوانیش وا هەست دەکەن کە ئەمە کەش و هەوایەکی بەچێژە کە ئەوانی تێدایە، هەروەها ژیان پاش کاری هاوسەرگیری پڕیەتی لە خۆشەویستی و هەست و سۆز و ئەمەش زۆر سروشتی یە شەیتان لێرە دا نیگەرانە و دەست دەکا بە شێواندنی کارەکە، لەبەر ئەوەی کە حەز لە ماڵێك دەکات کە ئاژاوە و گێرە شێوێنی تێدا بێت، ئەوە وا دەکات لە هەردوولا کە گلەیی و گازندە و کۆمەڵە شتێك بکەن کە پێشتر بایەخیان پێ نەداوە.

## کەم و کوڕیەکانی ئەم جۆرە هاوڕێیەتی یە

ئەو زیانانەی، کە لەم جۆرە پەیوەندی یەدا لە کچ دەکەوێ زۆرن سادەترینیان ئەوەیە، کە کچ هەست بەوە دەکات کە سوکایەتی پێ کراوە و بۆ مەبەستێك بەکارهێنراوە و وەك زێڕ بە پاکی نایەتە هەژمار، ئەو لە ماڵی کەس و کارەکەیدا زۆر بەناز بووە، لەبەر ئەوەی کە هاوەڵێکی دیکە دەگرێت و لە ماڵی کەس و کارەکەی و بەتایبەتی باوکی دور

دەكەوێتەوە... و بەدرۆ سەبارەت بەوان دەدوێ و ڕو بەڕوی چەند كێشەیەك دەبێتەوە لەماڵ و وا هەست دەكات كە بەتەنیا ڕوبەڕوی ئەم دونیایە دەبێتەوە، چونكە ئەم خۆشەویستی یە دڵتەنگی و تاریكی و ڕەشی لەدڵدا دەچێنێ... لە ڕاستیدا دەمەوێ زیانەكانی كچ لەم پەیوەندی یەدا لە چەند وشەیەكی سادەدا كۆ بكەمەوە.

ئایا ئیسلام كە ئەم جۆرە پەیوەندی یە قەدەغە دەكات ئایا ئەیەوێ تەنگە لانی لەسەر مرۆڤەكان دروست بكات، یان ئەمە بەرژەوەندی گشتی تێدایە؟

پاشان ڕێژەی ٩٥٪ ی ئەم پەیوەندی یە بەكاری هاوسەگیری كۆتایی پێ نایەت، كەواتە دڵی كچەكە دەشكی و ئازاری پێ دەگات، كە كوڕەكە دوچاری ئەشكەنجە و ئازار و خەم و پەژارە بێت بە كۆتایی هاتنی ئەم پەیوەندی یە ئەی دەبێ حاڵی كچە چی بێت؟

## ئیسلام و هاوڕێیەتی

ئایا لە ئیسلامدا شتێك وتراوە دەربارەی ئەوەی، كە ئەم پەیوەندی یە حەرامە؟ بەڵێ، لە سورەی نساء دا ئایەتێك دەربارەی ئافرەتان دەفەرموێ: ﴿وَلَا مُتَّخِذَاتِ أَخْدَانٍ﴾ النساء: ٢٥

واتە: دروست نی یە كە ئافرەت دۆستێ، یان هاوڕێ یەكی هەبێت... چونكە سروشتی كچ و نەفسیەتی وەهایە گەر سەرنەكەوت لەم پەیوەندی یەدا ئەوا شكست دێنێ و هەست دەكات كە سوكایەتی پێ كراوە و تێكشكاوە و دوور لە كەس و كارەكەی.

ئەو كچەی درۆ لەگەڵ كەس و كارەكەیدا دەكات ئەوا خیانەت لە باوك و دایكی دەكات كاتێ كە لاوێك بەبێ ئاگاداری ئەوان دەناسێ.

ئەو باوكەی خۆی ماندوو دەكات تا خەرجیت بكێشێ ئایا ڕەوایە كە تۆ بەم ڕێگەیە لەگەڵیدا ڕەفتار بكەیت و لە پشتەوە بۆ نمونە كەسێك لە تەلەفۆندا بێنیە نێو ماڵ ؟ پرسیار بۆ كچە ئەمەیە، گەر باوكت لە تەلەفۆنێكی دیكەوە گوێ بگرێ لەوەی كە تۆ هەتا سێ شەو جۆرە قسەیەكی حەرام لەگەڵ گەنجێكدا دەكەیت... ئایا چی ڕودەدات ؟ بە دڵنیایی یەوە ڕوخانێ... بەدڵنیایی یەوە هەرگیز ناتوانی سەیری چاوەكانی باوكت بكەیت

پێت چۆنە گەر خوای گەورە بەم شێوەیە لە تۆ بە ئاگا بێت؟ ئەمە بێنە پێش چاوی خـۆت !! کوا شەرم کردن لە پەروەردگاری مەزن لە کاتێکدا کە تۆ ئەو قسانە دەکەیت و دەزانـی خوای گەورە گوێی لێ یە ئایا هەست بەچی دەکەیت، لە ڕاستیدا ئافرەت کە دەچێتە نێـو ئەم جۆرە پەیوەندی یەوە بەشێکی زۆری شەرمنی لەدەست دەدات و خۆی لـە ئەنجامـدانی چەند شتێکدا بەدی دەکات کە هەرگیز بە بیریدا نەدەهات کە ئەنجامی بدات.

لاوەکە و کچەش ماوەی دوو تا سێساڵ هەست بە کامەرانی دەکەن و پاش ئەوە بە درێژایی تەمەنیان دڵتەنگن، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَيْسَ ٱلْبِرُّ بِأَن تَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِن ظُهُورِهَا وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنِ ٱتَّقَىٰ ۗ وَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَٰبِهَا ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ البقرة: ١٨٩. بەڵام واتەی ئەو قسەی پێشوو ئەوەیە کە پەیوەندی نێوان ژن و پیاو هیچ سودێکی نی یە؟، یان ناکرێ کە چی دی لەگەڵ یەك بدوێن، یان هەر پیاوێك ئافرەتێکی دیت پەنا بەخودا بگرێت، یان ئافرەتێك کە پیاوێ دەبینێ ڕاستەوخۆ لە لایەکی دیکەوە بڕوات؟!، یان لێرەدا جۆرە پەیوەندی یەك هەیە؟

## سنوری ئەم پەیوەندی یە

لەو بڕوایەدام باشترین پەیوەندی پەیوەندی برایانەیە، ڕاسـتە کـە لێـرەدا مامەڵەیـەك هەیە، بەڵام لە سنورێکی سادەدا کە نابێتە مایەی گرفتی وێران کەر... و خوداش پەسـت مەکە پێویستە تۆ لە سنوری هاوەڵی یەکی ڕێگە پێ دراو دا بیت بۆ نمونە لە کۆلێژەکەت، هاوەڵێکم لەسەر کار، ئیمزایەکم لەسەر وەرەقەیەك بۆ دەکات بـەبێ ئـەوەی کـەس پێـی بڵێم: (تۆ چی دەکەیت)؟ تەنانەت نە بەیانی باشێکیش، هەتا شـورای نێوانیـان وردە وردە نەڕوخێ و ئەمەش هەر سبەینێ ڕو دەدات: تۆ چۆنی و، پاشان پێکەوە دەچینە دەرێ.

دەکرێ ئێمە بڵێین، مادام پێویسی یەکی سروشتی بۆ ئەم پەیوەندی یە هەیە ئـەوا ئـەم پەیوەندی یە پەسەند و حەڵاڵە... واتە دۆستایەتی و هاوەڵی یە دەکرێ کـە مامەڵەیـەکی سادە لە سنوری کاردا هەبێت، بەڵام ئەم کارە پـێش ناکـەوێ کـە تـۆ بڵێـی بابەتـەنها و پێکەوە بچینە دەرێ، چونکە هەندی کەس کە هاوسەریان هەیە هاوڕێ کانیـان ئـافرەتن و لەماڵی خۆیاندان و پەرەسەندنێکی خراپ لـەو پەیوەنـدی یـە دا ڕودەدات و هەڕەشـە لـە سروشتی نێو ماڵەکان دەکات و دەرونەکان خراپ دەکات.

## سنوری ئەم پەیوەندی یە لە قورئاندا

وەرن با لە چوار چێوەیەکی ناسکدا بەسەرهاتێك بناسین، کە باس لە پەیوەندی نێوان ژن و پیاوێك دەکات، پیاوەکە پێغەمبەر موسی(عليه السلام) و کچەکەش کچی شوعەیبە، ئەم چیرۆکە لە قورئاندا باسی هاتووە، کە بەم شێوەیە یە کاتێ، کە موسی میسری بەجێ هێشت و بەرەو مەدیەن بەڕێ کەوت، زۆر ماندوو بوو چاوی بە بیرێك کەوت کە کۆمەڵە پیاوێك مەڕ و ماڵاتەکەیان لێ ئاو دەدا و دوو کچیش وەستاون و مەڕو ماڵاتەکەیان ئاو نادەن، موسی کە پێغەمبەرێك بوو چویە لایان و لێ ی پرسین: چیتانە؟ لە دوو وشەی سادەدا ئەوانیش بە ئاسانی وەڵامیان دایەوە ووتیان: ( لا نسقي حتى يصدر الرعاء) واتە ئێمە ناتوانین ئاژەڵەکانمان ئاو بدەیت وە ئەگەر باوکمان پیاوێکی گەورەی پیر نەبوایە نە دەکەوتینە ئەم هەڵوێستەوە، موسی بە شێوەیەکی زۆر لەسەر خۆ مەڕەکانی ئاودان و پاش ئەوەی کە لێ بویەوە وازی لێهێنان و بەرەو سێبەرێ کەوتە ڕێ، ئەم دو کچە گەڕانەوە لای باوکیان و بەسەرهاتەکەیان بۆ گێڕایەوە و باوکەش داوای لە کچەکانی کرد کە بڕۆن ئەو لاوەی بۆ بانگ بکەن.

یەکێك لە کچەکان، کە زۆر شەرمن بوو بە شەرمەوە ڕۆیشت و بە موسی ی ووت: (باوکم بانگ دەکات) یانی من نا بەڵکو باوکم بانگت دەکات بە باوك دەستی کرد بە قسەکردن نەك بەوەی، کە (وەرە بۆماڵمان) ئەمە کچە نەك ئەوەی، کە بە باوکی دەڵێت، کە دەمەوێ شو بکەم بە فلان کەس شوی پێدەکەم و بۆتان نی یە لەسەری بڕۆن... کچەکە زۆر سەرسام بوو بەو لاوە و ئەمەش شورەیی نی یە... باوکەش زیرەك و تێگەیشتوو بوو... داوای لە موسی کرد کە یەکێك لە کچەکانی بخوازێت لەبەرئەوەی کە ئەو لە کچەکانیەوە نزیکەو لێیان تێدەگات، ئەمە نمونەی پەیوەندی یە کە لە چوار چێوەیەکی بەرز و بەڕێزدا.

پرسیار ئەمەیە: کچ چۆن ڕەفتاری لاوێك دەزانی بەمەرجی کە پێشتر نەیناسیوە، ئایا ئەمە لە ماوەی دەست گیرانداریدا دەبێت ؟

بەڵێ ماوەی دەست گیرانداری... یەکتر ناسین تیایدا و لەم ساتەی کە ئێمەی تێدا دەژی خوازراوە، چونکە خەڵکی وای لێهاتووە کە بە پێی پێویست یەکتری نەناسن وە پێویستە ماوەی دەست گیرانداری ماوەیەکی پێویست بێت بۆ حوکمدان لەسەر ئەو کەسە، چیرۆکی زیادە ڕۆیی دەستگیرانداری هەڵدەگرین بۆ کاتێکی دیکە و ئەم چیرۆکە لەسەر زاری خاوەنەکەی دەخوێنینەوە کە خۆی بۆمان دەگێڕێتەوە...

# چەند چیرۆکێکی ڕاستەقینە

## خۆشەویستی بە خراپە و تاوان

من کچە خوێندکارێکم... بە درێژایی تەمەنم پابەند و باوەڕدار بووم، بەڵام بە داخەوە نەمتوانیوە کە حیجاب بپۆشم، لەگەڵ بوونی گرفتێکی زۆری خێزانی لە ماڵەکەماندا، بەڵام من هەر سور بوم لەسەر پابەندی خۆم بە پەرستنی خوداوە ... هەمیشە لە نێوان من و، خودا دۆستایەتی هەبووە...، بەڵام کاتێ کە تێکەڵی کەسانێکی بێ باوەڕم کرد خەریك بوو پێشیان دەکەوتم، کاتێ کە چوومە قۆناغی کۆلێژەوە گرفتەکە زیاتر قورس بوو لەسەرم لەبەرئەوەی دۆخەکە زۆر تێکەڵ تر بوو، من لەگەڵ لاواندا زۆر بەشێوەیەکی ئاسایی هەڵس و کەوتم دەکرد هەتا ئەم هەڵس و کەوتە گۆڕا بۆ هاتنەکایەی پەیوەندی یەکی تایبەت لەگەڵ یەکێکیاندا و وەك شتێکی باو دەستمان کردە هاوەڵی کردن، پاشان لەسەر ئەوە دواین کە لەم کارەدا هەستێك ی تایبەت هەیە زیاترە لە هاوەڵی، هەردولا ڕێککەوتین لەسەر ئەوەی کە لە شتە حەرامەکان دور بکەوینەوە و پابەند بین بە خۆشەویستی یەکی پاك و بێ گەردەوە... پاشان لە تەلەفۆن دەستی کردە پەیوەندی کردن، چونکە ئەو نەیدەتوانی لێم دور بکەوێتەوە و دوای ئەوەی کە پێشتر ڕەفزم کردبۆوە، بەڵام دواتر دەستم کردە دوان لەگەڵی هەموو جارێ چونە دەری کەس و کارم دەقۆستەوە و قسەم لەگەڵ دەکرد و ئەگەر یەکێك لە کەسەکانم بهاتایە ژوری وای دەزانی کە یەکێك لە هاوەڵە کچەکانمە من بە تەواوی وەك دزێك، یان تاوانبارێکم لێهات کە بیەوێ تاوانەکەی بشارێتەوە بەم شێوەیە بابەتەکان پێش کەوتنیان بە خۆیانەوە بینی و من لەگەڵ

کۆمەڵێکدا لەگەڵی دەچومە دەرێ و، پاشان لەگەڵ یەکدی لەوان جیا دەبوینەوە و دۆخەکە شێوە حەرامی یەکی لە خۆی دەگرت و، پاشان دەستمان دەکردە ئەنجام دانی خراپەکاری و تاوان...

من بە نوێژەکانم و باوەڕداری کۆنی خۆمەوە لە خۆبایی بو بووم وە پەروەدەکەم ڕێگری دەکرد لە هەڵخلیسکان و وام دەزانی کەشەیتان لێمەوە دورە... هەرگیز دوچاری دڵە ڕاوکێم ناکات، پاشان بەهۆی چەند کێشەیەکەوە کە لە نێوانماندا ڕویدا ئەو لاوە وازی لێ هێنام، بەڕاستی ئەمە زۆر کۆسپێکی گەروە بوو بۆ من، چونکە پاش ئەوەی کە لێم گەڕا وام دەزانی کەسێك نادۆزمەوە کە خۆشم بوێت ئەو هەمیشە یاری بەوە دەکرد کە من ئەوم خۆش ناوێ ئەگەر خۆشم بوێ هەرچی بوێت بۆی جێ بەجێ دەکەم، چۆن ئەو دەتوانێ کە هەستی خۆشەویستی خۆی لە بەرامبەر من دەربڕی، ئەم دەربڕینەش لە ڕای ئەودا دەگاتە نیمچە پەیوەندی یەکی خێزانی ئەم پەستان و فشارە چەند کارێکی زۆر حەرامی هێنایە کایە، من کاتێ کە دەگەڕامەوە ماڵەوە دەترسام لە خەوتن، گەر گیانم بکێشرێ چۆن ڕووبەڕووی ببمەوە؟ من هیچ ئامادە باشی یەکم بۆ مردن نەبوو بە جۆرێ من هەمیشە لە حاڵەتی جاڕس بونێکی هەمیشەیی ناسروشتیدا بووم.

ڕۆژێك زانیم، کە بەشداری وانەیەکی ئاینی دەکات وتم دەچم بۆ ئەوێ و دەمزانی، کە ژمارەیەکی زۆر لە کوڕان و کچانی لێ یە، من گومانم وا بوو کە لای مامۆستاکە سکاڵای لێ دەکەم و پێی دەڵێم پێی بڵێ بگەڕێتەوە بۆ لام، چونکە من پێشتر ئامادەی ئەم وانانە نەبووم... و لەبەردەم مامۆستاشدا بەڵێن بدەین کە هەرگیز هەڵە نەکەین.

بەڵام ڕۆیشتم و کارەکەم بەشێوەکی زۆر جیاواز تر بینی، وانەبێژ سەبارەت بەهەستی ئیماندار لەبەرامبەر پەروەردگار دەدوا کە دەکرێ چۆن ببێ، وانەکە زۆر بەچێژ بوو من هەستم دەکرد، کە تینوم بووە و تێر ئاو بووم و لە ژیانی مندا چاڵێکی قوڵ هەبوە و ئەو ڕۆژە پڕ بۆتەوە هاتمە دەرێ و دەم ویست باوەش بکەم بە هاوڕێکانمدا و ماچیان بکەم وەك ئەوەی، کە بەوێ دەست بەسەری خەڵکیدا بهێنم لە کۆڵانەکاندا و شلپ و هوڕیان لێ هەستێنم... بە جۆری نەمدەزانی کەمن چەند هەڵەیەکم کردوە خوازیاری تەوبەم... من دڵنیا بووم، کە پەروەردگار لەو تاوانانە خۆش بووە.

لەبەر ئەوەی خوای گەورە زۆر بەخشندە و بەبەزەیی یە، من ئێستا بە فەزڵی خوای گەورە قورئان فێری خەڵکی دیکە دەکەم و لەزۆربەی شتەکانمدا ڕێك و پێکم و لە خوای گەورە داواکارم کە بیکاتە مایەی هیدایەتی زۆر کەسی دیکە... من هەوڵ دەدم دەستی زۆر کەسان بگرم بۆ ئەوەی دەستی خۆم بگرم... من کۆمەڵە شتێك دەکەم کە هەرگیز بە بیرمدا نەهاتوە سوپاس بۆ خودای پەوەردگار هەست دەکەم کە من خۆم ئامادە کردوە بۆ مردن و من بەختەوەرم و لێی ناترسم وە گومانی باشم بە خودام هەیە، چونکە ئەو گومانی باشی بە بەندەکانی دەبێت.

ئەم چیرۆکە بە ئاسانی کاری ئاڵوگۆڕ کردنی خۆشەویستی یە لەگەڵ لاوێك بۆ خۆشەویستی خوای گەورە، ئەگەردەستم کردایە بە ئامۆژگاری کە کچ لەبری لاوێك دەکرێ خوای گەورەی خۆش بوێ ئەوا ئێوە پێم پێ دەکەنین، بەڵام ئێستا و پاش ئەوەی کە ئەم بەسەرهاتەمان لە زاری خاوەنەکەیەوە وەرگرت ئەتوانم ئەوە بڵێم...

پێتان چۆنە ئێمە لە سایەی خۆشەویستی خوادا بژین... هەتا کاتی هاوسەر گیری دێت، من تەحەدای ئەو کچە دەکەم کە پەیوەندی لەگەڵ خوادا تەواو بێ و بەبێ ملکەچی خودا لاوێکی خۆش بووێت... چونکە دەبێت هەست بەوە بکات کە شتێك بۆ دواوەی دەباتەوە... وەرن با ئەوە تاقی بکەینەوە کە سۆزەکانمان بۆ پەروەردگاری بالادەست کۆ بکەینەوە، ئەمە ئەو ڕاستیەیە کە مرۆڤ تیایدا هەست بەچێژی دنیا دەکات و حەسانی کوڕی پابتیش لەبارەیەوە دەفەرموێ:

| | |
|---|---|
| ببابك لن أغــادره | ولــن اسعى الى غــيرك |
| سأنسج بالرضا ثوبـي | وأشــرف اننى عبـدك |
| وأهـتف في جبين الصبح | حـين يقـال من ربــك |
| الهـي خالق الأكــوان | أشرف أننـى عـبدك |
| إلهي فالق الاصــباح | لاأسـعى الى غــيرك |

لەبیرمە جارێك لەگەل کۆمەڵێ گەنج لە شوێنێ دانیشتبوین لـێم پرسـی گـەورە تـرین نیعمەت چی یە، کە پەروەردگار بە ئێوەی داوە؟ یەکێکیان وتی دایك و بـاوکم، یـەکێکی دیکە وتی پارە و سامان و سێ یەمیان ووتی: لێبوردنی خوا لە تـاوانێکم، بـەڵام لاوێـك، کـە تەمـەنی١٧ سـاڵ بـوو ووتـی گـەورەترین نیعمـەت ئەوەیـە، کـە (خـوای گـەورە پەروەردگارمانە) واتە گەورەترین نیعمـەت ئەوەیـە، کـە ئـەو مـوڵکی خودایـە، چـونکە پەروەردگار ئەو خوایەیە، کە بەخشندەو لێبوردەیەو لێمان خـۆش دەبـێ، ئەمـەش وا لـە مرۆڤ دەکات، کە هەست بە چێژێکی زۆر بکات، ئەم نیعمەتە گەورەیەش ئـەوە، کـە ئـەم خۆشکەمان ووتی: ویستومە بە نێو شەقامەکاندا بگەڕێم و ئەمە بریتی یە لـە پەیوەنـدی خۆشەویستیت بۆ خودا و تاقی بکەرەوە، تا دەیدۆزی یەوە، گەر لە سەر ملکەچـی خـوای گەورە ڕاهاتی هەست دەکەیت، کە دڵت دەشەکێتەوە و، شادمانی و هەست دەکـەیت کـە تۆ لەنێو لەپتدا دونیات هەیە بەهۆی ئەوەی کە بووی بە موڵکی پەروەردگارمان... بـەڕێز ترین شت لە دنیادا تۆ هەتە بریتی یە لە خودا.

## ملکەچی پەروەردگارمان بوین کامەرانی و بەختەوەری و خۆشەویـستی خـەڵاتی کردین.

من هاوڕێی یەکی تایبەتیم هەبوو کە کچێکی خۆش دەویست و تەواوی یانەکە دەیـان زانی، کە پەیوەندی یەکەیان چەند بەهێزە وە ئەو کۆلێژەش، کە تیایدا بوون لەمـە بـەئاگا بوون، چونکە ئەوان وا بەستە بوو بوون پێکەوە ئەم پەیوەندی یە، یان بەردەوام بـوو هـەتا کوڕەکە ڕووی لە پابەندی و ئاینگەری کرد و بەڕاشکاوی بە کـچەکەی ووت مـن زۆر تـۆم خۆش دەوێ و ناتوانم لێت گەڕێم، بەڵام وا هەست دەکـەم کـە لـە خـودا نزیـك دەبمـەوە و ناتوانم کە دوو خۆشەویستی پێکەوە بکەم و دوو ساڵیشم ماوە تا خوێندکەم کۆتـایی پـێ بێت و پاش ئەوە إن شاو الله دێمە خوازبێنیت و دەزانم کە تۆ بـۆ مـن شـیاوی... بڕیـارم داوە بە تەواوی پەیوەندی یەکەم لەگەڵت ڕاگرم... ئەگەر خودا ویـستی کـرد ئـەوا دەبیـە خێزانم... پاشان ئەم کچە بویە خێزانی و کوڕەکەش تەواوی ئەوانەی کە وتبووی بـەجێ ی

هێناو ئێستا ٥منداڵی هەیە هەتا دەڵێت: ئەو بەردەوام خۆشی دەوێت و پەڕاوێکی نوسیوە کەمن زۆر پێی سەرسامم !! کە دەڵێت:

ملکەچی پەروەردگارمان بووین بە کامەرانی و بەختەوەری و خۆشەویستی خەڵاتی کردووین.

چیرۆکێکی نامۆی دیکە ئەوەیە کە من لە ئینگلترا بووم پیاوێکی میسری لەخوا ترسی بەتەمەن هات کەمن لە بنکەیەکی ئیسلامی ناسیم و پێی ووتم دەمەوێ دیاری یەك بکڕم بۆ خێزانەکەم ماینەوە گەڕاین بەدوای دیاری یەکی شیاودا من ماندوو بووم لەگەڵ ئەوەشدا ئەو تەمەنی٦٠ ساڵ بوو، کەچی هێشتا دەیوت: پێت چۆنە ئایا ئەمەی بەلاوە چۆن دەبێت ؟ منیش دەم ووت سوێند بەخوا نازانم... ئەو پرسیای لە هەندێ شت دەکرد کە زۆر گران بوو وە دەیوت: گرنگ نی یە من دەمەوێ ئەو کامەران بێت، کاتێ کە گەڕاینەوە بۆ میسر بە بێ دانانی کاتێکی دیاری کراو سەردانم کرد لە ڕاستیدا ئەو منی بردە ژورێ وە پێی ووتم بۆ چەند دەقیقەیەك بەجێت دێلم، لەبەرئەوەی کە ئێستا موعدی قورئان خوێندنی ڕۆژانەم هەیە لەگەڵ خێزانەکەم وە ئەمە موعیدێکە کە نابێت هەرگیز لە دەستی بدەین... چاوەڕێم بکە پاش ئەوەی کە لێ بوینەوە دەگەڕێمەوە لات...

وەرن با خۆشەویستی بگێڕینەوە بۆماڵەکانمان بەگەڕانەوە بۆلای ملکەچی پەروەردگار وەرن با واز لە گوناه بهێنین هەتا خۆشەویستی بەردەوام بێت.

## خۆشەویستی و وەفاداری

دەمەوێ بەسەرهاتەکەم بە بەچێژترین چیرۆکی مێژویی کۆتایی پێ بهێنم نە چیرۆکی لەیل و مەجنون و نە بە چیرۆکی ڕۆمیۆ و جولێت، لەبەرئەوەی ئەم چیرۆکانە بە هاوسەرگیری کۆتاییان نەهاتووە هاوسەریگری تاقیکردنەوەیەکی ڕاستەقینەیە بۆ خۆشەویستی وە خۆشەویستی ڕاستەقینە ئەو خۆشەویستی یە یە کە پاش کاری هاوسەرگیری بەردەوام دەبێت و تەنانەت ئەگەر یەکێکیشیان مردن ئەوا خۆشەویستی یە کە هەر بەردەوام دەبێت...

## بەچێژترین چیرۆکی خۆشەویستی چیرۆکی خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ)و حەزرەتی خەدیجەیە.

خۆشەویستی یەکی سەرسام هەتا خەدیجەش دەمرێ و، پاش ساڵێك لە مردنی ئافرەتێك دێتە لای پێغەمبەر(ﷺ)و پێی دەڵێت ئەی پێغەمبەری خوا ئایا ژن ناهێنی؟ تۆ حەوت منداڵ و بانگەوازێکی بەگوڕت هەیە، کە پێی هەڵدەستی، لە هاوسەرگیریدا کێشەیەکی چارەنوس ساز هەیە بۆ هەر پیاوێك، پێغەمبەر(ﷺ) دەست دەکاتە گریان و دەفەرموێ: (ئایا دوای خەدیجە کەسێکی شیاو هەیە بۆ ئەو کارە).

ئەگەر فەرمانی خوای گەورە نەهاتایە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) سەبارەت بە فرەژنی ئەوا هەرگیز ژنی نەدەهێنا، پێغەمبەر(ﷺ) وەك پیاوێك جگە لە خەدیجە هیچ ژنێکی دیکەی نە هێناوە ئەوانەی دوای ئەویش تەنها بۆ داخوازی یەکانی پەیامەکەی بوون، وە پاش ١٤ ساڵیش ئەو خێزانەی هەر لە یاد نەکردبوو... ڕۆژی فەتحی مەککە خەڵکی بەدەوریدا کۆبوونەوە و قوڕەیش هەمویان دەهاتنە لای تا داوای لێخۆش بوون و لێبوردنی لێ بکەن، لەو کاتەدا ژنێکی پیری بەساڵا چوو دەبینێ، کە لە دورەوە دێت... واز لە هەموو خەڵکەکە دێنێ... لەگەڵی دەوەستێ و دەدوێ، پاشان عاباکەی دادەگرێ و لەسەر زەوی یەکە ڕایدەخات و لەگەڵ ژنەکە دەکەوێتە گفتوگۆ عائیشە لێی دەپرسێ... ئەم ژنە کێ یە، کە حەزرەت ئەم هەموو کات و بایەخ و لێدوانەی لەگەڵ کرد؟ ئەویش دەڵێت: (ئەوە هاوەڵی خەدیجەیە) عائیشە پرسی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) باسی چیتان دەکرد؟؟ ئەویش فەرموی: (سەبارەت بە ڕۆژانی خەدیجە دەدواین) عائیشە چاوی چوو بە قولاو ووتی ئایا تۆ ئەو پیرە ژنەت لەبیرە کە خۆڵ دای ڕزاندوە خوای گەورە لەو چاکتری پێ بەخشیوی ؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی (سوێند بەخوای گەورە لەو چاکتری پێ نەبەخشیووم ئەو گرتمیە خۆی و دڵنەوایی کردم کاتێ کە خەڵکی دەریان کردم و باوەڕی پێ کردم لە کاتێکدا کە خەڵکی بەدرۆیان دەخستمەوە) عائیشە وای زانی کە حەزرەت پەست بووە بۆیە پێی ووت داوای لێ خۆش بوونم بۆ بکە ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئەویش فەرموی (داوای لێخۆش بون بۆ خەدیجە بکە تا داوای لێ خۆش بوونت بۆ بکەم).

ئایا دەكرێ كە خۆشەویستی دوای مردن بە١٤ ساڵ بەردەوام بێت؟ بەڵێ، لەبەر ئەوەی، كە پەیوەندی حەرامی لە پێشدا نەهاتووە وە لەبەر ئەوەی كە خواپەرستی لەو ماڵەدا بنەمای سەرەكی بووە، ماڵێك كە یادی خودای تێدا كراوە نەك یادی شەیتان...

ئەی لاوان پێتان چۆنە گەر ماڵەكانمان بەو شێوەیە لێ بكەین، پیاو لەگەڵ ژنەكەیدا قورئان دەخوێنێ، ئەی چەند جوانە منداڵەكان بەشدارییان لەگەڵدا بكەن، وەیان ژن پیاوەكەی بۆ نوێژی بەیانی بێدار بكاتەوە وەیان پیاو شەو نوێژ بە خێزانەكەی بكات... ئەو ماڵە چۆن دەبێت و جوانی و چێژ و خۆشەویستی تێدا چۆن دەبێت؟

تاقی بكەنەوە دەبینن كارەكان چۆن دەگۆڕێن و خۆشەویستیش زیاد دەكات و خواش پیرۆزی دەكات.

# پەیامەكانی خودا

## پەیامێكی تایبەتی

خوای گەورە چی لە مرۆڤ دەوێت؟ وەڵام ڕون و ئاشكرایە و پەروەردگار دەفەرمووێ:﴿وَٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيۡكُمۡ وَيُرِيدُ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلشَّهَوَٰتِ أَن تَمِيلُواْ مَيۡلًا عَظِيمًا ﴿٢٧﴾ يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُخَفِّفَ عَنكُمۡۚ وَخُلِقَ ٱلۡإِنسَٰنُ ضَعِيفًا﴾ النساء: ٢٧، ٢٨.

وەك ئەوەی كە خوای گەورە بفەرموێ: (دەمەوێ بتان بەخشم، بەزەیم پێتاندا بێتەوە ڕێنمویتان بكەم)، وەك ئەوەی كە مەبەست لە ژیان و ئامانج لە دونیا ئەوەبێت كە بەرەو ڕێگای هیدایەت پێشكەوین، وە لە پێناو ئەم ئامانجە گەورەیەدا خودای گەورە لێمان ناگەڕێ بەم شێوەیە بەڵكو هەرساتەی پەیامێكمان بۆ دەنێرێ تا ببێتە پێش ڕەومان بۆ ڕێنمونی...

ئەگەر یەكێك بپرسێت تاوانی ئەو ناموسڵمانانەی ڕۆژئاوا چی یە كە ئیسلامیان پێ نەگەیشتووە؟ چۆن لەسەر ئەوە لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەكرێت؟ ئێمە دەڵێین: كە پەیامی خودایی تەنها موسڵمانان ناگرێتەوە بەڵكو تەواوی كۆمەڵگاكان دەگرێتەوە.

مرۆڤێك بەدی ناکرێت لەسەر زەویدا وە ئەگەر نا خوای گەورە کۆمەڵە پەیامێکی بۆ ناردوە کە بە ژماردن نایەت، دەی با پێکەوە ئەو پەیامە خودایی، یان بژمێرین کە بۆ رێنمونی مرۆڤایەتی هاتووە و بەم شێوەیە دەیانبینینەوە:

١- پێغەمبەران: خوای گەورە ناردونی و بەتەنها یەك پێغەمبەریش بەس نەبوو و بەڵکو چەندین پێغەمبەری ناردوە و خوای گەورەش دەفەرموێ: خوای گەورە پێغەمبەر لە دوایی پێغەمبەری ناردوە بۆ مرۆڤایەتی.﴿إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا ۚ وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ﴾ فاطر: ٢٤

٢- پەڕاوی ئاسمانی زۆر و فرە: بە چەند زمانێکی جیاواز و بۆ چەند گەلانێکی زۆر هەتا بە قورئانی پیرۆز کۆتایی هات.

٣- ئەم گەردونە زۆر فراوانە لەدەورو بەرمان: هەرکەس بەنێو ئەم گەردوونەی دەورو بەریدا بگەڕێت ئەوا چەندین سەمەرە لە دروستکراوەکانی خوای گەورە دەبینێ لەبەرئەوە زانایان دەڵێن: خوای گەورە دو پەڕاوی ناردوە بۆ مرۆڤایەتی یەکێکیان پەڕاوێکی نوسراوە کە قورئانە و ئەوی دیکەیان پەڕاوێکی سەرنج ڕاکێشە و بینراوە کە ئەم گەردونەیە، هەتا ببێتە بەڵگەیەك بۆ ئەو کەسەی کە ناخوێنێتەوە وە ئەوەی کە پێویستە لەسەری ئەوەیە کە سەیری دەور و پشتی بکات و بیر بکاتەوە.

٤- خودی مرۆڤ و خولقانی مایەی سەرسوڕمانە: ﴿وَفِيٓ أَنفُسِكُمْ ۚ أَفَلَا تُبْصِرُونَ﴾الذاريات: ٢١، سەیری خۆت بکە چۆن دەجولێ و دەمارەکانت چۆنن، کۆئەندامی هەرست چۆنە، خوێنت چۆنە کە بەنێو دەمارەکاندا تێدەپەڕێ...

زانستێکی گەورەو پڕ لە دانایی کە دەلالەت دەکاتە سەر خولقێنەر و داهێنەری پەروەردگار ئەم پەیامانە هەموویان پەیامی گەورە و سەرسوڕهێنەر و ئەمەش پەیامی گشتی یە, بەڵام خوای گەورە وەك بەزەیی یەکی بەئێمەدا هەر بەمەوە نەوەستاوە بەڵکو پەیامی تایبەتیشی بۆ ڕەوانە کردوین، هەریەك لە ئێمە نامەیەکی تایبەتی هەیە کە

تایبەتە بەخۆی و دڵی کێش دەکات و مرۆڤ بیدار دەکاتەوە، ئەو نامەیە دەیهەژێنێ، جەستەی ڕادەچڵەکێنێ، بەڵام بەداخەوە ئێمە هەمومان ناتوانین بخوێنینەوە، ئێمە هەمومان لە خودا ناگەین و گەورەترین نیعمەتەکانی خوا لەسەر مرۆڤەکان ئەوەیە وایان لێ دەکات کە تێبگەن، هەیان هەست بە دانایی پەروەردگار دەکات لەخەرجی یەکانیدا بۆ ژیانی ئەمەش وا بەستەی دەکاتەوە بە پەروەردگاریەوە و خوای گەورە هەرکەس لەبار بکات ئەوا لە بارو گونجا وی دەکات بۆ تێگەیشتن لە پەیامەکەی وە لە خراپیەکانی کاری مرۆڤ ئەوەیە، کە لێڵی و پەڵەی زۆر بێت ئەو کاتە ئەو هەست بە ئەم پەیامە ناکات و لێی تێناگات و سەمود باشترین نمونەن بۆ ئەمە: ﴿وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَاهُمْ فَٱسْتَحَبُّواْ ٱلْعَمَىٰ عَلَى ٱلْهُدَىٰ ﴾ فصلت: ١٧.

ئێمە گفتوگۆی خۆمان تایبەت دەکەین بەو پەیامە تایبەتانەی کە نهێنی بوون، وەك ئەوەی کە تۆ چاوت بەکەسێکی هەژار بکەوێت کە هیچی نەبێت بیخوات و بەدەوری پاشماوە گسکدراوەکاندا دەگەڕێ بەڵکو شتێکی تیا بدۆزێتەوە و ڕێگری برسێ تی یەکەی پێ بکات، کە سێك کە ئەوە دەبینێ دەڵێت: سوپاس بۆ خودا لەسەر ئەم ناز و نیعمەتەی کەپێی بەخشیوین... وەیان خاوەن هێز و دەسەڵات دەبینێ کە چۆن ستەم و گەورەیی خۆی دەنوێنێ هەتا خوای گەورە ئەو دەسەڵاتەی لێ وەردەگرێتەوە و بەنەبویی لێی دەگەڕێ، پاشان ئەو کەسە لەخەو بێدار دەبێتەوە و دەڵێت پشت بەکەس نابەستم من پشت بەو خودایە دەبەستم کە هەرگیز لەناو ناچێ و لاواز نابێ .

دەکرێ کە پەیامەکان زیاتر ڕوون بن، بەڵام پێویستیان بە خوێندنەوەیەکی ورد دەبێت، بۆ نمونە مردنی هاوڕێ یەك، یان کۆسپێ کە دێتە ڕێگات ئەو کاتە ئەوەت دێتەوە یاد کە تۆ چەند تاوانێکت کردوە و شایستەی لەوە زیاتری , جا خوای گەورە وەبیرت دێنێتەوە، خوای گەورە ڕات دەرگرێ و پێت دەڵێت: بۆ کوێ دەچیت، تۆ بەگوێی خۆت نایبیستی،، بەڵام لە گرفتێکدا کە لێت ڕوو دەدات لەبەر چاوت ڕون دەبێتەوە وەك نەخۆش کەوتنی کوڕەکەت، یان لە کەم و کورتی ڕزق و ڕۆزیت... جگە لە پەروەدگار تۆ کێت هەیە... جگە لە پەروەردگار کێ دەستت دەگرێ، ئەم پەیامانە پێویستی، یان بەچەند دڵێکی خاوێن و بێ گەرد هەیە تا لێی تێبگات وە لێرەشدا چەند نمونەیەك هەیە لەسەر پەیامە ڕونەکان کە پێویستە لەسەرت بیان خوێنیتەوە...

لەوانە ئەو پەیامەی کە خوای گەورە ناردی بۆ مالکی کوڕی دینار کە یەکێك بــوو لــە گەورە تابعینەکان، ئەو لەسەرەتادا خراپەکار و زۆر تاوانبار بوو، ئەو باسی خۆی دەکات و دەڵێت: تاوان نی یە مــن نــەمکردبێ و ئــەنجامم نــەدابێ مــن تەمــەنێك هــەر بــەردەوام ئەشکەنجەی خەڵکم دەدا وماڵیانم دەست بەسەردا دەگرت . هەتا ڕۆژێك لەبازاڕ پیــاوێکم دیت، کە شیرینی دەکڕی و بە فرۆشیارەکەی دەوت کەمێ زیاترم بدەرێ، چونکە سێ کــچم هەیە، پێغەمبەر(ﷺ)مزگێنی بەهەشت دەدات بەو کەسەی کە خەندە دەخاتە سەر لێــوی کیژانی بچوکەوە , دەڵێت: خۆشەویستی کچان کەوتە نێو دڵمەوە بۆیــە خوازیــار بــووم ژن بهێنم و کچم هەبێت (تۆ تێبینی ئەم پەیامە زۆر ڕوونە بکە) ئــەم پەیامــە بــۆ بــڕواداران نەهاتوە بەڵکو بۆ تاوانباران هاتووە.

دەڵێت: پەرۆشی ژن هێنانم، بەڵام لەخۆم دەپرسی کــێ ژنم پــێ دەدا لــە کاتێکــدا مــن هێندە داوێن پیسم؟ بڕێك لە خراپەکانم کەم کردەوە، پاشان هــەر بــەو شــێوەیەی کــە لــە پەروەردگارم داوام کردبوو خوای گەورە کچێکی پێ بەخشیم و ناوم لێ نــا( فاطمــة)، زۆرم خۆشدەویست بە تایبەتی کاتێ وردە وردە باوەڕم بەهێز و خراپە و داوێــن پیــسی لەدڵمــدا ڕووی لە لاوازی دەکرد هەتا کچەکەم تەمەنی بویە سێ ساڵان لەگەڵ ئــەوەی کــە مــن زۆر سەرخۆش بووم، بــەڵام مــەی خواردنــەوەم زۆر کــەم کردبویــەوە هــەتا ڕۆژێــك کــە مــەیم دەخواردەوە کچەکەم هات و پێکەکەی لەدەمم دور خــستەوە و منــیش هەســتم کــرد کــە ئەمە دەستی خودایە کە پێکەکە دوور دەخاتەوە.

پاشان کارێکی زۆر سەیر ڕویدا و کتوپڕ (فاطمة) کۆچی دوایی کرد، ئەو دەڵێت گەڕامەوە بۆ دۆخێکی خراپتر لەوەی کە لەسەری بووم نەم دەتوانی لەسەر مەی خواردن هەستم وە لە باوەڕیشمدا هیچم پێ نەبوو کە ئارامی پێ بگرم، هەتا شەوێك داهات ووتم ئەم شەو هێندە دەخۆمەوە کە هەرگیز بەو شێوە نەبوبم... هێندەم خوارد هەتا بێ هۆش کەوتم و لەخەومدا خەونێکی سەیرم دی: من وام دەزانی ڕۆژی دوایی یە و مەترسی یەکە زۆر گەورەیە، خەڵکی هەموو بەرەو لای خوای گەورە کۆ دەبنەوە و خۆر لەسەری مرۆڤەکان نزیك بۆتەوە و هەیانە ئارەق گەیشتۆتە پاژنەیی و هەیە گەیشتۆتە ئەژنۆیی و

هەیە گەیشتۆتە گەردنی و هەیە لە ئارەقی خۆیدا مەلە دەکات، پاشان بانگ کرایە مرۆڤەکان بە پێی ناوەکانیان: فلانی کوڕی فلان وەرە لەبەردەم خوای گەورەدا ئامادەبە، هەتا گوێم لە ناوی خۆم بوو بەو شێوەیە، تەواوی مرۆڤەکان لەچواردەورم نەمان و بەتەنها مامەوە و لە وێستگەی خۆنیشان دان و لێپرسینەوەدا لەم کاتەدا مارێکی گەورە هات کە دەمی کرابویەوە تا بمخوات، ڕام کردو هەڵهاتم تا پیاوێکی پیرم دیتەوە و پێم وت: ڕزگارم بکە لەو مارە ئەویش ووتی من لاوازم و ناتوانم ڕزگارت بکەم، بەڵام بەو ئاڕاسەیەدا ڕابکە بەڵکو ڕزگارت بێ زۆر ڕامکرد هەتا ئاگرێ لەبەردەمم دەرکەوت و مارەکەش بەدوامەوە بوو، من زۆر گریام و پیاوە پیرەکەم دی کە ئەویش بۆ من دەگریا، ئەو ئاماژەی پێ دام بۆ لایەکی دیکە کە چیایەك بوو وە لەسەر چیاکە چەند منداڵێکی بچوك ی لێ بوو کە مردبوون و دایك و باوکیان بەجێ هێشتبوو لە دونیا، ئەوان کچەکەمیان بانگ کرد و وتیان فاطمة وەرە ئەمە باوکتە، فاطمة هات و من ئەوم ناسی و ئەویش منی ناسیەوە و بەدەستی ڕاستی دەستی گرتم وە بەدەستی چەپ دای لەمارەکەو دوری خستەوە، ئەو هەروەك لە دونیا وابوو لەسەر کۆشم دانیشت منیش دەلەرزیم و ووتم: کچەکەم ئەو مارە گەورەیە چی بوو ؟ ئەویش ووتی ئەوە کارە خراپەکانت بوو، وە، پاشان ووتم ئەی ئەو پیاوە پیرە کێ بوو ؟ ئەویش ووتی ئەوە کردەوە چاکەکانت بوو هێندە لاوازت کردوە کە نەیوانی ڕزگارت بکات و ئەگەر مردنی من نەبوایە هەرگیز ئەمرۆ ڕزگارت نەدەبوو، پاشان بانگی کردم و ووتی ئەی باوکە﴿أَلَمۡ يَأۡنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن تَخۡشَعَ قُلُوبُهُمۡ لِذِكۡرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلۡحَقِّ﴾الحديد: ١٦.

لەخەو ڕابوم و ووتم: ئەی پەروەردگارم ئێستا کاتیەتی، ئەی پەروەردگارم ئێستا کاتیەتی، هەستام خۆم شوشت و ڕام کرد بۆ مزگەوت کە کاتی نوێژی بەیانی بوو چومە نێو مزگەوت و مامۆستام دیت کە هەمان ئایەتی دەخوێند، ئەو دەڵێت لە پەروەردگارم تێگەیشتم و زانیم کە من ئەمرۆ نەگەڕێمەوە بۆلای ئەویش لەمرۆ بەدواوە پەسەندم ناکات.

من داوا لە تەواوی ئەو کەسانە دەکەم کە پەیامێکی دیاری کراویان بۆ هاتووە با دەریببڕێت، ڕەنگە ئێمە بەو پەیامە لە پەروەردگارمان نزیك ببینەوە.

# چەند چیرۆکێکی ڕاستەقینە

ماشاء الله... لاحول ولا قوة الا بالله

ئێمە لە هاوینە هەوار دەگەڕاینەوە، چوار ئۆتۆمبێل بووین، یەکێك لە شۆفێرەکان نوست ڕاستەو خۆ وەرگەڕا، لەگەڵ ئەوەی کە ئێمە کەسمان لێ نەمرد ئەوە نەبێ کە کاتێ بێداربوینەوە زانیمان کە مرۆڤ دەکرێ لەیەك چرکەدا ژیانی کۆتایی پێ بێت من ئەو کاتە حیجابم نەدەپۆشی زۆر دوریش بووم لە قورئان خوێندنەوە، بەڵام هەر هاوارم بۆلای خودا دەبرد...

پاش پابەند بوونم بە نزیکەی ٤ ساڵ ئەوەی زۆر نیگەرانی دەکردم ئەوە بوو ئایا پەروەردگار ئەمەم لێ وەردەگرێ، یان نا ؟ ئایا ئەو لەمن ڕازی یە، یان نا ؟ شەوێك کە من خۆم بۆ نوستن ڕێکدەخست ئەم بابەتە زۆری سەرقاڵ کردم، لە خەومدا یەکێك هات و وەك ئەوەی کە پێم بڵێ: ئایا دەتەوێ بزانی کە پەروەردگارت لێت ڕازی یە، یان نا ؟ وەرە با ببینی، شتێکی زۆر گەورەم دی کەلە تەلسکۆب دەچوو کە لە ئاسمانی دەڕوانی و منیش سەیرم کرد و ئاسمانم دی کە زۆر جوان بوو ووتم: ماشاو الله، لا حول ولا قوه الا بالله، هەستام ئەم پەیڤانەم دوپات دەکردەوە زانیم وەك ئەوەی کە پەروەردگار ئاگادارم بکاتەوە کە ئەوە پەیامەکەمە و دەبێت بەردەوام بم لەسەری و تەواوی بکەم.

## پەیامێکی ڕەمەزانی پوخت:

لەڕاستیدا من خۆم پەیامێکم هەیە کە بەتەواوی پارێزگاری لێ دەکەم ئەویش ئەوەیە، کە (پاش هەر گوناهێك دەکرێ کە کارەساتێ، یان پێکدا دانێك ڕوو بدات)وە پاش گوناه چاوەڕوانی ئەو ڕوداوە دەکەم و پێش بینی دەکەم، ئەمە شتێکە کەتەنگەڵانی تێدا نی یە، چونکە إن شاء الله هەر چاکە و خێر دەبێت، هەندێ کەس گوناه دەکەن و خوای گەورە مۆڵەتیان دەدات و چاکەیان لەگەڵ دەکات ئەوانیش لەسەر ئەو تاوانە بەردەوام دەبن وا دەزانن کە شتێکی زۆر بچوکەجۆ ئەگەر گرفتێکی تێدا بوایە خوای گەورە لێیان دەپرسیەوە و لەسەر ئەوە سزایان دەدا و بۆیە لەسەر ئەو تاوانە بەردەوام دەبن، بەڵام

هەرکەسێ خوای گەورە بە پەیامێك وریای بکاتەوە لەسەر گوناهێك کە ڕویداوە ئەوە مانای وایە کە خوای گەورە دەیەوێ پێی بفەرموێت: بوەستە، من خۆم لە مانگی ڕەمەزاندا ڕێسایەك بۆ خۆم دادەنێم، لەخوای گەورە داوا کارم کە بەردەوامم بکات لەسەری تا مردن... کە بریتی یە لە پارێزگاری کردن لە نوێژەکانم لە ڕیزی یەکەم لە جەماعەتی یەکەم لەلای دەستەڕاستی پێش نوێژەوە و بەهەمو توانایەکمەوە دەمەوێ ئەمە ڕاپەڕێنم.

لە یەکێك لە ساڵەکاندا من ڕاهاتبوم کە نوێژی عەسر لە یانە بکەم و، پاشان بڕۆم بۆ خۆسەرقاڵکردن بە وەرزشەوە، ئەمە هەتا پێش نوێژی شێوان و، پاشان لەماڵەوە بەربانگ بکەمەوە، ڕۆژێك چووم بۆ یانە و گوێم لە دەنگی ئیمام بوو لە مزگەوتدا کە دەیوت: سمع الله لمن حمده بەداخەوە ڕکاتی یەکەمم لەدەست چوو، بەڵام قەیدی نی یە دەگەم بە جەماعەتی یەکمدا إن شاو الله، ئەوەم بە بیرمدا هات کە بڕۆم بۆ گرتنی شوێنی یاری لەبەر ئەوەی کە من بە ئاسانی دەگەم بە جەماعەتدا و یەکەم تەکبیرم لەدەست چووە و، پاشان یاریگاکان لە ڕەمەزاندا زۆر چڕو پڕن هەرواش بوو چووم بۆ یاریگاکە و کەل و پەلەکانم لەوێ دانا، لاوێك دیتمی، یەك وشەی پێ وتم، بیانووم هێنایەوە بۆیبۆ نوێژەکەم لەنێوەندی ئەم گفتوگۆیەدا گوێم لە ئیمامەکە بوو ووتی: (السلام علیکم و رحمة الله و برکاته... لێرەدا پەیڤێکی جوانم وەیاد هاتەوە کە یەکێك لە پیاو چاکان فەرمویەتی، سەرسامی لەوەدانی یە کە بەندەیەك ملکەچی گەورەکەی بکات، بەڵام سەرسامی یەکە لەسەردارێکەوە کە دۆستایەتی بۆ بەندەکەی بنوێنێ، خوای گەورە خۆی چەندین ئاماژەو پەیامان بۆ ڕەوانە دەکات هەتا تێبگەین و بگەڕێینەوە، وەك ئەوەی کە پێمان بڵێ: ئایا کاتی نەهاتوە بەندەکەم، کە بگەڕێیتەوە.

دڵتەنگ بوم و پەشیمان بومەوە، یەکەمین جەماعتم لە ڕەمەزاندا لەدەست چوو، ڕام کرد بۆ مزگەوت، من ڕام کرد و پێم چەرخاو بۆ ماوەی سێ هەفتە نەمتوانی ڕێ بکەم، نە یاریم ئەکرد و نەهیچی دیکە، ئەمە پەیامێکی ڕەمەزانی پوخت بوو.

## خەون دەکرێ پەیامێك بێت:

خوای گەورە دو پەیامی بۆ ناردم، بەڵام من لێیان نەگەیشتم، ئەوانیش مردنی براکەم بوو لە تەمەنی١٩ ساڵی و، پاشانیش باوکم هەر لەهەمان ساڵدا کۆچی دوایی کرد، بەڵام پەیامی کۆتایی ئەوە بوو، کە من خەونم بینی بە بارودۆخی مردن و ئەو شتانەی بۆی دەڕۆن، ئەمەش وای لێکردم، کە من مەرگ بەدی دەکەم و دڵنیا بووم لەوەی، کە هەرساتێ بیەوێ بەرەو ڕووم دێت، هەرکاتێ کە نیەتی گوناهێکم بکردایە خوای گەورە بە فەزڵو کەرەمی خۆی لە دایدەپۆشیم و لە ئەنجامدانی ئەو کارەی دور دەخستمەوە.

## گەر بمرم و بچمە بەردەم پەروەردگار... چی پێ بڵێم؟

من ناوم هیشامە... ژمێریارم... ماوەیەك پێش نزیكْ بونەوە لە پەروەردگار، لە نێو خیزانێکی ئاین پەروەر گەورە بووم، کە هەر خودایان ناسیوە، بەڵام بە داخەوە من لە وانیش و لە نوێژ کردنیش دور بووم، پێم وابێ تەنها نوێژی هەینیم دەکرد، لەماوەی ژیانی زانکۆمدا چەندین تاوانی ناشیاوم لە ژیاندا ئەنجام داوە وەك شەوخونی لە بارەکان و کێشانی مادەی بێ هۆشکەر ئێمە هەمو کارێکمان دەکرد و، لە هیچیش نەدەترساین و، ژیان بە نیسبەت ئێمەوە ئەوە بوو، کە بەشەو چی بکەین؟ بۆچ ئامانجێکی دیکە هەنگاو هەڵبگرین، ڕۆژێك دەستم کردە خواردنەوەی(بانجۆ) وەك کاری هەمیشەیان و تێر گاڵتەو گەپیان کرد و شەو تا درەنگانێ بێدار بووین... بەڵام کاتێ کە گەڕامەوە بۆ ماڵەوە هەستم دەکرد، کە هەموو دنیا لەبەرچاوم ڕەشە...

من هەستم کرد، کە فریشەی مەرگ گیانم دەکێشێ، ماڵەکە هەمووی تاریك و وام دەزانی، کە شتێك دەمخنکێنێ، پاشان پرسیارم لە خۆم کرد، کە چۆن بە دیداری خودا بگەم؟ لە کاتێکدا شوێنەواری مادەی بێ هۆشکەر لە جەستەمدایە... دەستم کردە پاڕانەوە: خوایە گەر لێم گەڕێی چی دی و لەمڕۆ بەدواوە مادی بێ هۆشکەر ناکێشم، سوپاس بۆ خودا نوستم و، پاشان هەستامەوە، من ڕۆژ بەدوای ڕۆژ لە خودا نزیك دەبوومەوە....

ڕاستە کە پەنام نەبردە لای ئەو ماددانە، بەڵام مانـەوە، تـا درەنگانـێ لـە دێـسکۆ و سەرخۆشی و مەی خواردن ئەمانە شتێك بوون، کە لێـی دانـەبڕا بـووم، لـە یـەکێك لـەو مانەوانەدا وپاش ئەوەی، کە گەڕاینەوەو بۆ ماڵ یەکێك پەیوەندی پێوە کردم و وتی فـلان کەس مرد... پێم ووت: چۆن، ئەو دوێنێ لەگەڵ ئێمە بووە و تەندروستی زۆر سروشتی بوو تێری خواردەوە و گاڵتە و گەپی کردو... ئـەویش ووتـی کـەس و کارەکـەی چـون لەخـەو بێداری بکەنەوە، بەڵام دیویانە کە مردوە، چوین بۆ ماڵیان و لەسەر جێگەکەی دیتمان... هیچ هێزو توانای نەبوو...

سبحان الله پاش ماوەیەکی کـەم، لەگـەڵ یـەکێك لـە هاوڕێکـانم سـەیری کارێکمـان دەکردو، یەکێك لە هاوڕێکانم لە تەنیشتمەوە بوو، بەڵام لە پڕ لـە تەنیـشت بەرزەکەکـەوە (مصعد) کەوت و مرد، هەموو ئەم کارانە دەبوو کارم تێ بکات و بمگەڕێنێتـەوە بـۆ لای خوای گەورە، بەڵام بە داخەوە کاریگەری یەکان تەنها کاتی بوون....

بارودۆخی کار کردن وای لێ کردم، کە بڕۆم بۆ دەرەوە و بڕێـك بـەروبوم بهێـنم و بـەم شێوەیە تاوان لەلام دەستی پێ کرد و ڕووی لە گەورەیی کرد واتە لە گوناه و تـاوان نـوقم بووم و بەتەواوی لە خوای گەوە دورکەوتمەوە، لەم کاتەدا، باوکم هاتە خـەوم وەك ئـەوەی، کە بەسەر شەقامەکاندا ڕێبکات، من دیتم و سلاوم لێ کرد و ویستم ماچی بکـەم، بـەڵام دیتم دەم و چاوی بۆ لایەکی دیکە وەرچەرخاند، دەستم کردە بانگ کردنـی، وای نیـشاندا کە گوێی لێم نیە: بەتەواوی بە ئاڕاستەیەکی دیکەدا ڕۆیشت، پاشان خەوێکی دیکەم دی، کە تیایدا لە ژورەکەی خۆم دەگریام و ئەویش لە ژورێکی دیکە دانیشتبوو وە نەیدەویـست بێت و لەگەڵم بدوێ و لە هۆی گریانەکەم بپرسێ...

لێرەدا هەستم کرد، کە هەڵەیەك لە ژیانی مندا هەیەو، کارەکە لەم سنورەدا نەوەستاو گەیشتە ئەوەی، کە خوشکەکەم پەیوەندی پێوە کـردم و پێـی وتم بـاوکم خـوا ڕەحمـی لێ بکات زۆر لێت پەستە، من خەونم بە ئەوەوە دیتووە. وەپێی ووتم بگە فریای براکەت ئـەو دەکەوێ و تیا دەچێ... ترس لە مردن ڕووی لێنام... دەستم کردە پرسیار لە خۆم گەر بمرم چۆن بچمە بەردەم پەروەردگارم... چی پێ بڵێم؟

من زۆر لە خوداو لە دیداری ئەو دەترسام وە زۆر ڕقم لـە تـاوان دەبویـەوە، تـا خـوای گەورە هاوەڵێکی بـۆ نـاردم... کاسـێتێکی پێـدام، کـە زۆر گوشـاردمی و بـۆلای خـۆی ڕاکێشام... وەك ئەوەی، کە لەگەڵ من بدویٚ، ئەو پەیڤانە دەربارەی ئـەوە بـوون گـەر تـۆ بتەویٚ لە پەروەردگار نزیك بیەوە و، بەرەو ئەو بجوڵێی ئەوا ئەویش بەرەو تۆ دێ و دەستت دەگریٚ، لە خوای گەورە نزیك ببەرەوە ئەویش بەرەو ڕووت دێـت، بـەرەو خـودا بـڕۆ هـەر کاتێك بەرەو گوناه دەڕۆیت... دەست پێشخەری موڵکی تۆیە بە تەنها و تـۆیش خـاوەنی ئەو ڕایەیت...

بەڵێ من هەستم بە پێویستی ئەو تەوبە یە دەکرد بۆ لای خوای گەورە و دورکەوتنـەوە لە تاوان، من وردە وردە هەستم بە بەخشندەیی خوای گەورە دەکـرد و دەرونیـشتم هێـدی هێدی ئارام دەبوو هەتا وای لێهات کە هەستم بە ترس لە مردن و دیـداری خـوای گـەورە نەدەکرد.

هەوڵی ئامادە بوونی وانە ئاینی یەکانم دا و هەوڵی چوون بۆ مزگـەوتم داو هاوڕێکـانم گۆڕی و ئەمەش زۆر گرنگ بوو بەلای منەوە کە هاوڕیٚ بگۆڕیت، لێیان دور بکەویتەوە و ناخی خۆت لە ژینگەیەکی پاك هاوەڵێتی ئیماندارانە بڕوێنی.

سوپاس بۆ خودا هەر ئەو ساڵە چووم بۆ حەج، هەروەها کیژێکم مـارەکرد، بـەڵام ئـەو پابەند نەبوو، من داوام لە پەروەردگار کرد گەر ئەم کارەم خەیری تێدایە ئەوا هـەردوکمان لێك نزیك بکاتەو و گەر نا و بە پێچەوانەوەشەوە خێری تێـدا نـی یـە ئـەوا لێکمـان دور بخاتەوە هەستم کرد کە کەعبە دەهەژیٚ و تەواوی ئـەو شـوێنە دەلەرێتـەوە و منـیش لـە ناخەوە دەلەرزم و سوپاس بۆ خودا کە خێزانێکی باشی پیٚ بەخشیم.

من دڵنیام، کە خوای گەورە لێبوردە و بە بەزەیی یە، هەستم بە پڕبایەخی گەڕانەوە بۆ لای خودا دەکرد کە بەهەشتی ئامادە کردوە، ئەم بەهەشتە بۆ لە خودا ترسان نەبیٚ شـیاو نی یە بۆ کەسی دیکە، چونکە پەروەردگار بۆ ئەوانی ساز کـردوە، کەواتـە پێویـستە لـە خودا بترسم هەتا بچمە نێویەوە، لەبەردەممدا تەنها یەك ڕێگە هەیەو هیچی دیکـە، جگـە لەو ڕێگەیە هیچ ڕێگەیەکی دیکە ڕاست و شیاو نی یە.

## هەنگاوە کردارییەکانی ڕووکردنە پەروەردگار کامانەن؟

لەڕاستیدا زۆر کەس لەم بارەیەوە پرسیار دەکەن، ئەوان هەنگاوەکردارییەکانی ڕوکردنە خوداو گەڕانەوە بۆ لای ئەویان دەوێ... تکایە ڕێگەم پێ بدەن تا بەشێوەیەکی دیاری کراو وەڵامی ئەم پرسیارە بدەمەوە، چەند هەنگاوێکی واقعی و تەواو هەیە بۆ کۆنترۆڵ کردنی دەرون و پابەند بوون بە خوداوە کە ئەمانەن:

پێنج خاڵ هەن کە لەمنەوە نی یە و بەڵکو لە پێغەمبەری خوداوەیە و تیایدا وریایمان پێ دەدات سەبارەت بە کلیلەکانی گەڕانەوە بۆ لای پەروەردگار

یەکەم: نوێژەکان لەکاتی خۆیدا، وا ڕاهاتن لەسەری کە ئەوە زیاتر خوای گەورە ڕازی دەکات و زۆرترین هۆکارەکە پەیوەندی نێوان تۆ و خودا بەرز ڕادەگرێ.

دووەم: یادی خودا، ئەگەر بۆ تەنها ٥ خولەکیش بێت لە ڕۆژێکدا و بەهەر شێوەیەك بێت: استغفر الله... الحمد لله... لا إله الا الله...

سێ یەم: نزا و پاڕانەوە لە خودا هەموو ڕۆژێ... دڵنیابە کە تۆ لە دونیاو دوارۆژیشدا پێویستیت بە زۆر شت دەبێ، بەهەر زمانێك بێت بپاڕێوە بەو شێوەی کە هەستی پێدەکەیت و پێت باشە.

چوارەم: خوێندنی قورئان ڕۆژانە و بە بەردەوامی... ئەگەر چی یەك لاپەڕەش بێت.

پێنجەم: دوور کەوتنەوە لە هاوەڵی خراپ... من دڵنیام بەمە تۆ دەبیتە مرۆڤێکی دیکە .

پێم خۆشە لێرەدا شتێك بڵێم واتە هیشام و هاوڕێکانی بە مردنی ئەو هاوەڵەیان پەروەردگار پەیامێکی بۆ ناردن، ئەم دو هاوڕێ یە گوناهیان چی یە، ئەی بۆچی پەروەردگار پەیامی بۆ نەناردن، من پێم خۆشە کە بڵێم:

خوای گەورە لە کەس ناگەڕێ و هەرکەسە پەیامێکی خۆی بۆ دەنێرێ، بەڵام بەرپەرچ دەدرێتەوە.

دەمەوێ بە پەیامێکی زۆر ڕازاوە ووتەکانم کۆتایی پێ بهێنم، کە لـە منـەوە نـی یـە بەڵکو پەیامێکی خودایی یە، فەرمودەیەکی قودسی یە کە پەروەردگار لەو بـەرزی یـەوە تیایدا بۆمان دەدوێ و دەفەرموێ: (ئەی بەندەکانم من ستەمم لەسەر خۆم حـەرام کـردوە، لەنێو ئێوەشدا حەرامە، ستەم لە کـەس نەکـەن، ئـەی بەنـدەکانم هـەموتان برسـی بـوون ئەوەتان نەبێ کە من تێرم کردووە، ئەی بەندەکانم هەموتان ڕووت بوون ئەوەتان نـەبێ کـە من پۆشتەم کردوە، ئـەی بەنـدەکانم ئێـوە بەشـەو و ڕۆژ هەڵـە دەکـەن و مـن لەهـەموو گوناهەکانتان دەبورم داوای لێخۆش بوونم لێ بکەن لێتان خۆش دەبم، ئەی بەندەکان ئێـوە ناتوانن زیانم پێبگەینن وە ناتوانن سوود م پێ بگەینن... ئەی بەنـدەکانم یەکـەمینتان و دواهەمینتان و مرۆڤ و جنۆکەتان لەسەر ناپاکترین دڵـی پیاوێـك بـن داوام لێ بکـەن... داوای هەر مرۆڤێك جێ بەجێ بکەم، ئەوە لە لای من کەم ناکات، مەگەر وەك ئەوەی کـە دەرزی یەك کەم دەکات کە بخرێتە دەریایەکەوە... ئەی بەندەکانم ئەمە کاری ئێوەیـە کـە من بۆم هەژمار کردون و، پاشان پێتان دەدەمەوە... هەرکـەس لـە کردەوەکـانی چـاکەی بینی با سوپاسی خودا بکات، گەر وانە بوو با ئەو کەسە تەنها لۆمەی خۆی بکات).[١]

ئەمە پەیامێکی خودایی یە، خوازیارم کە بیری لێ بکەینەوە و هەڵس و کەوت لەگـەڵ ئەو پەیامانەدا بە بایەخ و متمانەوە بکەین.

## ڕازیکردنی خودا

هەندێ کەس کە گوێی لەم پەیڤە دەبێت دەڵێت: ئەمە چی تێدایە هەمومان (سـوپاس بۆ خودا) پەروەردگارمان ڕازیدەکەین وە ئەم بابەتە ڕونەو پێویسی بـە گفتوگـۆ نـی یـە، لەبەر ئەوەی کە هەمومان پێمان خۆشە کە خودا ڕازی بکەین...

## ڕازیکردنی خودا (تەوەرە)ی ژیان و گرفتی تەمە نمانە

لە بەشێکی ژیانماندا بەسەر هاتی زۆرێك لە لاوانمان دیوە کە کیژێکیان خۆش ویستوەو ئەویننداری بون و ئەمەش بۆتە گرفتی ژیانیان، ئەو لاوە دەیەوێ ئەو کیـژە ڕازی بکـات و

١ـ مسلم لە ابوذر ئەویش لە پێغەمبەر کەلە خودا ی گەورە ریوایەتی کردوە.

هەموو هەوڵ و کۆششەکانی لە پێناودا دەخاتە گەڕ، لەڕاستیدا مرۆڤ هەست بەشەرم دەکات وکە ئەمە وەك نمونەیەك بۆ خودا دێنێتەوە... بەڵام بە داخەوە لە واقعی هاوچەرخی ئەمرۆماندا هیچ نمونەیەکی ڕونتر لەم نمونەیە بەدی ناکەم...

ئەگەر لاوێك کیژێکی خۆش ویست و بویە ئەویندار، ئەو دەزانێ کە حەزی لە چی دەبێت و ڕقی لە چی دەبێتەوە و چی ڕازیی دەکات و ئەگەر کیژێ ئارەزوی شتێك بکات و کوڕە بە پێچەوانەوە حەزی لە شتێکی دیکە بێت ئەوا دەگەڕێت بەدوای ئەوەی کە چۆن ئەوەی ئەوکیژە حەزی پێ یەتی دەستەبەری بکات نەك ئەوەی کە خۆی دەیەوێ، ئێمە مەبەستی خۆشەویستەکانمان دەخەینە سەروی مەبەستی خۆمانەوە و ئارەزوی ئەوان دەخەینە سەروی ئارەزوەکانمانەوە، ئەگەر هەستمان کرد خۆشەویستەکانمان بەختەوەرن ئەوا بەختەوەر و کامەران دەبین، ئەم هەستە بریتی یە لە هەستی کەسێك کە خەشەویستی دەکات و دەیەوێ خۆشەویستەکەی ڕازی بکات... دەی وەرن لەم نمونە دونیایی یەوە بڕۆین بۆ نمونەیەکی دیکە بۆ هەڵس و کەوت لەگەڵ پەروەردگاری باڵا دەستدا.

تۆ بڵێ کە ئەمە بریتی بێت لە واقعی پەیوەندی یەکانمان لەگەڵ خودا، ئایا ئێمە سورین لەسەر ڕازی کردنی پەروەدگار بە هەمو هۆکارێك و بەبەردەوامی ,ئەگەر من خوازیاری شتێکبم و خوای گەورە شتێکی دیکەی پێ خۆش بێت تای تەرازوی کامیان قورس دەبێت ڕازی کردنی خوای گەورە، یان هەواو ئارەزوەکانت.

لەبەر ئەوە کە تۆ ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان دەبینی بایەخ دەدات بەم مانایە و جەختی لەسەر دەکاتەوە: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمۡ كَحُبِّ ٱللَّهِۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِۗ﴾ البقرە: ١٦٥.

هەروەها لە فەرموودە و نزاکانی پێغەمبەر(ﷺ) داهاتووە کە دەفەرموێ: (خودایە من خۆشەویستی تۆ داوا دەکەم، داوای خۆشەویستی ئەو کەسەش دەکەم کە تۆی خۆش دەوێ، داوای ئەوینی ئەو کارەش دەکەم کە لە خۆشەویستی تۆمان نزیك دەکاتەوە، ئەی پەروەردگار لەوەی کە تۆ ڕزقی منت داوە و لەوەش کە خۆشم دەوێ بیکەرە هێزێك لەوەی کە تۆ خۆشت دەوێ، ئەو شتەش کە من خۆشم دەوێ تۆ پەنات لێی داوم بۆم بکەرە بۆشایی یەك بۆئەوەی کە تۆ خۆشت دەوێ ).[١]

---

١ـ هەندێکی لە (ترمذی) و إمام أحمد هاتووە.

ئەوە پێغەمبەرە(ﷺ) ژیانی بەتەواوی کردەوەکانی و هیواو خواستەکانی بریتی یە لـە خۆشەویستی خودا، ئەوە کاری تەمەنی بووە... پـەروەردگارا گـەر منـداڵێك، یـان هـەر شتێکت لێم سەندەوە ئەوا بیکەرە بۆشایی لەکات و بیرو هۆشمدا هەتا ئەو کارانـەی تێـدا ئەنجام بدەم کە خۆشت دەوێن هەروەها پێغەمبەر(ﷺ)فەرمودەیەکی زۆر سەیری هەیە کـە تیایدا دەفەرموێ: (سوێند بەوەی کە گیانی منی بەدەستە پێم خۆشە کە لە پێناوی خوادا بجەنگم و، پاشان بکوژرێم هەروەها زیندوو ببمەوە و بکوژرێمەوە، پاشان زیندوو ببمـەوە و بکوژرێمەوە دیسان زندو ببمەوە و بکوژرێمەوە).[1]

بۆچی ئەمەت پێ خۆشە ئەی پێغەمبەری خودا ؟... لەبەرئەوەی هەر ئەو خودایـە یـە ڕێزی لێ ناوم و نیعمەتی خۆی ڕژاندوە بەسەرمدا، فلان شتی پـێ داوم و ئـاوا چاکـسازی کردوم و ڕێنمونی کردوم و شێوازی جوان کردوم... ئەمە کێشە و گرفتێکە و زۆر دەگمەنە لە ژیانماندا، هەر ئەم کارەیە کە جارێکی دیکە دەمانەوێ لە ژیانمانـدا بیگێڕینـەوە و لـە ژیانماندا بیبوژێنینەوە ئەی ئەو کەسـەی کـە سەرپێـچی خـودا دەکـەیت... سـەیری ئـەم پەیڤەی موسی بکە بۆ پەروەردگاری ((و عجلت الیك رب لترضی)) واتە: مـن پەلەمـە ئـەی پەروەردگارا، ئایا کەسێك لە ئێمە ئەم دەستەواژەیەی کردۆتە دروشمی خۆی.

من واز لە فلان تاوان دەهینم بەپەلە و بەرەو تۆ دێم تا لێم ڕازی بیت هەروەها بروانـە ئەم پەیڤەی ابراهیم(علیـە الـسلام) کاتـێ کـە دەفـەرموێ بـە قەومەکـەی: ﴿وَقَالَ إِنِّي ذَاهِبٌ إِلَىٰ رَبِّي سَيَهْدِينِ﴾ الصافات: ٩٩ بۆچی ئەو بەم شێوەیە دەدوێت ؟ ئایـا پـێش بینی مردنی دەکات؟ ئەو لە تەمەنی ١٦ساڵیدا ئەمەی ووتوە، ئەو ئـەم پەیڤـە دەڵێـت، دەفەرموێ من دەچم بۆ لای پـەروەردگارم، دەمـەوێ لـە تـۆ نزیـك ببمـەوە پـەروەردگارا دەمەوێ ڕازیت بکەم.

---

١ ـ بوخار و ئیمام أحمد لە مەسنەدەکەی و نسائی ڕوایەتیان کردوە .

# چەند چیرۆکێکی ڕاستەقینە

## بەرگێکی سادە، بەڵام شتی زۆر کۆنترۆڵ دەکات

ناوم ئایە رفعەتە، ژیانی هاوسەریم پێکەوە ناوەو دو کچم هەیە، ماوەیەکی زۆر کەمە حیجابم پۆشیوە، من پێشتر وام دەزانی کە ژیانم بریتی یە لە چونە دەرەوە و جلی جوان لەبەرکردن، هەرکارێك بۆم دەست بدات دەیکەم، بەڵام لەهەمان کاتدا نوێژ دەکەم و قورئان دەخوێنم و عەمرەش دەکەم من واهەست دەکەم کە مافی خودا بەجێ دێنم و مافی خۆشم دەدەم، ژیانیشم دەگوزەرێنم، تا ڕادەیەك گرنگترین شت لە ژیانمدا ئەوەیە کە من چ جل و بەرگێ بپۆشم ؟ و چی بکرم، پۆشاکی ئەمڕۆ چی یە؟ ناتوانم دوو ڕۆژ لەسەریەك یەك جۆرە جل و بەرگ لەبەر بکەم، هەتا کاتێك هات و تیایدا هەستم بە دڵە ڕاوکێ یەکی زۆر کرد، تاوای لێهات کە هەستم دەکرد گوێم لە دەنگێکی زۆر خۆشە کە پێم دەڵێت: هەستە لەسەر جلەکانت، هەستە لەسەر پۆشاکەکانت، ئەمە وشەیەکی وابوو کە لێی نەدەگەیشتم، بەڵام من هەستام و جلەکانم کۆکردەوە و ویستم لێیان هەڵبژێرم، ناشزانم کە من بڕیارم داوە حیجاب بپۆشم، تەواوی جلەکانم کۆکردەوە وە خستمە نێو کیسەیەکی زبڵەوە لەبەر ئەوەی کە جانتایەکم نەدۆزیەوە تێی بکەم، هەستم دەکرد کە تەنگە نەفەسم بە ئۆتۆمبێلەکەم گەڕام و شوێنێکی (إیشاربات)م دیتەوە، بۆ یەکەمین جار لە ژیانمدا خۆمم دیتەوە، کە(إیشارب) دەکڕم بۆ ڕۆژی دواتر من ڕاوێژێکی زۆر گرنگم هەبوو، وە گرنگ وا بوو کە من تیایدا بە جل و بەرگی (شیك)ەوە دەر بکەوم بە دوای ئەو کیسەیە گەڕام کە پۆشاکەکانم تێ کردبوون بەشوێنی شتێکدا دەگەڕام کە تەنك و تەنگ نەبێ واتە لە حیجاب بچێت، بەڵێ من ئەو جلەم پۆشی لەگەڵ ئەوشدا ئەم بڕیارە زۆر کاریگەر دەبێت لە ژیانی کۆمەڵایەتیم، چونکە حیجاب لەنێو خێزانەکەمدا شتێکی زۆر نامۆ بوو، واتە من بوومە حیجاب پۆشێکی یەکەمی و سەرەتایی، کەس بڕوای نەدەکرد کەمن بەرەو ئەو وەرچەرخانە گرنگە هەنگاوم هەڵگرتووە.

هاوسەرەکەی دەڵێت: لە ڕاستیدا من بەختەوەرترین پیاو بووم کاتێ، کە خێزانەکەم حیجابی پۆشی، چونکە زۆر هەوڵم لەگەڵی دەدا، بەڵام دەتوانین بڵێین ئەو کەمێك درەنگ تر بەدەم کارەکەوە هات، بەڵام سوپاس بۆ خودا ئاکامی باش بوو، من ئامۆژگاری پیاوان دەکەم، کە هانی ژنەکانیان بدەن، کە ببنە حیجاب پۆش، چونکە بەهۆی ئەم خێزانە پیاوەکە، لەبەرئەوەی کە گەردنی لە ئاگر ڕزگاری دەبێت پێش ئەوەی کە خێزانەکەی گەردنی خۆی ئازاد بکات لە ئاگر گرفتی ئەو بۆشاییە کۆتایی پێ هات، تەواوی خێزانەکە بەیەك ئاڕاستە دەدوێ کە ئەویش ڕازی کردنی پەروەردگارە...

کچە بچوکەکەی دەڵێت: کاتێ کە دایکم حیجابی پۆشی زۆر بەختەوەر بووم و چووم بۆ لای باپیرم وە پێم ووت: دایکم زۆر جوان بووە کاتێ کە حیجابی پۆشیوە وە پرسیارم لێ کرد: بۆچی دایکم حیجابی پۆشیوە، ئەویش ووتی پەروەردگارمان ئەوەی پێ فەرمووە کە حیجاب بپۆشێ، نەك کەسێکی دیکە هەروەك چۆن بە ئێمە دەفەرموێ نوێژ بکەن و ئێمەش نوێژ دەکەین.

ئایەت دەڵێت: من وا هەست دەکەم کە داهاتوی منداڵەکانم دابین کردوە و چی دی لێیان ناترسم... وە من زۆر بەختەوەرم... هەست دەکەم کە دەمەوێ بچم بۆ لای پەروەردگارم و سەرم بەرزە و حیجابیش جوانی دەکات... لە سەرەتادا من وەك زۆرێك لە کچان بیرم دەکردەوە کارەکە زۆر دژوار بوو، بەڵام لە پڕ بۆم دەرکەوت کە کارەکە زۆر زۆر ئاسانە سەیر لەوەدایە... حیجاب ڕەوشت و سروشتی کیژێك ڕێك و پێك دەکات، بەڵێ پۆشاکێکی سادە، بەڵام زۆر شت کۆنترۆڵ دەکات... لە ژیانیدا، لە پەیوەندیدا لە ڕەوشت و ڕەفتاریدا... ئەوەی سەیر ەکەس و کارم و برادەرانم کە بەرهەڵستی بالاپۆشی منیان دەکرد، ئێستا بوومەتە پێشەنگیان و وایان لێ هاتووە بە شێوەیەکی زۆر گاریگەرن بە من... ئەم ئاماژانە هەرچەندە بچوکن لەم خێزانەدا، بەڵام من وا هەست دەکەم کە ئەم ماڵە زۆر ئارامەو دڵنیایە لە دوای ئەم بڕیاری حیجابەکردنە... چونکە بڕیاری ڕازی کردنی خودایان داوە...

## ڕازیکردنی پەروەردگار لە ڕازیکردنی داك و باب دایە

ئەو دەربارەی ئەزموونەکەی دەدوێ و دەڵێت:

ڕۆژێك دایکم ـ ڕەحمەتی خوای لێ بێ ـ نەخۆش کەوت و نەخۆشی یەکی زۆر سەختی گرت... ناچار بووم واز لە کار و خوێندن و هەموو ژیانم بێنم و لەماڵەوە چاودێری بکەم... هەتا تەمەننای ئەوەم دەکرد لەبەر سەختی نەخۆشی یەکەی گیان لەدەست بدات، بەهۆی ئەوەی کە خزمەتم دەکرد هەستم کرد بەوەی کە پەروەردگار لە ڕێگەی دیاکمەوە دەرگای ڕەحمەتی لەسەر واڵا کردووین... وەك ئەوەی کە دایکم ڕازی بوو بێ، چونکە ئاراممان لەسەر ئەشکەنجەکەی دەگرت، تەنگەلانی ڕەوشتی لە کاریگەری نەخۆشی یەکەی هۆیەك بوو بۆ ڕازی کردنی پەروەردگار.

سەیری ئەم هۆکارە ئاسان و، جوانە بکەن بۆ ڕازی کردنی خوای گەورە ڕازی کردنی داك و باب، وەك ئەوەی کە پەروەردگار بفەرموێت: تۆ ڕێزی داك وبابت گرتوە و ئێمەش ڕێز لە تۆ دەگرین، هەرچۆن بەختەوەرت کردوون ئێمە ش بەختەوەرت دەکەین.

لە ڕاستیدا هەر هەوڵێك کە تۆ پێی هەڵدەستی لە دونیا بۆ ڕازیکردنی خودای گەورە و باڵا دەست، ئەوا ئاکامەکەی هەستی تۆیە و هەست دەکەیت کە تۆ لە بەردەم خۆتدا گەورە بویت و نرخێکت هەیە... هەر بەندەیەك بۆ خوا واز لە کارێك بێنێ , خودا لەبری ئەوە کاری چاکتری پێ دەدات , ئەو چیرۆکەکەی دەگێڕێتەوە و دەڵێت:

فەرمودەیەکی پێغەمبەر(ﷺ) هەیە کە هەمیشە لەسەری دەوەستم، چونکە گرفتێکی هاوشێوەی ئەو فەرمودەیە ڕویدا لێم... ئەویش (هەر بەندەیەك تەنها بۆ خوا واز لەکارێك بێنێ... خوا چاکتری پێ دەدات لە دین و دونیای)[1] لە ڕاستیدا لە سەرەتای تەواو کردنی خوێندنم لە کۆمپانیایەکی زۆر بەناوبانگ کارم دەکرد کە موچەیەکی زۆری هەبو وە ئیمتیازیشی باش بوو، بەڵام من حیجابم نەدەپۆشی... کاتێ کە بڕیارم دا حیجاب بپۆشم کتوپڕ ئەوان پێیان ووتم سیاسەتی ئەم کۆمپانیایە وایە گەر حیجاب پۆشی دەست بەجێ

---

١ـ لە ابن عمرەوە بەرز کراوەتەوە و سیوطی لە ( الجامع الکبیر) ڕوایەتی کردوە.

واز لە کارەکەشت دێنی... بەڕاستی ئەمە تەحەدایەکی زۆر گەورە و لە بنەڕەتدا بازاڕی کار زۆر لاوازە وە زۆر دژوارە کە پاش دەرچون ڕاستەوخۆ کارت دەست بکەوێت... بارو دۆخەکە زۆر دژوار بوو، بەڵام سوپاس بۆ خودا پشتم بە خودا بەست و لەو کارە گەڕام وە پاش ١٥ ڕۆژی تەواو خوای گەورە ڕێزداری کردم بە کۆمپانیایەکی چاکتر لەهەموو ڕویەکەوە و زۆر تیایدا بەختەوەر بوم.

## گرنگی هەست کردن بەڕازی بوونی پەروەردگار

بەسە رهاتێك هەیە، کە خۆم دیتومەو... زۆر لێی سەرسام بوم!

لەسەرتای ژیانی کارمدا، کارم لە نوسینگەیەکی پێدا چونەوەدا دەکرد و سەرۆکەکەم لە کاردا پیاوەێکی زۆر باش و بەڕێز بوو کە ناوی مامۆستا صلاح بو... ئەم پیاوە میانڕەو و زۆر بەڕەوشت بوو، من تازە خوێندنم تەواو کردبوو. جیاوازی نێوانمان زۆر گەورە بوو، سەرنجم دا، کە ئەڵقەیەکی زێڕ لە پەنجەیدایە و دەشزانم، کە پێغەمبەر(ﷺ) قەدەغەی کردوە، کە پیاوان زێڕ بکەن بە خۆیاندا، من ویستم لەو بارەیەوە بیدوێنم، بەڵام بە جۆرێ، کە نەهەستی بریندار بێ و نەشەرمەزار بێت، چاوەڕوانی هەلێك بووم، کە هەردووکمان بەتەنها بین و پێم ووت: ئەی مامۆستا صلاح من زۆر پێت سەر فرازم زۆر سودت لێ بەدی دەکەم و، زۆر پێت سەرسامم و ڕەوشتت زۆر بەرزە، بەڵام من وا دەبینم، کە ئەڵقەیەکی زێڕ لە پەنجەتدایە و پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵمان پێ دەدات، کە ئەمانە لەسەر پیاوان حەرامن و بۆم ڕون کردەوە، کە ئەمە چۆن پەروەردگار پەست دەکات... ئەو پێی ووتم: پێغەمبەر(ﷺ)وای فەرمووە؟ منیش ووتم: بەڵێ، ئەویش ووتی کەواتە دەست بەجێ لەپەنجەی دادەکەنم... بەڵێ ئەو ئەڵقەکەی داکەند و من زۆر سەرسام بووم لەم پەلەکردنەو وەڵامە دڵخۆشکەرە، پاشان بۆ ڕۆژی دواتر هات و لەبەردەم خەڵکەکەدا ووتی: من ئەڵقەکەم لابرد لە دەستم، چونکە عەمر واو وای پێ ووتم و من ئامادە نیم، کە هەرگیز خوای گەورە لێم ڕازی نەبێت، لە ڕاستیدا ئەم مانایە زۆر هەژاندمی، کە مرۆڤ هەست بە گرنگی ڕازی بوونی پەروەردگاری بکات...

من سەرنجێکی ڕاستەقینەم هەبوو، کە دەمەوێ ئاماژەی پێ بکەم ئەویش ئەوەیە، کە بەجێ هێنانی پێویستی یەکانی مرۆڤ ڕێگەیە، کە لە ڕێگەکانی ڕازیکردنی پەروەردگار.

فەرموودەیەکی پێغەمبەر هەیە کە ئەم ڕایە پشت ڕاست دەکاتەوە و پێغەمبەر (ﷺ) تیایدا دەفەرمویٚ: ((الخلق عیال الله، وأحبهم إلی الله أنفعهم إلی عیاله)).[١]

وەك ئەوەی کە خۆشەویسترین بەندە لەلای خودا ئەوەیە، کە دەستی خەڵکی دەگرێت بۆسەر ڕێگەی چاکە.

ئەمە دوو ڕێگە بوو، بۆ ڕازیکردنی پەروەردگار، کە لەسەری دواین:

یەکەم: ڕازیکردنی دایك و باب.

دووەم: ڕاپەڕاندنی پێویستی یەکانی مرۆڤ.

ئەو نمونانەی، کە باسمان کردن مانای زۆر گرنگیان هەیە... ئەویش ئەوەیە کە مرۆڤ کاتێ دەکەوێتە ئەزمونێکی لەو شێوەیەی لە نێوان هەڵبژاردنی ئارەزوەکانی، یان هەڵبژاردنی ئامانجەکانی پەروەردگار ئەو لەسەرەتادا دوچاری دژواری دەبێت... لەبەرئەوەی کە دەرونی پەیوەستە بە دونیاوە و هێشتا دڵی پڕ نەبۆتەوە لە خۆشەویستی خودا... بەڵام کاتێ کە ئارام دەگرێت لەسەر هەڵبژاردنی ئامانجە ئیلاهیەکان و لەپاش چەند ئەزمونێك لە کۆتایدا ئەوە بەدی دەکات کە ئارەزوەکانی بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی بەرەنگاری ویستەکانی پەروەردگار نابنەوە لەبەرئەوەی کە خۆشویستنی یەکەمی ئەوەیە کە هەستێ بە خۆشویستنی ئەوەی کە خودا پێی خۆشە و گرنگ ئەوەیە کە لەگەڵ پەروەردگاریدا ڕاست گۆ بێت...

ئاگادارتان دەکەمەوە لەوەی کە هەموو دەلاقەکانی نێوان خۆتان وپەروەردگراتان دا بخەن ،تەنانەت ئەگەر تاوانبار بیت و تاوانی زۆریش ئەنجام بدەیت...

من چیرۆکی یەکێك لە تابعینەکانتان بۆ دەگێڕمەوە... إمام أحمدی کوڕی حەنبەل(ﷺ) دەڵێت: بەڕێگایەکدا دەڕۆیشتم جەردە و ڕێگر خەڵکیان ڕوت دەکردەوە، منیش ئەو دزەم دی، کە نوێژی دەکرد منیش چومە لای و وتم ئەم کارەی تۆ دەیکەیت

١ـ طبرانی لە إبن مسعودەوە.

لایقی پەروەردگار نی یەو لێت وەرناگرێت و ئەم نوێژەت پەسـەند ناکـات، ئـەو دزە پێـی ووتم: ئەی إمام لە نێوان من و پەروەردگاردمدا زۆر دەرگا هەن کە داخراون و پـێم خـۆش بوو یەکێك لەو دەرگایانە بەکراوەیی لێ گەڕێم... إمام أحمد ئەم پەیڤەی زۆر بەلاوە نـامۆ بوو و نکوڵی لێ دەکرد و پاش چەند مانگێکی کەم إمام أحمد ڕۆیشت بۆ بـەجێ هێنـانی فەرزی حەج و لەکاتی تەوافی بـەدەوری کەعبـەدا و فـەرموی پیـاوێکم دیـت کـە خـۆی هەڵواسیبوو بە کەعبەوە و دەیگوت: ئەی خودا مـن لای تـۆ تەوبـەم کـردوە... بـەزەیت پێمدا بێتەوە... من هەرگیز ناگەڕێمەوە بۆسەرپێچی کردنی تـۆ... سـەرنجی ئـەو ئـاه و نزایەم دا کە ئەو لەگەڵ پەروەردگاریدا دەدوا... کاتێ کە لێی چومە پێش دیتم کە پیـاوە دزەکەی دوێنێ یە و منیش ووتم:

لەدەرگایەك گەڕا بەکراوەیی بەڵام خوای گەورە هەموو دەرگاکانی بۆ کردەوە.

# چەند نمونەیەك لە هاوەڵان

## باخچەکەی ئەبو دەحداح

جارێکی دیکە دەمەوێ بگەڕێمەوە لای نمونە قەشەنگ و ڕازاوەکان لـە کەسـانێك کـە گرفتی سەرەکیان لە ژیانیاندا ڕازیکردنی پەروەردگاریان بووە ... گەر ئێمە لەسـەر نمونـەی لابردنی ئەڵقەیەکی زێڕ لە پەنجە و کیـژێك کـە حیجـاب دەپۆشـێ، یـان کەسـێك واز لـە کارەکەی دێنێ دوابین ئەوا ئەمانە نمونەی ڕازاوە بون... بەڵام لە ڕاستیدا خەڵکی هەمیشە بەزۆری بە پەرۆشی لاسایی کردنەوەی یارانی پێغەمبەر(ﷺ) بوون، ئێمە باس لـە هەنـدێ نمونـە دەکـەین، بـەڵام نامـەوێ کـە بڵـێم دژوارە، بـەڵام دەڵـێم ئەمانـە نمونـەی بـاڵان لەبەردەوامیدان لەسـەر ڕازیکردنـی پـەروەردگاری باڵادەسـت و بـەتوانا... مـن هـەرگیز بەسەرهاتی ئەم یارە ( ئەبو دەحداحم) لەیاد ناچێت... ئەم هاوەڵە لە کەسانی دەوڵەمەنـد بوو وە باخێکی هەبوو لە گەورەترین باخەکانی مەدینە... ئەم باخـە ٧٠٠ داری خورمـای تێدا بووە... بزانە چەند ماوە دەبڕیت لە سایەی ئەم هەموو دار خورمایە!!

ئەبو دەحداح دەچێتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)و لەو کاتەدا ئەم ئایەتە دێتە خوارێ، کە ئەفەرموێ: ﴿مَّن ذَا ٱلَّذِى يُقۡرِضُ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنًا فَيُضَـٰعِفَهُۥ لَهُۥٓ أَضۡعَافًا كَثِيرَةً﴾البقرة: ٢٤٥، ئەو سەرسام بوو وە پرسیاری کرد و ووتی: ئایا پەروەردگار تکای قەرز لە ئێمە دەکات؟ حەزرەت فەرموی: بەڵێ ئەی ئەبو دەحداح، ئەویش ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەستت بێنە... پێغەمبەر(ﷺ) دەستی دایە و ئەبو دەحداح دەستی نایە نێو دەستی پێغەمبەر و ووتی ئەو باخەی هەمە لەلایەن منەوە بەقەرز دەیدەمە خودا و، پاشان لێیدا و ڕۆیشت!! ئەو چۆن توانی ئەمە بکات ؟! بەڵێ ئەو مەبەستی تەنها ڕازیکردنی خودا بوو... ئەبو دەحداح لە باخەکە نیزك بوویەوە کوڕەکەی و خێزانەکەی دی تیایدا و ووتی ئەی دایکی دەحداح... ئەویش ووتی: فەرموو ئەی هاوسەرم، ئەبو دەحداح ووتی: تۆو ئەو منداڵە لەو باخە وەرنە دەرێ، ئەم باخە بووەتە قەرز لەلای خودا خێزانەکەی دەست بەجێ هاتە دەرێ بە جۆرێ منداڵەکەی دەنکە خورمایەکی لە دەمدا بوو پێی فڕێ دا... لەبەرئەوەی لە ئێستاوە مافی ئەوەیان نی یە و ئەو باخە بۆتە موڵکی خوای گەورە واتە ئەم باخە بژێوی تێك نەدا و فریویشی لەسەر نەخوارد، بەڵام ئەم کارە هەموی لە پێناو ڕازیکردنی پەروەردگار دا بوو و هەر لە پێناوی ئەوا هەموو شتێ بێ نرخ دەبێ و مرۆڤ هەموو شتێ دەبەخشێ...

## دامەزراوی عبد الله کوڕی حوزافە

لەم جۆرە نمونانەشدا ئەم یارە بەڕێزە ناوزەد دەکرێ کە ناوی عبد الله کوڕی حوزافەیە... بەسەرهاتەکەی بەسادەیی ئەمەیە کە ئەم بەڕێزە لەگەڵ سوپای ئیسلامیدا دەڕوات بۆ ڕو بەڕوبونەوەی ڕۆمان و، پاشان لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری ئەوانەی کە لە گەڵیدا بوون بەدیل دەگیرێ... ئەم جەنگە لەسەردەمی دەستەڵاتی عومەری کوڕی خەتابدا(ﷺ)ڕویداوە، ئەم هاوەڵە بەڕێزە و زیاتر لە ١٠٠ کەس لە ئەوانەی لەگەڵیدا بوون دەبردرێنە لای پادشای ڕۆمەکان... پادشای ڕۆم دەوەستێ و لێیان دەپرسێ ئایا کەسێك لە ئێوە پێغەمبەری(ﷺ) دیوە؟ واتە مەبەستی ئەوەبوو کە کێ لەئێوە پێغەمبەر(ﷺ)ی

دیوە؟؟ وتیان: تاکە پیاوێك کە پێغەمبەری(ﷺ)دیوە عبد الله کوڕی حوزافەیە، عبـد الله لەبەردەم پادشای ڕۆمدا وەستاو ئەویش دەیوست بـەماڵی دونیـا لـەخۆی بـایی بکـات و دانوستانی لەگەڵ بکات و پێی ووت من دەمەوێ بت کەم بە هاوبەشی سامانەکەی خـۆم، بەڵام لە ئاینەکەت گەڕێ، عبد الله ووتی: سوێن بەخوا هەموو دونیام پـێ بـدەیت واز لـە ئاینەکەم ناهێنم، پادشا ووتی ئەشکەنجت دەدەم و تیربارانت دەکەم، تیری بە کۆمەڵ دەیدا بەلاتەنیشتیدا و ئەم لە شوێنی خۆی نەدەبزوا، پادشای ڕۆم زۆر لەم کەڵـە پیـاوە سەرسـام بوو بۆیە ڕێگایـەکی دیکـەی بـۆ ئـازاردانی گرتـە بـەر و فـەرمانی دا ئـاگر بکەنـەوە و مەنجەڵێکی پڕلە ڕۆن بخەنە سەر ئاگرەکە و هەرکاتێ کە ڕۆنەکە سـور بویـەوە دوکەسـیان هێنایە بەردەمی عبدالله و، پاشان داوایان لێ کرد کە لە ئاینەکەت وازدێنی و دێیتە سەر ئاینی ئێمە ؟ ئەویش فەرموی: نەخێر، پادشا وتـی: بیگـرن و بیخەنـە نێـو ئـەو ڕۆنـەوە هەروەکو چۆن ئەو دوانەتان تێ فڕێ دا، عبد الله دەسی کردە گریان، ئەوان بەختەوەر بوون و خێرا گەڕانەوە لای پادشای ڕۆم وتیان ئەو دەگری، ووتی بۆم بێنن و دواتر ووتی دەبیـنم کە دەگریت کەواتە وەرە سەر ئاینەکەم و لەئاینەکەی خـۆت گـەڕێ... ئـەویش فـەرموی نەخێر، سوێند بەخوا ئەو پادشایە سەرسام بوو وە لێی پرسی: ئەی بۆچی گریای؟ عبد الله ووتی: گریام لەبەرئەوەی کەمن هەر تەنها یەك نەفسم هەیە و لە پێناوی خودا یـەك جـار دەمرم وە من لە خۆشەویستیم بۆ خودا حەزم دەکرد کە بەقەد ژمارەی موەکانی جەسـتەم گیانم هەبوایە و یەك لە دوای یەك لە پێناوی خوادا دەربچونایە.

لە ڕاستیدا من تاوێك لەگەڵ خۆم وەستام... تا ئەم ڕادەیە ؟! لە کاتی مردندا دەگری، لەبەر ئەوەی جگە لە گیانێك هیچی دیکەی نی یە... تا ئەم ڕادەیە ئەم کەڵە پیاوە سـور بو لەسەر ڕازیکردنی پەروەردگار... گرفتی عبد الله کوڕی حوزافە ئەمـە بـووە مـن چـی بکەم تا پەروەردگارم ڕازی بێت ؟!

## نزا و پاڕانەوەی عبد الله کوڕی جەحش

با بێین نمونەیەکی دیکە بخەینە ڕوو... عبد الله کوڕی جەحش یەکێك بووە لـە یـارانی پێغەمبەر(ﷺ)ی لە ڕۆژی غـەزای ئوحـود، عبـد الله کـوڕی جـەحش و سـەعدی کـوڕی مەعاز(ﷺ) پێکەوە وەستان و سعد وتی من دوعایەك دەکەم تۆ ئـامینی لەسـەر بکـەو،

پاشان تۆ دوعایەك بكە من ئامینی بۆ دەكەم، عبد الله وەستاو سعد دەستی كردە دوعاكەیی و فەرمووی: پەروەردگارا من داوات لێ دەكەم، كە سبەینێ بە پیاوێكی بەهێزی بێ باوەڕ ڕزقم بدەیت كە لە دژی یەكدی بجەنگین و، پاشان من ئەو بكوژم، ئەمە دوعای سەعد بوو كە عبد الله ئامینی لەسەر كرد، دواتر عبد الله دەستی كردە دوعا كردن و ووتی ئەی خوایە سبەینێ بە پیاوێكی بەهێزی كافر ڕزقم بدەیت كە لە دژی یەكدی بجەنگین و بیكوژم و، پاشان پیاوێكی دیكەی بەهێزی كافر بێت لەگەڵی بجەنگم و بمكوژێ، بەڵام ئەو پێی وا بوو تەنها ئەمە بەس نی یە تا پەروەردگاری پێ ڕازی بكات بۆیە ووتی ورگم هەڵبدڕێ و لوت و گوێم بكات و ڕۆژی دوایی بێمە لات و لێم بپرسی ئەی عبد الله ئەمە چی ڕویداوە لێت ؟ منیش دەڵێم: پەروەردگارا ئەمە لە پێناوی تۆدا بووە و تۆش بەمن دەفەرموی ڕاست دەكەی.

ئەم پیاوە چی دەوێت؟ بەس نی یە كە بمرێت، بەڵكو دەیەوێ جەستەی بكرێت بەچەند پارچەیەكەوە، ئەم پەیڤەش زۆر دژوارە، ئایا ڕاستە، بەڵام كێ هەیە بەم شێوەیە بیری كردبێتەوە تا لێی ڕازی بێت، خوای گەورە لە عبد الله كوڕی جەحش ڕازی بوو، سەعدی كوڕی مەعاز دەفەرموێ من دوای كەوتم و لەكاتی جەنگەكەدا چاوم لی لا نەدەدا، بۆ ئەوەی كە ببینم چی لە عبد الله ڕوودەدات وەپاش كۆتایی هاتنی جەنگەكە سعد دەفەرموێ عبداللەم دیتەوە ورگی هەڵدڕابوو و لوت و گوێ ی كرابوو وە لە تەنیشتیەوە دوو لەو كافرانە كەوتبوون كە ئەو كوشتبوونی پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (ئەو لەگەڵ خودا ڕاستی كرد و خوداش ڕاستی بۆ هێنا).

ئەم نمونانە نمونەی جەنگەكان بوون، بەڵام ئێمە دەتوانین لە زۆر شتدا پەروەردگار ڕازی بكەین... سەرنجی ئەم فەرمودەیە بدەن:

(دوو ووشەی سوك لەسەرزمان و قورس لە كێشان و زۆر خۆشەویستن لەلای پەروەردگار، كە ئەوانیش ( سبحان الله و بحمده سبحان الله العظیم).[١]

یەكێك لە تابعین پەیڤێكی زۆر ناسك دەڵێت: من دەزانم كەی خوای گەورە لێم ڕازی دەبێت... پێیان وتیان: چ كاتێ؟ ووتی: كاتێ كە دەڵێم: (سبحان الله و بحمده سبحان الله

---

١ـ بوخاری و مسلم لە ئەبو هریرەوە وەریان گرتووە.

العظيم)، چونکە لای خوای بەخشندە زۆر ئازیزن، گەر پـەروەردگار بـێ وەیـم بکـات بـۆ وتنیان ئەوا لێم ڕازی یە وە ئەگەر نا توانای وتنیانم نابێ.

خوای گەورە ڕازی بکەن بە هۆی کەس و کـارو دایـك و باوکتـان... پـەروەردگار ڕازی بکەن بە هۆی کارەکانتان.. ڕازیی بکەن بـەوەی لەسـەر پێـچی پـەروەردگار واز بهێـنن، پەروەردگار ڕازی بکەن لە هەموو شتێ خۆشی دەوێ و پێی ڕازیە..

## لە کۆتـایی دا...

وشەیەکی ناسك کە پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموێ کاتێ کە کەسێ لێـی دەپرسـێ: کـێ خۆشەویـستی خودایـە و بەردەوامــە لەســەر ڕازیکردنــی پــەروەردگار ؟ وەڵام دایــەوە بەماناکەی: بەندەیەکی خواناس لە دەرونیدا، بەندەیەك کـە پەرۆشـی و گرفتـی گـەورە و مەبەسـتی گـەورەی خـودی خـۆی نـەبێت... بەندەیـەك کـە پابەنـدبێ بـە ڕازی کردنـی پەروەردگارەوە، گەر دەم بکاتەوە دەربارەی خودایە و گەر بـدوێ بـۆ خودایـە و گـەر بـێ دەنگ بێ لەگەڵ خودایە، ئەوە بەخوداو بۆ خودا... و لەگەڵ خودایە...

تۆ دەتوانی ئاو ها بژیت؟ بۆ پــەروەردگارت بـژیت... سـەرنج بـدە چـۆن بەختـەوەرت دەکات و ئەوماڵانەش کـە پـڕن لـە گرفـت ڕێنمونیـان دەکـات... دەی کەواتـە بـا بـۆ ڕازیکردنی پەروەردگار ڕاپەڕین بە دورکەوتنەوە لە تاوان و بەئەنجامـدانی گـوێ ڕایـەڵی و ملکەچی و بە گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی و بەچاکە کردن لەگەڵ دایکان و باوکاندا بـۆ ئەوەی خوای گەورە مان لێ ڕازی بێت.

هیوادارم بەم زوانە بە یەك بگەینەوە و پەروەردگارمان لێمان ڕازی بێت... أقول قـولي هذا و أستغفر الله لي ولكم وجزاكم الله خيرا والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته...

## پشت بەستن بەخودا

بۆ ئەوەی کە سەبارەت بە(پشت بەستن بەخودا) بـدوێین، پێویـستە سـەرەتا دەربـارەی یەکێك لە ناوەکانی پەروەردگار بدوێین کە بریتی یە لە(وکیل).

مانای ناوی پەروەردگار- وکیل - چی یە؟

## وكيل

ئەو زاتە کە بە میهری خۆی کار لە کاروبای بەندەکانیدا دەکات، بەوەی کە چاکیان بکات نەك خراپ.

ئەمە پێناسەیەکی ئەکادیمیانەی بیرياری بوو، بەڵام ئەی برایان ئەمەیە کە لە واقعی مرۆڤدا ڕوو دەدات، ئەمەیە کردەی خوای پەروەردگار بە خەڵکی، ئەو زاتە بە سۆز و میهری خۆی لە کاروباری بەندەکانیدا گۆڕانکاری دەکات و ڕێگە نادات سەرگەردان بن... لەبەرئەوە خوای گەورە هەرگیز زیان ناگەیەنێ هەموو کارەکانی بۆ تۆ چاکەیە تەنانەت ئەگەر ڕوکارەکەشی کۆسپ بێت...

ئایا تۆ کەسێکت دیوە کە کەسێکی دیکە بکات بە وەکیل و لەناوی بەرێت ؟ کەواتە چۆن دەیکەیتە وەکیل؟! وکیل هەرگیز بەندەکانی لەناو نابات... ئەم بێ گومانی یە پێویستە لەناخماندا چەسپاویێت هەر لەبەرئەوەیە کە سەیری پێغەمبەر(ﷺ)دەکەین کە هەموو شەوێ دەیفەرمو: ((لبيك ربي وسعيدك والخير كله لديك و الشر ليس إليك)) ئەی پەروەردگار لەلایەن تۆوە هەرچی چاکە نەبێت نایەت، ڕەنگە ئەمە ڕاڤەی ئەوەمان بۆ بکات کە گرفت و کۆسپەکان چۆن ڕوو دەدەن بەم شێوەیە و بەو شێوەیە و، پاشان لە کۆتایی یەکەیدا دەبینین کە بۆ ئێمە چاکەن، بۆ نمونە کەسێك بەوە تاقی دەکرێتەوە کە کوڕێکی دەمرێ، ئەو وا دەبینێ کە ئەم کوڕە بمایە لەنێو گوناه و تاواندا ون دەبوو وە دەبویە یەکێك لە ئەهلی دۆزەخ، بەڵام بە مردنی ئەو دایك و باوکی زیاتر وزەی خۆیان لە پەرستنی خودا بەکاردێنن و ئەویش لێیان ڕازی دەبێت، ئەو کوڕە لە فیردەوس پێیان دەگات و لە تەواوی خێزانەکە ڕازی یە، هەندێ کەس وایان زانیوە کە خوای گەورە خراپەی ئەوانی دەوێ، بەڵام سوێند بەخوا خوای گەورە جگە لەخێر و چاکەی ئەوان هیچی دیکەی ناوێ... ئەمە نمونەیەکی زۆر سادە بوو کە دەکرێ بەهۆیەوە ئێمە لەوە بگەین کە وەکیل نابێت بەندەکانی لەیاد بکات و ناشکرێ کە خراپەی ئەوانی بوێت و بەرەو خراپە بەرێیان بکات... ئەی برایان بۆ ئەوەی کە تێبگەین چۆن پشت بە خودا ببەستین نمونەیەکی جوانتان بۆ دێنمەوە، ئایا پێشتر چویت بۆ بانکی عەقاری ؟ بێ گومان بەڵێ ڕۆیشتوی،

دڵنیام لەوەی کە کەسێکن، تۆ هەستاوی بەوەی کە گرێ بەستی ئەو وەکیلی یە ئیمزا بکەیت ئایا تاوێ گومانت بردوە بەوەی کە دەبێتە وەکیلت ؟ بێ گومان نەخێر، ئەگەرنا نەتدەکرد بە وەکیلی خۆت، لەسەرتادا کاتێ کە تۆ ئیمزات کردوە لەوپەڕی متمانەیدا بوویت...

ئەی بۆچی لەهاوشێوەی ئەو گرێ بەستە لەگەڵ پەروەردگاری باڵا دەستدا ئیمزا ناکەی، بۆ نایکەیتە وەکیلی خۆت ؟ ئێمە پێی دەڵێین: بەهەمو کاروبارەکانمانەوە بە تۆ گەیشتووین، تۆ بەرپرسی لە ژیانی ئێمە...

## کێ دەتپارێزی لەمن؟

پیاوێك دێتە لای پێغەمبەر(ﷺ) کە لەو کاتەدا بەرێزی نوستبووە و شمشێرەکەی هەڵواسیبووە بە دارێکدا، ئەو دەشتەکی یە بێ باوەڕە دەیەوێ پێغەمبەر(ﷺ) بکوژێت، شمشێرەکە لەسەر دارەکە دادەگرێ دەیخاتە سەر گەردنی حەزرەت و ئەویش لەخەو ڕادەبێ شمشێرەکەی دەبینێ کە بە دەستی پیاوێکەوەیە و لەسەر گەردنیەتی و پیاوەکە پێی دەڵێت: کێ لە من بەریگریت لێ دەکات ؟! پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (الله) لەو کاتەدا شمشێرەکە لە دەستی ئەو پیاوە دەکەوێتە خوارێ لە بەهێزی ئەو وشەیە و ڕاستگۆیدا، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) شمشێرەکە دەبات بە پیاوە دەفەرموێت: ئەی تۆ کێ لە دەست من بەرگریت لێ دەکات).[1]

ئەوەی کەمن دەمەوێ پێی بگەم ئەی برایان... ئەوەیە ئایا ئێمە ئەو متمانە و ئەو پشت بەستنەمان هەیە ؟ ئایا ئێمە پشتمان بە خودا بەستووە، کە ئابەم شێوەیە بێت؟! ئەی برایان لێرەدا دوو چین مرۆڤ هەیە:

چینێکی ئیمان لاواز... کاتێ کە هۆکارە دونیایی یەکان دەبینێ دوای دەکەوێت ئارامی لێ دەبڕێ، مەبەستمان لەو هۆکارانە، خۆشیە دونیایی و مادی یەکانە وە هەر کاتێ کە هۆکارەکان دوا کەوتن ئەو بێ گومانی(یقین) بەخودا کەم دەبێتەوە.

---

١ـ بوخاری و مسلم لە جابری کوڕی عبد الله وە ریوایەتیان کردوە.

چینێکی ئیمانداری ڕاستگۆ... هەر کاتێ کە دونیا پشتی تێدەکات و دەڕوات بێ گومانی بەخودا زیاتر دەبێت بۆچی؟ لەبەرئەوەی کە لێرەدا هۆکارەکان هەبن ئەوا تۆ بۆ کەمێکیش بێت مەیلی دونیا دەکەیت، بەڵام کاتێ کە هۆکارەکان لێت دادەبڕێن جگە لە پەروەردگار هیچ کەسێکت بۆ نامینێتەوە.

## وەکیل هەرچۆن بیەوێ هەڵس و کەوت دەکات

**براکانم:**

هەندێ جار دونیا بەتەواوی تاریك دەبێت و تەواوی دەروازەکانی دادەخرێن وەك ئەوەی کە بیەوێ جگە لە دەرگای خۆی هیچ دەرگایەك نەمێنێ... ڕەنگە بانگەوازی پێغەمبەر(ﷺ) نمونەیەك بێ بۆ ئێمە لەسەر ئەوە... کاتێ کە ئەشکەنجەی بێ باوەڕان لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) زۆرتر بوو کۆسپی گەورە ئەم ئەشکەنجەیان لەسەر تێکدان، کۆسپێك لەدەرەوەی ماڵەکەی کە ئەبوو تالبی مامی بوو کەبێ باوەڕان لێی دەترسان، وە کۆسپەکەی دیکە لە نێو ماڵەکەیدا بوو کە ئەویش خەدیجە (رضي الله عنها) خێزانی بوو کە ئەشکەنجە و ئازارەکانی سەرشانی سوك دەکرد.

بەڵام پەروەردگار ویستی هەردوکیان لەیك ساڵدا بمرن و تەنها دو مانگ نێوانیان بوو، ئەوە وەکیلە کە هەر چۆن بیەوێ هەڵس و کەوت دەکات، ئەوان پاش پەرەسەندنی بانگەواز و تەواو بوونی بنەماکانی ئیسلام کۆچیان نەکرد، بەڵکو پەروەردگار ویستی وابوو کە لە کاتێکدا کۆچی دوایی بکەن کە پێغەمبەر(ﷺ) زۆر پێویستی پێیان بوو... هەروەك ئەوەی کە پەروەردگار پێی بفەرموێ کە جگە لە من ( الله) کەس وەکیلی تۆ نیە پێغەمبەر(ﷺ) چی کرد؟ ئەو هەوڵێکی زۆری داو ١٠٠کم بەپێ پێوزەکانی ڕێی کرد... هەتا ئەهلی تائف بانگ بکات و وەك ئەوەش بەخودا بڵێت من تا کۆتایی ڕێگەکەم پشتم بە تۆ بەستوە و من ڕازیم بەوەی کە تۆ دەیکەیت.

## تۆ چیتە بە دوو کەسەوە، کە سێ یەمیان الله یە!

گەر ویستت بە ڕاستی مانای پشت بەستن بزانیت، ئەوا سەیری بەسەرهاتی کۆچ کردنی پێغەمبەر (ﷺ)بکە کە بەڕاستی مانای پشت بەستنمان بۆ ڕون دەکاتەوە بەدەست پێوەگرتنی هۆکارەکان.

پێغەمبەر(ﷺ) لە کۆچەکەدا, یانزە هۆکار دونیای گرتە بەرو هیچ پلانێکی دروستی پشتگوێ نەخست و هەمووی ئەنجامدا.

لە کاتێکی درەنگانی شەودا لە ماڵەکەی چویە دەرێ هەتا بێ باوەڕان هەستی پێ نەکەن، پاشان لە نیوە ڕۆدا چویە ماڵی ئەبو بکر و ئەویش دەفەرموێ: کاتێك هات بۆ ماڵمان کە ئێمە چاوەڕێمان نەدەکرد هەتا سەر لە قورەیشی یەکان بشێوینێ و هەواڵی کۆچ بداتە ئەبو بکر ئەوان لەنێو دەلاقەیەکەوە هاتنە دەرێ کە لەبەشی دواوەی ماڵەکەدا بوو(دەرگای پشتەوە)و، پاشان بەرەو باشوور ڕێگیان گرتەبەر لەگەڵ ئەوەی کە مەدینە لەلای باکوری مەککەوە بوو، هەتا ئەو بێ بڕوایانەی کە ڕێگەی باکوریان دەپیوا بەرەو مەدینە نەیان دۆزنەوە، پاشان لە ئەشکەوتی (ثور) سێ ڕۆژ بۆ زیاتر ڕێکخستنی کارەکان مانەوە و عبد الله کوڕی ئەبو بکر هەواڵی قورەیشی بۆ دەهێنان و ئەسمای کچی ئەبو بکریش خواردن و خواردنەوەی پێ دەگەیاندن .

سەیری ئەم پلانە دروستە بکە... کەس لە بێ باوەڕان پێ ی وانەبوو کە ئافرەتێك خواردن و خواردنەوەیان بۆ بهێنێ ئەگەرچی کچی ئەبو بکریش بێت، هەروەها نەدەبوو، کە ئەوان هەست بەوە بکەن، چونکە ئەو تەنها دوو مانگی مابو کە منداڵی ببێت.

## ئایا دیتتان، کە پلانی پشت بەستن بەخودا چۆنە؟!!

ئەی سەبارەت بە شوێنەواری پێ یەکان چی ؟ ئەبو بکر عبد الله ی کوڕی فەهیرەی شوانی ناردو مەڕەکانی بە شوێن پێ یەکانی ئەسمای کچیدا تێدەپەڕی وەك ئەوەی کە مەڕەکانی دەلەوەڕێنێ و کەس شکی پێ نەکات.

بەڵام پاش ئەم هەموو پلانە ئایا بێ باوەڕان پێیان گەیشتن، یان نا ؟ بەڵێ، پێیان گەیشتن، ئایا نەگەیشتنە بەردەم ئەشکەوتەکە؟ وەك ئەوەی کەلە ناختەوە بیلێی؟! ئایا پاش نەخشەسازی ئەم هەموو پلانە شتێکی باوەڕ پێ کراو نی یە کە بلێین کە نابێ پێیان گەیشتبن؟؟!! نەخێر... ئەمە لە مەنتقی مرۆیی دایە، بەڵام بە مەنتقی وکیل(پەروەردگار) ویستی کەپێیان بگەن... هەتا پێغەمبەر(ﷺ)و ئێمەش بە تەواوەتی لەمانای پشت بەستن بەخودا بگەین، بەرێ کردنی هۆکارەکان لەگەڵ پشت بەستن بە پەروەردگار هۆی دەربازبوونە...

بێ باوەڕان دەگەنە بەردەم ئەشکەوت، ئەبوبکر(ﷺ) بە پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرموێ گەر یەکێکیان سەیری ژێر پێی خۆی بکات ئەوا دەمانبینێ پێغەمبەر(ﷺ)یش وەلامی دەداتەوە و دەفەرموێ ڕات چۆنە بەرامبەر دووکەس کە سێ یەمیان خودا بێت، نیگەران مەبە ئێمە خودامان لەگەڵدایە).

## پشت بەستن لەگەڵ کەمی کەرەستەدا

گەر بگەڕێینەوە بە مێژوودا لە کاتێکدا کە ئێمە باس لە پشت بەستن دەکەین... هەمیشە ئەوە بەدی دەکەین کە موسڵمانان لەغەزا و جەنگە ئیسلامیەکاندا کەمترین ژمارەیان هەبووە لە ڕووی ژمارەی جەنگاوەران و کەرەستەشەوە، ئەگەر چی لە غەزای بەدر، یان ئوحود، یان موئتە و تەنانەت لە جەنگی ئۆکتۆبەریشدا... و ڕەنگە ئەوەیکە ئێستا ئێمە تێیدا بین لە میسر لەناز و نیعمەتی ئیسلام و هەمووی لە تەرازووی چاکەی عەمری کوڕی عاصدایە کە داوای لە عومەری کوڕی خەتاب(ﷺ) دەکات، کە ٤ هەزار کەسی بۆ ڕەوانە بکات بۆ پاکسازی میسر و ئەویش لەبری هەر هەزار پیاوێ یەك کەڵە پیاوی بۆ دەنێرێ، کە (زوبێری کوڕی عەوام و میقدادی کوڕی ئەسوەد و عوبادی کوڕی صامت ومسلمە کوڕی موخەللەد) بوون ئەوان لەبەرەبەیاندا چونە نێو سوپاکەو بە متمانە بوون بە پەروەردگار فەتحی میسر کرا...

ئێستا ئێمە منداڵێك دەبینینین کە بە بەردێکەوە کە سەربازێکی جولەکە بە ڕەشاش و زرێ پۆشێکەوە لێی هەڵدێ، ئەم منداڵە پشت بەخودا دەبەستێ و متمانەی تەواوی پێ یەتی بۆیە ئەو سەربازە ملهوڕە لە دەستی هەڵدێ...

## ئایا پشت بەستن بەخودا لەگەڵ نزادا دژی یەکن؟

واتە کاتێ کە من لە کارێکدا پشت بە خودا دەبەستم و، پاشان لە خودا دەپاڕێمەوە لە نوێژەکانمدا ئایا ئەمە بە ئیمان لاوازی دادەنرێ؟، یان پێویستە من لە خودا بپاڕێمەوە تا ئەم کارەم دەستەبەر بێت؟!

ئەی براکەم وریای مانای پشت بەستن بە، پێویستە لەگەڵ بەرێ کردنی هۆکارەکانـدا دڵ و دەرونت تەسلیم بە پەروەردگار بن، نزاش لە هۆکارەکانن بۆیە لە خودا دەپارێینــەوە، لەبەرئەوەی کە بەمە فەرمانمان پێ دەکات تا لە هەموو دەرگاکـان بـدەین و کێـشەکانمان چارەسەر بکەین...

برایان لەبەر ئەوە: ناکرێ خوێندکارێك بۆ نمونە ماوەی ساڵێك وانە نەخوێنێ و، پاشـان بێت و بڵێ: من پشت بە خودا دەبەستم !! ئەی برایان ئەم واتایە چەند بـەرز و بـەرێزە بـۆ یەکێ لێی تێبگات.

## چەند نمونەیەك لە وانەی کە پشتیان بە خودا بەستوە

حسبی الله ونعم الوکیل

پێغەمبەرمان ابراهیم(عليه السلام) تەمەنی١٦ساڵان بوو، کە تەواوی شارەکەی تۆمــەتباریان کرد بە تێکشکاندنی بتەکان، ابراهیم(عليه السلام) کۆت و بەند دەکرێت، تـا فـرێ بدرێتــە نێـو ئــاگرەوە، بــەڵکو ئــاگرێکی ئاســایی نــەبوە: ﴿ قَالُواْ ٱبۡنُواْ لَهُۥ بُنۡيَٰنٗا فَأَلۡقُوهُ فِي ٱلۡجَحِيمِ ﴾ الصافات: ٩٧.

ئایا دیتتان کە دەیانەوێ چی بکەن بەم منداڵە چکۆلەیە، بەڵێ ئەو ئاگرەیان بۆ سازداو قسەی ناشیرنیان پێ دەوت و ئازاریان دەدا ئیبراهیم جگە لە یەك پەیڤ (حسبی الله ونعـم الوکیل) هیچ دیکەی نەدەوت.

ئەمە بریتی یە لە گرێ بەستی پشت بەسن... بەڵێ، ئایا تـۆ گـرێ بەسـتێکت ئیمـزا کردوە ئەی ابراهیم؟؟ ئایا کاری خۆت داوەتە دەست وەکیلێك ؟؟ کەواتە وەکیل هەرگیز لە یــادت ناکــات!! ئــەوان واتــە بــێ بــاوەڕان مەنجــەنیقیان هێنــا کــە ئامێرێکــە وەك ئامێری(سوستە) وایە ڕادەکێشرێ بۆ دواوە و لەکاتی تەقانیدا ئاگرەکـە دەکاتـە ئامــانجی خۆی... یا الله لە مێژوودا مردنێك نی یە لەم مردنە دڕندانەتر !! ابـراهیم دەخرێتــە نێـو مەنجەنیقەکەوە و بەردەوام ویردەکەی خۆی دەڵێتەوە، کە بریتی یە لـە (حـسبی الله ونعـم الوکیل).

ئایا تۆ ئەم متمانەیەت هەیە؟ ئایا تۆ ئەم پشت بەستنت هەیە، یان تۆ لە هیچ گرفتێ ناترسیت؟ بۆچی بە کێشەکانتەوە ڕوو لە خودا ناکەیت کە هیچ گوناهێکی تۆی تێدا نی یە ؟ فلاَن کەس بەو شێوەیە نەخۆش کەوت، فلاَن کیژ ئەوەی لێ ڕودا.. پشت بەخودا ببەستە، جگەلەوەی کە بڵێی (حسبی الله ونعم الوکیل) چیت پێ دەکرێ؟

دەگەڕێینەوە بۆلای ابراهیم پێغەمبەر، ئەو(ﷺ) دەخرێتە نێو مەنجەنیقەوە و لەم کاتەدا جبریل(ﷺ) دێت و پێ ی دەفەرموێ: ئەی ابراهیم پێویستیت بەهیچ نی یە؟

سوێندت دەدەم بە خودا تۆ بایەی چیت وەلاَم دەدایەوە؟

ابراهیم فەرموی: بەتۆ نەخێر، بەلاَم بە پەروەردگارم بەڵێ: (حسبی الله ونعم الوکیل)

بەلاَم هەندێ جار وەکیل لە گرفتەکە دەگەڕێ هەتا دەگاتە لوتکە و چڵە پۆپە بۆ ئەوەی لە پاش ئەوە توانای خۆی دەربخات، پەروەردگار دەیتوانی ئاگرەکە بکوژێنێتەوە و کۆتایی بە کێشەکە بهێنێ، بەلاَم خودا ویستی ئەوان پلانەکەیان تەواو بکەن و ابراهیم فرێ بدەنە نێو ئاگرەکەوە و خەڵکی شارەکە هەڵهەلە لێ بدەن و گۆرانی بڵێن و بڵێن: (کۆتایمان هێنا بە ابراهیم) ئەوان چاوەڕوانی ئاکامی کارەکەیان دەکەن هەتا پاش کپ بوونەوەی ئاگرەکە ابراهیم بە خەڵوزی بەدی دەکەن.

پاش سێ ڕۆژ... ابراهیم لەنێو ئاگرەکە دێتە دەرێ... بە شێوەیەك دێتە دەرێ کە ئاگرەکە هیچی پێ نەکردوە، تەنها ئەوە نەبێ کە کۆت و بەندەکەی کراوەتەوە، ئەو دێتە دەرێ بەدەست و پێ کراوەیی و، پاشان ابراهیم(ﷺ) زیاتر لە سەد ساڵ ژیاوە لەکاتی مردنیدا لێیان پرسی کە خۆشترین ڕۆژانی ژیانت کامە بوون ؟ ئەویش دەفەرموێ ئەو سێ ڕۆژەی کە لە نێو ئاگرەکەدا بەسەرم برد...

ئەی برایانم وەکیل هیچ کاتێ لە بەندەکانی ناگەڕێت، بەلاَم گرنگ ئەوەیە کە تۆ ئەو متمانەیەت بە خودای خۆت هەبێت...

## لەنێو تاریكیدا هاواری كرد

لەنێو سكی نەهەنگ و لەنێو دەریا و لەنێو تاریكی شەودا یـونس ( علیـه الـسلام) ووشە كۆدەكاتەوە و ڕێكی دەخات... ئایا ئێوە ئەم هەڵوێستە لەم سێ تاریكی یە دێننـە پێش چاوی خۆتان؟! بێنە پێش چاوی خۆت یەكێك تـۆ لـەنێو شـوێنێكدا بەنـد بكـات و گوێت لێ بێ كلیلی شوێنێكە فڕێ بدات و، پاشان دەرگای ژوورەكە و خانوەكـەت لەسـەر دابخات و بڕوات... پاش چەند چركە تـۆ دەڕوخێـی ؟! لـە كاتێكـدا تـۆ لـەنێو جەرگـەی ژیاندایت... ئەی پێت چۆنە بەم شێوەیە لە قوڵایی دەریایەكدا بیت؟!

هیچ لە یونس نەوەشایەوە ئەوەنەبێ فەرموی: ﴿ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ الانبیاء: ٧٨.

دەست بەجێ... نەهەنگەكە دێتە كەناری دەریاكە و یـونس دێتـەگۆ و لـەنێو قـوڵایی دەریاكە دێتەدەرێ، بەڵام ئەو ڕاهاتبوو لەسەر تاریكی دەریا و نەخۆر و نە ڕوناكی نـەبوو، پـــەروەردگار دەفـــەرموێ: ﴿وَأَنۢبَتۡنَا عَلَيۡهِ شَجَرَةً مِّن يَقۡطِينٍ﴾الـــصافات: ١٤٦تـــا بۆجەستەی بێتە سایە...

چۆنە ئەم لێبوردنە ؟ئەم توانایە چۆنە ؟ ئەوە ئەو وەكیلەیە كە هەرگیز بەندەكانی لەیاد ناكات...

هەندێ كەس هەن پێیان وایە كە ووشـەی: (حـسبی الله ونعـم الوكیـل) بریتـی یەلـە پاڕانەوە لە یەكێك، بەڵام (حسبی الله ونعم الوكیل) واتە پەروەردگارا من تۆم كردە وەكیل چیت دەوێ هەر ئەوە بكە...

## كچانی عبدالله و سورەی ( الواقعه ):

عوسمانی كوڕی عەفان لەكاتی سـەرەمەرگدا چـویە لای عبـد الله ی كـوڕی مەسـعود كەسێ كچی هەبوو، عوسمان(ﷺ) بە إبن مـسعودی فـەرموو، فـەرمانمان داوە بـە دابـین كردنی خەرجی بۆ كچەكانت؟ ـ واتە خەرجیان بۆ دابین دەكەین- إبـن مـسعود فـەرموی:

کچەکانم پێویستیان بە پارە نی یە، عوسمان فەرموی: چۆن؟ ئەویش فەرموی ئەی ئـەمیری ئیمانداران، پێغەمبەر(ﷺ) فێری کردوم کە هەرکـەس شـەوانە سـورەی الواقعـە بخوێنـێ هەرگیز نەبونی و هەژاری ڕوی تێناکات، منیش کچەکانم فێرکـردوە کـە شـەوانە سـورەی الواقعە بخوێنن.

ئایا دەکرێ ئێمە ئەم متمانەیەمان هەبێ و بـەم شـێوەیە لـە منداڵـەکانمان دڵنیـابین؟ خەڵکی ئەمڕۆ لەنێو پەژارە و کەنەفتی دەرونیدا دەژین و نازانن گەر خودا بکەنـە وەکیـل ئەو گرفتانە، یان چارەسەر دەبێت...

## دۆخی دونیا دەگۆڕێت

سەیری چیرۆکی یوسف پێغەمبەر بکە، کاتێ کە دەبیـنین ڕوداوەکـان ڕێکخـراون پێـی سەرسام دەبین، ئەم کوڕە بابی زۆری خـۆش دەوێ، ئایـا ئەمـە کـارێکی خراپـە ؟! بـەڵام ئاکامی ئەمە ئەوەیە کە یوسف فڕێ بدرێتە بیرێکەوە (ئەمەش کارێکی خراپ و بـەدە) و دواتر لە ئاکامدا دەڕواتە نیو کۆشکی عزیزی میسرەوە، کە (شـتێکی باشـە) و ئاکـامی ئەمەش ئەوەیە کە دەخرێتە زیندانـەوە، کـە ( شـتێکی خراپـە ) دواتـر دەبێتـە عزیـزی میسرە، کە (شتێکی باشە) و بەم شێوەیە... هیچ شتێك بەو جۆرە نابێت کە ئێمـە پـێش بینی دەکەین... وەك ئەوەی کە خوای گەورە فێرمان دەکات کە ڕوداوەکانی دونیا ملکەچ بە ویستی خودان چۆن بیەوێ هەر بەو شێوەیە، یان پێ دەکات، ئـەوەی کـە تـۆ بەچـاکی دەزانی دەبێتە مایەی خراپە، وە ئەوەی کە تۆ بە خراپی دەزانـی دەبێتـە مایـەی چـاکە، کارەکان هەموویان دەگەڕێنەوە بۆلای خـودا لەبەرئـەوە لـە هـەموو کارەکانتـدا بیکـەرە وەکیل.

# چەند چیرۆکێکی ڕاستەقینە

## بۆ ئەوەی کە ڕاست گۆبین

لاوێکی تەمەن ١٨ ساڵان هەبوو، کە زۆر تێگەیشتوو بوو ئەو خاوەن توانایەکی ناسروشتی بوو ئەمەش وای لێ کردبوو هەمیشە بەسەر بەرامبەرەکانیدا سەر کەوتو بێت، ئەم لاوە دوچاری نەخۆشی یەك بوو کە نەیدەتوانی هاوسەنگی جەستەی ڕابگرێت، کەس و کارەکەی بردیانە لای هەرچی پزیشکی جیهانە، بەڵام نەیان توانی نەخۆشی یەکەی دەست نیشان بکەن، من سەردانی ئەو لاوەم دەکرد و زۆر پێی ناڕەحەت دەبووم، ڕۆژێك دایکی پەیڤێکی زۆر جوانی پێ وتم، ووتی: ئێمە زۆر بەختەوەرین، کە پزیشکەکان ناتوانن نەخۆشی کوڕەکەمان دەست نیشان بکەن، منیش لێم پرسی بۆچی؟ ووتی: هەتا جگە لە خودا کەس نەمێنێتەوە هەتا ئێمە ڕاستگۆبین کاتێ بە پەروەردگارمان دەڵێین: پشتمان بە تۆ بەستوە ئەی خودایە.

خوشك و براکانم پشت بەستن واتایەکی دژوار نی یە، ئایا دەزانی مانای پشت بەستن چی یە؟ پشت بەستن بریتی یەلەوەی لە دونیادا بە ئەندامەکانی جەستەت هەوڵ بدەیت، بەڵام ئیمانت بەوە هەبێ کە جگە لە خودا کەس نی یە بتوانێ سود و زیانت پێ بگەیەنێ.

واتە... تۆ دەزانیت چارەسەری کێشەکەت لای کەسێکە و دەچیتە لای و داوای لێدەکەیت لەو گرفتە هاریکاریت بکات، بەڵام لە ناختدا ئەوەش دەزانی کە پەروەردگار بۆت چارەسەر دەکات واتە تۆ بەجەستە هەوڵ لەگەڵ خەڵکیدا دەدەیت و بەدڵت لەگەڵ خودا، ئەمە ئەو پشت بەستنەیە کە پەروەردگاری باڵادەست لێمان دەیەوێ....

پشت بەخودا ببەسن... هەرکاتێ کە ئێوە چاك بوون لە پشت بەستنتان بەخودا ئەوا لە کارەکاندا ڕاستگۆن و خوداش ڕێزتان لێ دەگرێ و سەرفرازتان دەکات.

## ملکەچی کەسێك ناکرێت کە لەسەرپێچی کردنی پەروەردگاردا بێت

کیژێك بەسەرهاتی خۆی دەگێڕێتەوە و دەبێژێ: من کیژێکم تەمەنم ٢٣ ساڵە... لە زانکۆی ئەمریکا خوێندکارم من نە زۆر پابەند و نەزۆریش لادەر بووم و هەمیش لەم

نێوانەدا بووم خێزانەکەم ئاین پـەروەر و هەمیـشە پارێزکـاربوون، دایکـم ئـافرەتێکی زۆر بەڕێزە و باوکیشم هەروا بووە کە لە قۆناغی ئامادەیدا کۆچی دوایی کردوە و ماڵەکـەمان هەموی شڵەژا لەبەر ئەوە هەر لە منداڵیمەوە کە پێگەیشتوم نوێـژم کـردوە و دەزانم چـی پەروەردگارم پەست دەکات و چی ڕازیی دەکات.

من لەو زانکۆ ئەمریکی یەدا لەنێو کێشەیەکی زۆر گەورەدا دەژیام بەجۆرێ کە من لە کۆمەڵگایەکی جیاوازتر بووم کە زۆر باش و زۆر خراپیشی تێدایە، بەڵام چینی ناوەنـد زۆر کەمە و منیش یەکێك بووم لەو نێوەندەدا وە من زۆر کات لە مزگـەوتی زانکـۆدا نوێـژم دەکرد، زۆر بیرم لە پۆشینی حیجاب دەکردەوە، بەڵام بۆچونی خێزانەکەم بۆ ئەم مەسـئەلە یە زۆر جیاواز بوو، ئەوان دەیان دی کە من هێشتا کیژێکی ڕۆشنبیر و بـەڕێز بـووم و لــە خوا دەترسم، پۆشینی حیجاب بۆ من پێویست نی یـە، بـە تایبـەتی دایکـم و خوشـك و براکانم لە بوارێکدا کاریان بۆ من دەویست، کە ڕێگری لە حیجاب دەکات.

ڕۆژێك چومە نێو مزگەوت و پاش ئەوەی بۆ ماوەیەکی دور و درێژ نوێژم کـرد، ئەمـە کارێکی زۆر باش بو لە نوێژەکەمدا بیرم لە خۆم کـردەوە کـە چـۆن بـەبێ حیجابـەوە لـە مزگەوت دەچمە دەرێ، من ئیماندارم و پەروەردگاریش ئافرەتی ئیمانداری بـە خـاوێنی و داوێن پاکی خولقاندوە، ئەم بیرکردنەوەیە وای لێ کردم کە ڕازی بم بەوەی کە پێویستە بەم شێوەیە بمێنمەوە و بچمە بەردەم خودا، گەڕامەوە بۆ ماڵ و هەموو هیوایەکم ئەوە بوو کـە دایك و خوشکەکانم لە کۆشم بگرن و پیرۆز بایم لێ بکەن... دایکـم لـە دەرەوە بـوو واتـە لەماڵ چوو بویە دەرێ من لە ڕێگەی تەلەفۆنەوە پەیوەندیم لەگەڵ گرت و پێم ووت کە من شتێکی چاوەڕوان نەکراوم بۆتۆ پێ یە.

بەڵام بەداخەوە، کاردانەوەیەکی زۆر دڕندانە و ناشیرینم دیت حەرام بێ لێت تۆ هێشتا هەر منداڵی...

من زۆر دەترسام کە دایکم فشارم بۆ بهێنێ و حیجابەکەم پـێ لا ببـات، لەبەرئـەوەی کەمن زۆر قەناعەتم بەو حیجابە هەبوو وە بەڕاستیـشم دەزانـی، بـەڵێ هـەروابوو دایکـم هەستا بە دڕاندنی پەرتوکەکانم و ڕێگەی چون بۆ زانکۆی لێ گرتم، لای پوریشم دەری کردم هەتا چی دی ئەو پۆشاکە نەپۆشم بەهۆی ئەم بابەتەوە لەنێو گێژاوی چەندین کێشە لەگـەڵ

دایکم و خوشکەکانم مامەوە، من ئەو کاتە هەستم بە ون بوونی خۆم و سوکایەتی پێ کردنم دەکرد، تەنانەت هەموان پێیان دەوتم لەبەر ئەوەی کە دایکت لێت پەستە پەروەردگار ئەو حیجابەت لێ پەسەند ناکات و هیچ کارێکت دیکەت لێ وەرناگرێ... من هەستم بەسەرگەردانی و لەناوچوون دەکرد، ئایا هەموو ئەوانەی کە خۆم لە پێناویدا کردە قوربانی، ئایا هیچ نرخ و بایەخێکیان نیە وە نەم دەزانی جودای بکەمەوە کە ئایا من لەسەر ڕاستم، یان نا؟ ئایا دڵی دایکم ڕازی بکەم و لە حیجابەکەم بگەڕێم لە کاتێکدا کە من دەزانم ئەمە خودام لێ پەست دەکات؟ وەیان پابەند بم پێیەوە لە دەرەوەی ماڵەکەم بمێنمەوە، وە ژیانی زانکۆ و خەرجیم لەخۆم قەدەغە بکەم؟...

ڕۆژگار تێدەپەڕی و فشارەکان زۆرتر دەبوون و هاوڕێکانم زیاتر هێرشیان دەکردە سەرم... من چۆن بەبێ ئاگاداری دایکم بۆ ماوەی٢ ساڵ بە موحەجەبەیی مامەوە بەتەنهاو لەدەرەوی ماڵەوە، من حیجابەکەم لە جانتاکەم دەشاردەوە لە ئۆتۆمبێلەکەدا دەم پۆشی و بە درێژایی ڕۆژگار لەدەرەوە دەمامەوە هەتا دایکم پێم سەرسام بوو وە پرسیاری لێ کردم دەربارەی گۆڕانی شێوەی پرچم و پۆشینی جل و بەرگی فراوان و گۆڕانی شێوازم، ئەو بەردەوام هێرشی دەکردە سەرم تا ئەو کاتەی حیجابەکەم ئاشکرا کرد، ئەو دەمە پێیان ووتم کە تۆ منافقی، من بەم کارەم ڕویەکی خراپی ئیسلام نیشان دەدەم و کاتێ کە دایکم بەمەی زانی فشاری خستە سەرم تا حیجابەکەم دیسان لابرد ئا لەو کاتەوە ژیان بە تەواوی شێوا، لەبەرئەوە متمانەم بە هیچ شتێك و بڕیارێك نەما کە دەری بکەم، هەستم دەکرد کە من بێ جل و بەرگم و من دوو کەسایەتیم هەیە و خوای گەورەش لۆمەم دەکات کە ناتوانم بەرگری لە ڕاستی بکەم وە لەدەرئەنجامی ئەم کۆسپە گەورەیە هەژانی متمانەم بە دایکم و خۆشکەکانم من دەستم دایە کۆمەڵێ کرداری پێچەوانە و بە پابەندی نەمامەوە، من بۆ ئەنجامدانی ئەم کردارانەم هەستم دەکرد کە گوناهبارم، لەبەرئەوەی کە من لێیان ڕازی نەبووم، بەڵام ئەمە تەنها هەستێك بوو، چونکە من کەسێکم نەدەدی کە پشتیوانیم لێ بکات، پاشان قۆناغی زانکۆم تەواو کرد، لەو بوارەدا کارم کرد و هەندێ جار گریانێکی زۆر و دابڕان لە دونیا یەخەی پێ دەگرتم.

من داوا لە هەموو دایکان وباوکان دەکەم کە هاوکاری ڕۆڵەکانیان بکەن، من ئامۆژگاری برایان دەکەم بەتایبەتی، چونکە کاریگەریان لەسەر خوشکەکانیان زۆرترە.

## گەڕانەوەی هەموو کارەکان بۆلای خودایە

ئەمە مانای ئەو پشت بەستنەیە، کە پێویستە فێری بین و پێویستە لەناخماندا جێگیر بێت لەبری ئەو غەم و پەژارەیی یەی، کە کۆنترۆڵی لاوان دەکات لە تەمەنی٢٠ ساڵیدا لە ترسی ژیانی داهاتوو، پشت بەخودا ببەسە و هۆکارەکان لەدەست مەدە، بەم ئاسانی یە زۆرێك لە گرفەکانت چارەسەر دەبێت و هێز و بتەویەکت چنگ دەکەوێ بۆ ڕوبەڕ و بونەوەیان.

خوازیارم لە خوێنەران کە سور بن لەسەر پشت بەستن بە خودا, هۆکارەکان بەڕێ بکە و ئەو کارانەی کە پێویسە ڕایان پەڕێنی بەجێیان بهێنە و گرێ بەستی وکالەت لەگەڵ پەروەردگارت ببەسە بە پەیڤی (حسبی الله ونعم الوکیل) إن شاو الله پەروەردگار هەرگیز شەرمەزارت ناکات...

## شەرم: الحیاء

باس لە یەکێك لە ڕەوشتەکان دەکەین کە کاریگەری یەکی زۆری لەسەر تاك و خێزان و کۆمەڵگە هەیە . کەسێك نی یە لەسەر زەویدا و پێویستی پێی نەبێت، وە هیچ خێزانێ نی یە هەر پێویستە تیادا دامەزراو بێت، کۆمەڵگەش نی یە کە بەبێ ئەو بتوانێ بژی، گەر ئەم ڕەفتارە لەدەست بدەین زۆرێك لە توێژی لاوانمان لەدەست دەچێت، هەروا ئە گەر ئەم ڕەفتەمان وون کرد لە نێوانماندا ئەوا زۆر شت لەدەست دەدەین، ئایا زانیمان ئەو ڕەفارە چی یە ؟ ئەو ڕەفتارە شەرمە...

پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی شەرم بۆمان دەدوێ با چاوێك بە پەیڤەکەیدا بگێڕین کە چەندین واتەی جوانی لێ بەدی دەکرێت ( باوەڕ شەست و شتێکە، یان حەفتاو شتێك لقە، بەرزترینیان ووشەی لا الە الا الله و نزمترینیان لا بردنی دڕکێکە لەسەر ڕێگادا هەروەها شەرم بەشێکە لەباوەڕ)[1] (شەرم و ئیمان زۆر لێکەوە نزیکن، گەر یەکێکیان هەڵگیرا و نەما ئەوی دیکەشیان نامێنێت).[2]

---

١ـ بوخاری و مسلم لە ئەبو هریرەوە.

٢ـ ابن عمر لە جامع الصغیر.

(شەرم هەمووی چاکەیە)[١]

(شەرم تەنها بە چاکە دێت)[٢]

(ئەوەی کە مرۆڤەکان لە پەیڤی پێغەمبەرانی پێی گەیشتوون ئەوەیە گەر شەرمت نەبوو چی دەکەیت بیکە)[٣]

## هەموو ئاینێ ڕفتارێکی هەیە ڕەفتاری ئیسلامیش شەرمە[٤]

ئایا ئەم چەند فەرمودەیەی پێغەمبەرتان(ﷺ) دیت کە تیایدا نرخی شەرمان بۆ ڕون دەکاتەوە و باس لە کاریگەری شەرم دەکات لە کۆمەڵگادا، بەڕاستی پێغەمبەر(ﷺ) پێشەنگی ئێمەیە لەم ڕەفتارەدا ئەو زۆر شەرمن تر بووە لە کچ لە کاتی نوکێنیدا).[٥]

زۆر فەرمودەی پێغەمبەر(ﷺ) هەن کە جەخت دەکەنەوە سەر ئەو ڕەفتارەی لەنێوماندا وون بوە و زۆرێکیش لە لاوان وونیان کردوە.

## بۆچی شەرم بەتایبەتی؟ ئەی کوا لقەکانی دیکەی ئیمان؟

خوشك و براکانم مەبەست لەمە ئەوەیە کە شەرم تەواوی لقەکانی دیکە کۆنترۆڵ دەکات وەك ئەوی کە پێغەمبەر(ﷺ) لە کۆی پەیڤەکانیدا هێناویەتی ئەو تا کە وشەیەك دەفەرموێ کە هاوکاریت دەکات لەسەر کۆنترۆڵ کردنی لقەکانی دیکەی ئیمان کە بریتی یە لە شەرم، تۆ گەر شەرمت هەبێت درۆ ناکەیت، هەروەها گەر شەرمت تێدا بێت ئەوا هەرگیز بە خراپە باسی کەس ناکەیت، گەر شەمت هەبێت ئەوا ئازاری دایك و بابت نادەیت، گەر شەرمن بیت واز لە نوێژ ناهێنی، گەر شەرمن بیت شانازی بە دروشمەکانی ئاینەکەت دەکەیت...

---

١ـ عمران کوڕی حصین لە طبرانی و سنن ابی داود.

٢ـ بوخاری و مسلم لە عمران کوڕ ی حصین.

٣ـ صحیح بوخاری و مسندی إمام احمد.

٤ـ ابن ماجە و طبرانی.

٥ـ بوخاری و مسلم و إمام أحمد لە مسندەکەیدا.

## مانای شەرم چی یە؟ پەیوەندی نێوان شەرم و ژیان چی یە؟

لەڕاستیدا پەیوەندی یەکی سەرسوڕهێنەر لە نێوان شەرم و ژیاندا هەیە هەر کاتێ کە شەرمت زۆر بوو ژیانت باشتر دەبێت، تەواوترین کەس لە ژیاندا ئەو کەسەیە کە شەرمی تەواوی هەبێت...

خوشك و براکانم شێوازەکانی شەرم زۆرن و لەبەر زۆریان نزیکە کە ئاین هەمووی بێتە شەرم هەروەك زانایان وایان گوتویە بۆ پشت ڕاستکردنەوەی ئەو فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ)، کە دەفەرموێ: (هەر ئاینێ ڕەوشتێکی تایبەتی خۆی هەیە و ڕەوشتی ئیسلامیش شەرمە).

### شەرم چی یە؟

شەرم وەك ئەوەی کە زانایان پێناسەیان کردوە ڕەفتارێکە کە دەبێتە هۆی دورکەوتنەوە لە خراپە ئەگەر چی کەسیش نەتبینی ئەمە پێناسەی شەرمە: سۆزێکە دەرونی پێ دور ئەکەوێتەوە لە بێ ئابڕوویی، کاتێ کە خۆت دەبینی کە ناتوانی کارێکی خراپ بکەیت بزانە ئەوە شەرمە کە ڕێگەت پێ نادات.

## جیاوازی چی یە لە نێوان شەرم و (الخجل: شەرمەزاری، یان تەریق بوونەوە):

زۆرێك پێیان وایە، کە (الخجل) شەرمە، یان بەشێکە لە شەرم، بەڵام لە ڕاستیدا (شەرمەزاری) پێچەوانەی شەرمە، زۆر جار تەریق بوونەوە هۆکەی کەمی یە لە کەسایەتی مرۆڤدا بەجۆرێ، کە هەست دەکات لە کەسانی دەوروبەری لاوازترە و ئەو ناتوانێ ڕوبەڕویان بێتەوە ئەگەر کارێکی هەڵەشی ئەنجام دابێت وە ئەمەش جودایە لە شەرم، شەرم: هەستێکی هەڵقوڵاوە لە هەست کردن بە بەرزیی و گەورەیی نەفس ئەو کاتە ناخی خۆم بە بەرز و بڵند دەبینم کە شەرمم بیخە ناو شتی کەم و بێ ڕێز. پیاوی بە حەیا شەرم دەکات لەوەی زینا بکات، یان درۆ بکات لەبەرئەوەی کە پێی باش نی یە لە نێو ئەو کارە نزمانەدا بێت، بەڵام پیاوی شەرمەزار گەر هەلێکی بۆ هەڵبکەوێ کە کارێکی وا بکات بێ ئەوەی کەسێك بەدی بکات ئەوا کارەکەی ئەنجام دەدات...

خوشك و براكانم بەڕاستی من زۆر كاریگەرم بە یەكێك لەگەورە كەسانی ئیسلام ئەویش كەسایەتی عوسمانی كوڕی عەفانە (ﷺ)، كە بە شەرمنی ناوبانگی دەركردوە بە جۆرێ كە پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵمان پێ دەدات، كە (لە زۆری شەرمنیدا فریشتەكان شەرمی لێ دەكەن).[١]

خوازیارم كە پەروەردگارم بە دیداری شادم بكاتەوە هەتا ئەو پیاوە ببینم كە فریشتە شەرمی لێ دەكەن، بەڵام ئەم پیاوە شەرمەكەی نەبوو بوویە هۆی ڕێگری كردن لە داواكردنی مافی خۆی بەڵكو داكۆكی لەمافی خۆی دەكرد و ئەمەش پێچەوانەی شورەیی یە.

من دەتانبەمە سەرخاڵێكی دیكە كە ئەویش ئەمەیە:

## ئایا شەرم لەگەڵ لە دایك بوونی مرۆڤەكاندا دێتە كایە، یان دەگرێ دەستەبەری بكەیت؟

بەڵێ خوشك و براكانم هەمومان لەسەر فیترەت لە دایك دەبین فەرمودەیەكی پێغەمبەر(ﷺ) هەیە كە تیایدا دەفەرموێ (زانیاری بە فێر بونەو ئارامیش بە ئارامگری یە).[٢]

هەروەك ئەوەی، كە پێغەمبەر(ﷺ) پێمان بفەرموێ كە هیچ ڕەفتارێك نی یە كە تۆ نەتوانی دەستەبەری بكەیت گەر ئارامت هەبێ فێری ئارامگری دەبیت وە گەر درۆزن بیت بە ڕاهاتن دەبیتە ڕاستگۆ وەگەر شەرمن نەبیت ئەوا بەمەشق كردن دەبیتە كەسێكی شەرمن، هەر ئەوەندە بەسە كە لە یارانی پێغەمبەر(ﷺ) فێربین كە دۆخی ئەوان لە پێش ئیسلامدا زۆر جودا تر بووە لە دوای ئیسلامیان، بەڵام كاتێ كە وابەستە بوون بە ئیسلامەوە ڕەفتاری ئەم ئاینەیان لە خۆ گرت.

---

١ـ إمام أحمد لە مسندكەی لە عائیشە (ﷺ) دەیگێڕێتەوە .

٢ـ لە جامع الصغیر لە نبو درداوە .

# چەند چیرۆکێکی ڕاستەقینە

**بەختەوەری ڕاستەقینە لەوەدایە کە ملکەچی خودای گەورە بیت و شەرمی لا بکەیت , شەرم کردن لە پەروەردگاریدایە**

من ناوم شەریفە... پێم خۆشە ئەزمونی خۆمتان لەو پەڕی لاری یەوە بۆ ئەو پەڕی ڕاستی بۆ بگێڕمەوە... لە ڕاستیدا من وەك زۆرێك لە لاوانی دیکە دەژیام، ژیانێکی بێ باکانە دەژیام، هەرچیم بویستایە دەمکرد ئەگەر چی لەهەر جێگایەکدا بوایە، ڕەنگە گەشەسەندنی یەکەمم تا ڕادەیەك ئیسلامیانە بویێ و کەس و کارم سوور بوون لەسەر ئەوەی کە من لەسەر پەروەردەیەکی پابەندی بە ئاینەوە گەورە بم و پێبگەم، من لەسەر خورەوشتی باشو سەقامگیری و پابەندی و پارێزگاری و بەردەوامی دان بە نوێژەکانم ڕاهاتم، تا ئەو کاتەی کە گەورە بووم و کەسایەتیم بە ئەنجامدانی چەند هۆکارێکی زۆر دەستی کردە گۆڕان لەوانە: خوێندن من لە قوتابخانەی زمانە جیاوازەکان بووم، قوتابی هەرچی یەکی بویستایە دەیکرد وەك سوکایەتی کردن بە مامۆستا و هەندێ جار لێدانی، جگەرەی دەکێشاو هاوەڵی کچانی دەکرد، بەڕاستی ئەمە بریتی بوو لە کەسایەتی خۆشەویست و زاڵ لە قوتابخانە بەم شێوەیە و بەم ڕێگایەدا لە قوتابخانە و زانکۆدا تێدەپەڕیم، هەرچیەك لە ڕاستی یەوە دور بێت و بە بیری ئێوەدا بێت من ئەنجامم دا کە بە جۆرێ ببێتە مایەی گرفت بۆ کەس و کارم و پۆلیس، لەم دۆخەشدا و لە ڕاستیدا ژیان هیچ چێژێکی نەبوو، زۆر دەترسام لەوەی کە خودا گیانم بکێشێ و من لە گێژاوی خەو دابم، ئەوا لەسەر تاوان و خراپە کاری و ئەو دۆخەی منی تێدام دەمرم...

پاش ئەمە چەند هەڵوێستێ ڕویان دا کەوایان لێ کردم بیر لە خۆم و ژیانم بکەمەوە... بۆ نمونە کارەساتێکی ئۆتۆمبێل لە خۆم و هاوڕێ یەکم ڕویدا و کارەساتەکە زۆر گەورە بوو، دەکراتیایدا بمرین و چەندین نەشتەرگەریمان بۆکرا، پاش ئەمە باوکم لەگەڵم دانیشت و ووتی: تۆ هیچ سوودت بۆ من نی یە، گەر بە چاکی بژیت ئەوا بۆخۆتە و گەر بە خراپیش بژیت ئەوا بەو شێوەیە دەڕۆیت، کە بەردەوامیت لەسەری، بەڵێ پاش ئەوە هەوڵم دا کە لێپرسینەوە لەگەڵ خۆمدا بکەم، هەوڵم دا کە بۆ ماوەی سێ مانگ پابەند بم، بەلام

کەسێك نەبوو لەسەر ئەم کارەم هاوکاریم بکات، هەمو هاوڕێکانم وەك خۆم وا بـوون، بـە پێچەوانەوە وایان لێ کردم کە جارێکی دیکە لەگەڵیان سەرگەردان بمەوە...

پاشان کۆمەڵێ ڕوداوی دیکە ڕویان دا وەك ئـەوەی کـە خـوای گـەورە چـەند ئاگـادار کردنەوەیەکم پێ بدات، یەکێك لە هاورێ هاوتەمەنکانم بە کارەسـاتی ئۆتۆمبێـل کۆچـی دوایی کرد یەکێکی دیکەیان لە پلیکانە کەوتە خوارێ و یـەکێکی دیکـەش بـە گاڵتـەوە خۆی کوشتبوو...

بەم شێوەیە هەر ماوەیەك و کەسێکی نزیکم لێ دەمرد، دیـتم کـاتی منـیش هاتۆتـە پێشێ پاش ئەوەی کە هاورێ یەکم بە خواردنەوەی چـەند بڕێکـی زیـاتر لـە مـادەی بـێ هۆشکەر مرد، ئەو لە هەموان بەهێزتر بوو کاتێ ئامادەی شیتەڵ کاری یەکەی بـووم کـە هیچ هەوڵ و هێزێك فریای نەکەوت پزیشکەکان سنگ و سەریان کردەوە ئەو نـە بـەرگری هەبوو نە وەڵامێك وە نەیدەتوانی هیچ لە خۆی بکـات ئـەم هەڵوێـستە هەژانـدمی و وام هێنایە پێش چاوم کە ئێستا گفتوگۆیەك لـە نێـوان ئـەو و فریـشتەی لێپرسـینەوەدا ڕوو دەدات بۆیە بڕیارم دا کە خۆم دەرباز بکـەم و پەنـد لـەم ئاگادارکردنەوانـە وەربگـرم کـە پەروەردگار بۆم ڕەوانە دەکات.

لەگەڵ هەندێ هاوڕێی پابەندمدا دەستم کردە دەرچون، ئەوان ڕۆژانی دوشەممە دەچون بۆ یەکێك لە مزگەوتەکان بۆ وانە خوێندن، من لە سەرەتادا بیرۆکەی ئەم وانانـەم لا پەسـەند نەبوو، بیرۆکەم سەبارەت بەم کۆمەڵە پابەندە باش نەبوو هەتا ڕۆژێك لـە گـەڵیان ئامـادە بووم....

ئەمە سەرەتایەکی ڕاستەقینە و گۆڕانێکی ڕیشاڵی بوو لە ژیانی مندا بـە پێـچەوانەی ئەوەی کە لە مێشکمدا بوو دەستم کردە ناسینی کۆمەڵێ لاوی پابەند، یەکەمین وانە کـە من ئامادەی بووم مامۆستایەکی جوان بوو، کە هەمیشە بزە لەسەر لێوانی بوو، چـەندین هەڵوێستی جوانی لەسیرە گێڕایەوە، ڕاڤەی فەرمودەی دەکردو، سەبارەت بە ڕۆژی دوایی و زیندوو بوونەوە و لێپرسینەوە دەدوا، ئەم شتانە زۆر گونجاو بوون لەم کاتەدا بۆ مـن و بـۆ بارودۆخی دەرونیم...

من زۆر بە ئاخاوتنەکەی کاریگەر بووم بۆیـە بڕیـارم دا کـەواز لـەم وانانـە نـەهێنم و تەواوی گفتوگۆکانی بەجێ بهێنم نەك هەر ئەوەی کە گوێی بۆ بگرم، پاش وانە خوێندنەکە هاوڕێکانم بەچەند لاوێکی دیکەیان ناساندم، دیتم ئەوانە کۆمەڵێکی زۆر نایابن و بەیـەك دەگەن و یاریش دەکەن و ئامادەی وانـە خوێنـدنیش دەبـن و نـانی ئێـوارەش لـە دەرەوە دەخۆن، من دیتم کە ئەمانە ژیانیان زۆر خۆشەو بەو شێوەیە ئاڵۆز نین کە مـن دەمزانـی، ئەوان نوێژیش دەکەن و یاریش دەکەن و ئامادەی وانـەی زانـستی دەبـن و هـەوڵی بـانگ کردنی کەسانی دیکەش دەدەن و زۆر بەجوانی ژیانیان دەگوزەرێنن و کاتەکانی بێ کاریـان بە خۆشی بەسە دەبەن منیش بڕیارم دا وەك ئەوان وابم لەبەرئەوەی منیش لەوان کەمترنیم بەڵێ دەستم دایە بـەردەوامی دان لەسـەروانەکانم و خوێنـدنی قورئـان و ئـیتر زانـیم کـە پیویستە چۆن بژیم، من دۆخەکەم دی کـە زۆر گـران نـی یـە و ئەمـە ئـەو ژیانەیـە کـە پەروەردگار بۆ ئێمەی دەوێ کە پێویـستە بەشـێوەیەك تیایـدا بـژین کـە هـەرتاوێ بـمرین ئامادەی دیداری خودا بین، هەرکەس دیداری خوای پێ خۆش بێت خوای گەورەش دیـداری ئەوی پێ خۆشە، بەڵام کێ لە ئێمە پێی خۆشە بە خودای خۆی بگات؟ کەس مردنی خۆش ناوێ، کەس باسی مردنی خۆش ناوێ، کەس بیر لە مردن ناکاتەوە، بەڵام کاتێ کە بیر لەم پەیڤە دەکەیتەوە دەبینی کـە ئەمـە ڕاسـتی یـە و ئەمەیـە کـە پـەروەردگار بـۆ ئێمـەی مەبەستە.

بەڵام من پاش ئەوەی کە بە ویسی پەروەردگار پابەنـد بـووم خوێنـدنی کۆلێـژم تـەواو کردو، لە گەورەترین نوسینگەی پێداچونەوەی حیسابات لە میسر بۆ ماوی یەك ساڵ کارم کرد، پاشان وازم لێ هێناو لە کۆمپانیایەکی دیکە کارم کرد کـە ئێـستا خـۆم بـۆ ئـەوە ئامادە دەکەم کـە لـە کۆمپانیایـەکی بیـانی ببمـە بەڕێوەبـەری فرۆشـتەنی ناوچـەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ئەم کۆمپانیایە لە تەواوی جیهان لقی خۆی هەیە دیارە ئەمەش بە ویستی خوای گەورە بوە بەوەی کە نیعمەتی ئیمانی ڕژاندوە بەسەرمدا...

﴿ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا﴾ الطلاق: ٢

بە کورتی من لەم ئەزمونەم دەرچووم... بەختەوەری ڕاستەقینە لە ملکەچی خوای گەورە و شەرم کردن لە پەروەردگارەوەیە، وە لاوانی پابەند پیویستە هەمیشە باشتربن لە خەڵکی...

چەند شێوە و نمونەیەك لە بێ شەرمی لە نێو کۆمەڵگەی لاوان دا بەدی دەکەین و خوازیارین بگۆڕێ و کۆتایی پێ بێت...

١ـ دیسکۆ ٢ـ پیاهەڵدانی کیژان لە شەقامەکاندا.

گرفتی پیاهەڵدانی کیژان زۆر ناشیرینە، بەجۆرێ هەمو خەڵکی لەگەڵیدا هەڵس و کەوت دەکەن... لە سیرەدا هەڵوێستێك هەیە کە پەیوەستە بەم گرفتەوە، شاندێك هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ئەوەی کە بەیعەتی پێ بدەن، لە نێویاندا پیاوێك هەبوو بەناوی قەیس، ئەوان لە ڕێگەیاندا بوون بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) قەیس لە یەکێك لە ڕێگەکانی مەدینەدا لایدا، بەلای کچێکدا و پیایدا هەڵدا، بۆ ڕۆژی دواتر ڕۆیشتن بۆ بەیعەت دان پێغەمبەر(ﷺ) یەك بەیەك سلاوی لێ کردن و کاتێ نۆبەی قەیس هات حەزرەت دەستی گوشارد و ووتی: (تۆ هاوەڵەکەی دوێنێیت)، واتە: تۆ ئەو کەسەی، کە ڕۆژی ڕابردوو کارە خراپەکەت ئەنجام دا پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕویدا سور هەڵگەڕا ئەویش بە پەلە بەرەو ڕوی ڕایکرد و پێی ووت: ئەی پێغەمبەری خوا بەیعەتم لێ وەربگرە سوێند بێ کە هەرگیز کاری وانەکەم و پاش ماوەیەك حەزرەت ڕازی بوو...

سەرنج بدە! حەزرەت(ﷺ) ئەو بەیعەتە بەرپەرچ دەداتەوە، دۆخەکە سامناکە...

دۆخەکە سامناکە ئەی خوشك و براکانم، وە بڕواناکەم کەس بەمە ڕازی بێت کە لە بەرامبەر دایك و خوشکەکەی ئەنجا بدرێ...

هەروەها شێوازێکی دیکەی بێ شەرمی بریتی لەم خاڵە

٣ـ کێشانی نێرگەلە لە لایەن کیژانەوە.

٤ـ نابەجێ ی پۆشاك کە جل و بەرگی نوستن لەسەر ڕوی دوکانەکان بەدی دەکەین.

٥ـ ئەوەی کە لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا پەرەی سەندوە ئەوەیە کە لاوان یەکتری دەدوێنن لەسەر ئینتەرنێت بە جۆرێ کە شایستەی باس کردن نی یە، من داوا لەو کوڕ و کچانە

دەکەم کە کاتێ ئەم کارە ئەنجام دەدەن ئەوە بهێننە پێش چاوی خۆیان کە کاتێ ئـەم قـسە نابەجێ یانە دەکەن دایکیان، یان باوکیان گوێی لێیانە.

کەواتە پێت چۆنە کە خوای گەورە گوێی لە قسەکانتە و دەبینێ ئایا شەرمی لێ ناکەیت؟

بە کورتی: نمونەیەکی باشتان بۆ دەگێڕمەوە لـە شـەرمی ژن و پیاوێـك لـە مامەڵـە و هەڵس و کەوتیانا... موسی و کچی پیاو چاکێکی لە خوا ترس ئەم بەسەرهاتە لە سورەی قصص دا هاتووە کە کاتێ موسی لـە دەسـتی فیرعـەون هـەڵهات، ئایەتـە دەفـەرموێ: ﴿وَلَمَّا وَرَدَ مَآءَ مَدْيَنَ وَجَدَ عَلَيْهِ أُمَّةً مِّنَ ٱلنَّاسِ يَسْقُونَ وَوَجَدَ مِن دُونِهِمُ ٱمْرَأَتَيْنِ تَذُودَانِ﴾ القصص: ٢٣، دوو ئـافرەت لـە لاوە وەسـتاون و موسـاش دەست بەجێ بەرەو رویان رۆیشت و پرسیاری لێ کـردن (قـال ماخطبکمـا قالتـا لا نـسقی حتی یصدر الرعاء وأبونا شیخ کـبیر) گرفت چی یە وتیان ئێمە گرفتێکـی وامـان هەیـە، موسی شەرمەکەی وای لێ نەکرد کە هاوکاریان نەکات، بەڵام پاش ئەوەی کە لە کارەکەی لێ بویەوە لێیان دور کەوتەوە... (فجاءته احداهما تمشي علی إستحياء قالـت إن أبـي يـدعوك ليجزيك أجر ما سقيت لنـا)، واتە: ڕۆینەکەی بەشەرمەوە بوو ووتەکانی بەشرم و جوڵەکانی بە شەرمەوە بوون خوشك و براکانم ئەمە ئەو شەرمەیە کە ئێمە ئەمانەوێ....

شەرم کردن لە خودا پێویستە گەورەترین شت بێت کە بوونی هـەبێت...ئـەی کـەس و کارەکانمان، ئەی کچە ئازیزەکانمان... گەر لە دونیا شەرم لە خودا نەکەین، ئەی ئێمە چـی بکەین لە ڕۆژێکدا کە لەژێر چنگیداین؟! لەکاتێکدا کە دەفەرموێ: ئەی بەندەکەم.. بیرتە ئەو گوناهەت کرد... پەیامەکەت بخوێنەوە ئەی بەندەکەم... وەرن با لە دونیادا شەرم لـە خودا بکەین تا لە دوا ڕۆژدا پیرۆزبایمان لێ بکرێت.

**مەبەست**

پرسیار ئەمەیە: مەبەستی تۆ لە ژیاندا چی یە؟ ئامانجت چی یە؟

لە ڕاستیدا کەسانێکی زۆرهەن بەتایبەتی لە توێژی لاوان، کە نازانن لەم ژیانـەدا چـی دەکەن و هەر ئەوەندە دەزانن کـە دەڵـێن، ئێمـە دەژیـن و دەخـۆین و دەخوێنـەوە و کـار دەکەین و خێزان پیکەوە دەنێین و ژیان دەگوزەرێنین...

ئەمڕۆ سەبارەت بەم كێشەیە دەدوێین، ئایا ڕاستە تۆ بەبێ مەبەست و بەم شێوەیە بژیت ؟یان پێویستە چەند ئامانج و مەبەستێكی دیارت لە ژیاندا هەبێت، با من بە ڕاشكاوی لەگەڵ ئێوە بدوێم ئەم بابەتە بە زۆر و بەتایبەتی ئاراستەی چین و توێژی لاوان دەكرێ بۆچی ؟ لەبەرئەوەی كە گەورەكان وایان داناوە كە ئامانجی خۆیان لە ژیاندا دیاری كردوە، بەڵام توێژی لاوان ئەوانەن كە زیاتر لەم كارەدا شوێنی مەبەستن، ئەی كەواتە ئامانجەكانی تۆ لە ژیاندا چین، ئەی حیكمەتی بونی تۆ لەم ژیانەدا دەبێ چی بێت؟

پێویستە تۆ ئەوە بزانیت كە گرنگترین شت لە تەمەنی تۆدا لاویتە، ئەمەش جوانترین قۆناغی تۆیە لە ژیاندا، ژیانی منداڵی تەندروستی یە و ئەقڵی تێدا نی یە و بەساڵاچونیش حیكمەتەو لاوێتی تێدا نی یە، بەڵام ئەوانەی كە خاوەن تەندروستی و ئەقڵێكی پێگەیشتون ئەوە چینی لاوانن.

لەبەر ئەوە گرنگی دانی ئیسلام و پێغەمبەر(ﷺ) بە لاوان شتێكی سەیر نیيە كە دەفەرموێ: (پێی یەكانی هیچ بەندەیەك لە شوێنی خۆیان جیا نابنەوە لە ڕۆژی قیامەتدا هەتا پرسیاری لە چوار شت لێ نەكرێ: تەمەنی لە چیدا بەسەر برد، لاوێتی لە چیدا تاقیكردەوە، لەو ماڵەی كە هەیبو بەچی پەیدای كرد و لەچیدا بەخشی، ئەو زانستەی كە هەیبو چ كارێكی پێ كرد).[1]

سەرنج بدە تاوتاوی تەمەنت پرسیارت لێ دەكرێت، ساتێك ئاواو ڕۆژێك ئاوا، ساتێك بەم شێوەیە و ڕۆژێك بەو شێوەیە، ئەم پرسیارانە چەند دژوارن، بێنە پێش چاوی خۆت كەسێك هەموو تەمەنی بەبێ ئامانج و ناسنامە بەسەر بردبێ، سەرنجی ئەوەش بدە پاش ئەوەی پرسیاری تەمەنت بە شێوەیەكی گشتی لێ دەكرێ پرسیاری ژیانی لاوێتیشت بەتایبەتی لێ دەكرێت!!!

ڕەنگە بڵێی ئایا من پرسیاری هەموو تەمەنم لێ نەكرا و ئەی بۆچی دوبارە پرسیاری قۆناغی لاوێتیم لێ دەكرێتەوە؟ بەڵێ لەبەر ئەوەی كە ئەمە گرنگترین قۆناغی ژیانتە.

---

١ـ ترمذی ڕوایەتی كردوە.

لەبەر ئەوەی کە قورئان دەبینین کە بە شێوەیەکی نا سروشتی بایەخی داوە بە چین و توێژی لاوان بۆ نمونە دەبینی کە خوای گەورە یاساکانی ئەم گەردونەی لەبەر خاتری شەش تا حەوت لاو گۆڕیوە بێنە پێش چاوی خۆت!! دۆخی ئەم گەردوونە بە خاتری هەندێ لاو دەگۆڕێ، بەڵێ پەروەردگار دەربارەی پیاوی ئەشکەوت دەفەرموێ: ﴿ إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ ءَامَنُوا۟ بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَـٰهُمْ هُدًى ﴿١٣﴾ وَرَبَطْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ﴾ الكهف: ١٣و١٤.

فتيه: گەنجانێك بوون واتە تەمەنیان لە نێوان١٦-١٧ساڵیدا بوو بارودۆخی ئەم گەردونەیان بۆ دەگۆڕدرێ: ﴿وَتَرَى ٱلشَّمْسَ إِذَا طَلَعَت تَّزَٰوَرُ عَن كَهْفِهِمْ ذَاتَ ٱلْيَمِينِ وَإِذَا غَرَبَت تَّقْرِضُهُمْ ذَاتَ ٱلشِّمَالِ وَهُمْ فِى فَجْوَةٍ مِّنْهُ﴾ الكهف: ١٧واتە: خوای گەورە لە خۆر پاراستنی و ئەشکەوتێکی بۆ ڕام هێنان، کاتێك ڕۆژ هەڵدەهات بە لای ڕاستی ئەشکەوتەکەیدا دەدا، کاتێکیش ئاوا دەبوو لە لای چەپی دەدا، گەرمای خۆریان نەدەگەیشتێ کە لاشەیان پێی تێك بچێ بە تایبەتی لەبەر زۆر مانەوەیان، ئەمەش لە بەڵگە ڕوون و ئاشکراکانی خوایە لەسەر توانا و بەزەیی خوا.

ئەوەش ابراهیم(عليه السلام) لاوێکی دیکەیە کە بارودۆخی ئەم گەردونە لە پێناویدا دەگۆڕدرێ و کاتێ فڕێ ددرێتە نێو ئاگرەکەوە تەمەنی تەنها ١٦ ساڵانە:(ﷺ)﴿قُلْنَا يَـٰنَارُ كُونِى بَرْدًا وَسَلَـٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ﴾ الأنبياء: ٦٩.

## من ئەم پەیڤە دەڵێم هەتا تۆی لاو بیزانیت...

لاوانێك زۆر بەرێزن لای پەروەردگار تۆش وەك لاوێك لە پلەو پایەی خۆت دامەبەزێنە، شورەیی یەکە تۆ لەم ژیانەدا ئامانجێکت نەبێ، هەمیشە لە خۆت بپرسە ئایا ئامانجی من لەم ژیانەدا چی یە؟

بۆچی من لەم دونیایەدا دەژیم ؟ ئایا تەنها بۆ خواردن و خواردنەوە و، پاشان دەمرم ؟ ئایا ئەمە شیاوە ؟ ئایا تۆ دەژیت و نازانی کە بۆچی دەژیت ؟

بەو نمرەیەی وا قوتابخانەم کۆتایی پێ هێناو لە کۆلێژ وەرگیرام و، پاشان قۆناغی کۆلێژیش تەواو بوو دواتر لە شوێنێك دامەزرام و دەستم کردە کارو سامان و دارایی یەکم کۆ کردەوە و خێزانم پێکەوە ناو، پاشان دەمرم... ئایا ئەمە گونجاو و شیاوە ؟!!

## چەند نمونەیەك دەربارەی ئامانجی لاوان

عەلی کوڕی ئەبو تالیب(ﷺ) شەوی کۆچ لە جێگەی حەزرەت دەنوێ و تەمەنی تەنها ٢٠ ساڵە، پێغەمبەر(ﷺ) دیتی کە بۆ ئەم کارە شیاوە پێی سپارد.

ئەسمای کچی ئەبو بکر... خۆراك دەگەیەنێتە پێغەمبەر(ﷺ) لە ئەشکەوتی (ثور)و هەڵدەستێ بە بینینی ڕۆڵێکی گەورە لە کۆچدا لە کاتێکدا کە تەمەنی تەنها ٢٣ ساڵە!!

موصعەبی کوڕی عومەیر... پێغەمبەر(ﷺ)وەك باڵوێزێك دەینێرێ بۆ ناو دانیشتوانی شاری مەدینە، چونکە ئەو مامۆستا و قورئان خوێن و داعی بووە... تەمەنت چەندە ئەی موصعەب؟ تەنها ١٨ساڵ!!

معاژی کوڕی جەبەل... پێغەمبەر(ﷺ) دەینێرێ بۆناو خەڵکی یەمەن... تەمەن چەندە ئەی معاژ؟ ٢٠ساڵ!! ئەمە چی یە؟!! ئەوەی کە دەمەوێ بیڵێم ئەی چینی لاوان ئەوەیە کە:

تۆ زۆر زۆر زۆر بەڕێزی، کەواتە بۆچی لە ڕێزی خۆت کەم دەکەیتەوە و بەبێ ئامانج دەژیت؟!!

من بۆچی وا دەڵێم؟

لەبەر ئەوەی کە من ئەبینم کۆمەڵگەکەمان بەدەستی ژمارەیەك لاوەوە دەناڵێنێ کە بەبێ ئامانج لە پێناویدا دەژین، هەر ڕۆژەی گازینۆیەکی نوێ دادەمەزرێ، گازینۆکان بونەتە زۆرترین ئەو پرۆژانەی کە جێ بایەخن، بۆچی؟ لەبەرئەوەی لاوان بۆ زیاتر لە چەند

کاتژمێرێ تیایدا دادەنیشتن، زۆر جار بە ئۆتۆمبێلەکەم تێدەپەڕم کۆمەڵە لاوێك لەو گازینۆیانەدا بەدی دەکەم کە لە تەمەنی خونچەیدان، بەداخەوە بۆ ئەوەی کە هەندێکیان یاری دەکەن و هەندێکی دیکەیان، بەبێ هۆ خەیاڵ بردونی.

زۆر بەداخەوەم بۆ کیژانێك کە غەمی گەورەیان لە ژیاندا دوایین جۆر و مۆدێلەکانی مکیاژە، فلانە کچ ئەوەی کڕی، وەیان دەمەوێ بچمە دەرێ بۆ کڕینی ئەو جۆرە پۆشاکە...

ئایا ئەمە شیاوە؟!!

ئایا ئەمە شیاوە کە هەموو پەژارەیەکی کیژێك ئەوەبێ لە ژیانیدا کە جوانە، یان نا ؟ ئایا ئەمە شیاوە کە لاوێك تەنها مەبەستی ئەوە بێ کە فلانە کچ سەرسام بکات ؟ ئەم نمونانەم بەداخەوە بە چاوی خۆم دیتووە..

لاوێك بەبێ ئاوات لەخواردن و خواردنەوەیدا پشت بەکەس و کارەکەی دەبەستێ و نایەوێ داهاتویەك بۆ خۆی ساز بدات، کچانیش هەموو مەبەستێکیان ئەوەیە کە بە خێرایی شوو بکەن، بەڵام بۆچی؟ لەبەر ئەوەی هەموو کیژان شوو دەکەن و ژیان بەم شێوەیە بەردەوام دەبێت.

ناکرێ ئێمە لەنێو ئەم بۆشاییە گەورەیەدا بژین ئەی لاوان وە نابێت بەم شێوەیە کۆمەڵگا پێك بهێنین و بنیاتی بنێین.

ئایا دەزانی کە زانایانی کۆمەڵناسی دەتوانن کە توانای کۆمەڵگەکان لەسەر بەردەوامی و گەشەکردن دیاری بکەن و دەتوانن شێوازی کۆمەڵگا دیاری بکەن؟ پاش چەند ساڵێك و پاش چەند ساڵێك ئەم کۆمەڵگایە دەڕوخێ و ئایا ئەم زانایانە چی دەکەن؟

ئەوان دیراسەی باری ژیانی لاوان و بایەخدانیان بەدەوروبەریان دەکەن، گەر لاویان بەبێ ناسنامە و ئامانج دیتەوە، ئەوا بۆیان دەردەکەوێ کە ئەم کۆمەڵگایە دوای هێندە ساڵی دیکە دەکەوێ و ئەوانیش کارەکانیان زۆر بەوردی ئەنجام دەدەن...

ئەم پەیڤە بریتییە لە شیکاری زانایان ئەوانەی کە بایەخ بە بارودۆخی ژیانی لاوان دەدەن لە کۆمەڵگای ڕۆژئاوایدا...

لەم مانایەدا چیرۆکێکی نوێتان بۆ دەگێڕمەوە...

موسڵمانان لەشاری ئەندەلوس ٨ سەدە مانەوە لەو ماوەیەدا سەر زەوی، یان پڕ کرد لە شارستانیەت و زانیاری و ئاین و پرتوگالیەکان بە بوونی موسـڵمانان لـە ئەنـدەلوس ڕازی نەدەبوون، هەوڵیان دا کە دەریان بکەن بەرەو وولاتی ڕۆژئاوای عەرەب، ئەوان چیان کرد ؟ ئەوان دیراسەی کارە پڕ بایەخەکانی لاوانـی موسـڵمانیان کـرد لـە ئەنـدەلوس، وە بۆئـەم مەبەستە چەند سیخوڕێکیان ناردە ناوچەکە، ڕۆژێك ژمارەیەك لەو سـیخوڕانە چـونە نێـو کۆمەڵە لاوێکەوە و دیتیان کە مشت و مڕیانە بەختەوەر بوون و ڕۆیشتن تـا لـە کێـشەکە بکۆڵنەوە دیان کە ئەم دوو لاوە لەسەر ڕێکخـستنی فـەرمودەکانی ( صـحیح البخـاری)) ناکۆکن، گەڕانەوە و ووتیان ئەم ئومەتە ئێستا ناڕوخێ، ساڵانێك تێپەڕی و جارێکی دیکە سیخورەکان گەڕانەوە لاوێکیان دیت کە هێشتا سـەبارەت بـە زانـست و زانیـاری و ئـاین دەدوێ جارێکی دیکەش بەبێ ئومێدی گەڕانەوە، پاش چەند سـاڵێکی دیکـە گەڕانـەوە و لاوێکیان بینی کە دەگریا، لێیـان پرسـی ئـەوە بـۆ دەگریـت ؟ لەوەڵامـدا ووتـی هـاوڕێ کچەکەم بەجێی هێشتم، سیخورەکان گەڕانەوە بۆ شوێنی خۆیان و ووتیان ئێستا دەتـوانن سەرکەون بەسەر موسڵماناندا، بەڵێ موسڵمانان ڕوخان و زۆر بـە ئاسـانی لـە ئەنـدەلوس دەرکران و پاش ٢٥ساڵ هەموو شتێ بە تەواوی کۆتایی پێ هات و جارێکی دیکە نـاوی ئەندەلوس نەهاتە هەژمار...

ئەی لاوان... کێشەکە مەبست و ئامانجە... ئایا تۆ لە ژیانتدا ئامانجێکت هەیە، یان نا؟

ئەو هۆکارانە چین وایان لە لاوان کـردوە کـە هەسـت بـە بەرپرسـیارێتی نەکـەن، یـان نەیانەوێ بیگرنە ئەستۆ؟

لێرەدا کۆمەڵە خاڵێکی دیاری کراو هەیە کە هۆی نەبوونی ئامانجن لە ژیاندا کە بریتین لە(لاوازی خواست و لەدەست دانـی متمانـە بـە خـۆ بـوون و نادیـاری پێـشەنگ و لـە دەستدانی ئاوات بە هۆی نێوەندەوە)...

بەڵام لە ڕاستیدا هەموو ئەم هۆکارانە ڕاست نی یە بکرێتە بیانوویەك کە ویژدانی هەر لاوێکی پێ ئاسودە بێت و ژیانی خۆی بەبێ هیچ ئامانج و ئاواتێ پێ بکاتە بیانوو.

تۆ سەیری کەسێکی وەك ابراهیمی کوڕی ئەدهەم بکە، ئەو یەکێك بووە لەو کەسانەی کە زۆر لەخودا ترساوە و لەسەرەتای ژیانیدا لاوێکی نازدار و خۆش گوزەران بوە، لە یەکێك لە ڕۆژەکانی ژیانیدا دەڵێت: سواری ئەسپەکەم دەبوم و ئاسکێکم ڕاو دەنا لە ڕێگەکەمدا، لەم کاتەدا پیرە پیاوێکم دی و هەوساری ئەسپەکەی گرتم و ووتی ئایا تۆ بۆ ئەمە خولقێنراوی؟ ئایا بەمە فەرمانت پێ دراوە ؟ ئایا تۆ بۆ گەمە و کات بەسەر بردن خولقێنراوی؟

لەبەر ئەوە ئەی لاوان، ئامانجەکان لە ژیاندا کێشەیەکی سەرەکیە کە دەبن، یان نا وە ئەمەش وام لێ دەکات کەسەر لەنوێ ئەم پرسیارە دوبارە بکەمەوە؟

ئێمە بۆچی خولقێنراوین؟ ئایا بۆ ئەوە خولقێنراوین کە بخۆین و بخۆینەوە و ببینە خاوەن ماڵ و منداڵ و، پاشان بمرین؟، یان ئێمە بۆ شتێکی دیکە خولقاوین؟

زۆر جار ئێمە کەسانێك دەبینین کە هاتونەتە ئەم دونیایە و ژیاون و مردون و نازانن بۆچی خولقێنراون ئێمە نمونەیەك دێنینەوە ئەفلاتون دەڵێت: خودا گەردونی دروست کرد و، پاشان لەبیری چویەوە لەبەرئەوەیە کە مرۆڤەکان زۆرانباز دەکەن و هەندێکیان ئەوی دیکەیان دەکوژێ وە ڕۆشنبیرێکی دیکە دەڵێت:ئەم گەردوونە هیچ نی یە جگە لە یاری یەکی گەورە، بێنە پێش چاوی خۆت کە ئەم گەردوونە هەمووی بۆ یاری و ڕابواردن بێت، وە یەکێکی دیکەی وەك: ئیلیا ئە بو ماچی دەبینین کە دەڵێت:

جئت لا أعلم من أين ولكن أتيت...

ولقد ابصرت أمامي طريقا فمشيت...

. وسأبقي سائرا إن شئت أم أبيت...

. كيف جئت ؟! لست أدري !!

## ئەمە فەلسەفەی ژیانی بێ مەبەستە

بەڵام ئەم پەیڤە دروست نی یە کە پەیڤی لاوێکی موسڵمان بێت تۆ مەبەستێکت بۆ دانراوە، خوای گەورەش دەفەرموێ: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾الذاريات:٥٦

بەڵێ ئەمەیە ئامانج!

واتە لەم گەردونەدا بژیت و ئامانجت ڕازی کردنی خودا بێت.

ئەی چین و توێژی لاوان وەرن با لە ژیانی خۆماندا ئامانجێکی گەورە دیاری بکەین کە ناوی ڕازی کردنی خودایە و چەند لقێکی زۆری لێ دەبێتەوە، بەڵام مەبەستی من لە ژیاندا بریتی یە لە ڕازی کردنی خوای گەورە.

من ئەوەم لە یادە کە ڕۆژنامە نوسێك گفتوگۆیەکی لەگەڵ یەکێك لە یاریزانە بەناوبانگەکان ئەنجام دەدا و پێی ووت: ئەی کاپتن فلان ئایا تۆ ئومێدت چی یە لە ژیان ؟ یاریزانەکەش دەڵێت: کە بچمە بەهەشت، ڕۆژنامە نوسەکەش دەڵێت: نا من سەبارەت بە ئومێدت لە ژیان دەدوێم: ئەویش دەڵێت بچمە بەهەشتەوە ڕۆژنامە نوسەکە دەڵێت من شتێکم دەوێ کە بینوسم... ئەو ناتوانێ کە پێشبینی ئەوە بکات کە ئەمە ئامانج و مەبەستە، پاشان پرسیاری کرد کە گەر وایە کەواتە تۆ بۆ یاری دەکەیت؟

یاریزانەکە ووتی من یاری دەکەم هەتا پارەم جنگ بکەوێ و نمونەیەکی بەرێز پێش کەش بە جەماوەر بکەم، کاتێ کە لاوان یاریزانێکی بەڕێز بەدی دەکەن کە بەڕەوشتەو، بە شێوەیەکی زۆر جوان مامەڵە لەگەڵ خەڵکیدا دەکات، خوای گەورە دەپەرستێ، سەرکەوتوە لە کارەکەیدا، وابەست دەبن پێ یەوە و بەمەش پاداشتی چاکەی ئەو لاوانەم دەست دەکەوێ.

# چەند چیرۆكێكی ڕاستەقینە

## چۆن واز لە ئاینەكەم بێنم من بۆ هەركوێ یەك بڕۆم هەر موسڵمانم:

بەسەرهاتی مرۆڤێكتان دەخەینە پێش چاو كە بارودۆخی ژیانی لە ژیانی هەر هەموتان دژوار تربووە، ئەو كیژە بەڕەگەز ئەڵمانی یە، بەڵام مەبەستێكی زۆر گەورەی لە ژیاندا بۆ خۆی هەڵبژاردوە و هەوڵی بۆ داوە وەرن با بەسەر هاتەكەی بخوێنینەوە:

من ناوم عالیەیە، موسڵمانم، نزیكەی١٢ ساڵە موسڵمان بووم ئەمەوێ سەرگوزشتەی موسڵمان بوونی خۆمتان بۆ بگێڕمەوە من لە یەكێك لە شارەكانی ئەڵمانیا ژیانێكی سادەم دەگوزەراند وە هیچ ڕابردوویەكی گەورەم لەسەر ئیسلام نەبوو وە هیچ شتێكمان دەربارەی ئیسلام نەدەزانی ئەوە نەبێ كە لە ڕێگەی هەواڵەكانەوە پێمان دەگەیی، وە لە قوتابخانەشدا وا بەرگوێمان دەكەوت كە ئەمە تەنها ئاینی عەرەبە.

بەڵام ئێمە هەرگیز وەك ئاین بیرمان لە ئیسلام نەكردۆتەوە لەبەرئەوەی كە ئاین لە كۆمەڵگای ئێمە زۆر گرنگ نی یە، خەڵكی لە وڵاتی مندا بۆ دونیایان دەژین و بیر لە گرفتی دوا ڕۆژیان ناكەنەوە.

هەتا ئەو كاتەی كە كۆمەڵێكم لە موسڵمانان ناسی و ئەمەش وای لێ كردم كە زیاتر لە ئیسلام شارەزا بم، دەسم كردە خوێندنی قورئان و بەشداری چەندین گفتو گۆم دەكرد لەگەڵ موسڵمانان و من دەمەوێ هەموو شتێ دەربارەی ئەم ئاینە جوانە بزانم، دواتر هەندێ بنەمای ئیسلامیم تاقیكردەوە تا بزانم دەتوانم بەجێیان بهێنم، یان نا ؟ هەروەك موسڵمانان نوێژم كرد و ڕۆژووم گرت...

پاشان بیرم لە مردن كردەوە، من لەبەردەم خودادا دەوەستم و لێم دەپرسێ بۆچی موسڵمان نەبووم ؟ من چی بەئەو بڵێم؟ لەبەرئەوە بڕیارم دا كە موسڵمان بم، ئەو كاتە هەواڵیان پێ دام كە دەبێ خۆم بشۆم، خۆم شوشت و شایەتومان هێنا، ئەو دەستەواژە قەشەنگەی كە ئیسلامی لەسەر پایە دەكرێ، لەو ساتەوە دەستم كردە نوێژ و هەردوو سورەی(الفاتحة و الإخلاص)م لەبەركرد هەتا بتوانم نوێژەكانم بخوێنم، لەسەرەتادا هەواڵی

موسڵمان بوونم بەکەس نەدا، بەڵام دوای ئەوەئەو هەواڵەم گەیاندە خەڵکی، بەڵام حیجابم نەپۆشی بوو لە کاتێکدا حیجاب گرفتێکی زۆر دژوار بوو بۆ من، لە ئەوروپادا هێندە بایەخ بە ڕوو کارت دەدرێ بایەخ بە ئاینەکەت نادرێ و حیجابیش پۆشاکێکی نامۆو سەرنج ڕاکێشە بەنیسبەت ئەوانەوە.

ڕۆژێك لەگەڵ هاوڕێ یەکی زانکۆم کەوتینە گفتوگۆ و ئەو ووتی موسڵمانان بەسۆز و میهرەبان نین و نازانن چۆن ئەم دونیایە دەڕوات بەڕێوە هەواڵم پێ دا کە من موسڵمانم، ئەو سەری سوڕما و ووتی لەوە ناچی کە بەو شێوەیە بیت!! ئالێرەوە حیکمەتی حیجابم بۆ دەرکەوت کە پێویستە ئێمە خۆمان داپۆشین هەتا بۆ دەورو بەری دەرخەین کە ئێمە موسڵمانین...

حیجابم پۆشی، ئەمە زۆر سادە نەبوو بەنیسبەت خێزانەکەمەوە خێزانەکەم لە سنوری خۆیاندا بایەخ بە ئاین نادەن، هاوسێ و کەسە نزیکەکانم پرسیاریان دەکرد ئەم کچەی ئێوە چی دەکات؟ بۆچی ئەم پۆشاکە دەپۆشێ؟ لەبەرئەوە چەندین گفتوگۆی سنور بڕ لە پێناو ئەم پارچە قوماشەدا دەهاتە ئاراوە.

وورده وورده دوچاری بەرتەنگی دەبووم، لەسەر شەقامەکان پێیان دەوتم کەوایە بڕۆ بۆ وولاتەکەت!! تۆ شوێنت لێرە نابێتەوە بەنیسبەت ئەوانەوە لە ئەڵمانیا ئیسلام هیچ شوێنێکی نی یە، پاش موسڵمان بوونم بە ماوەیەك، لەگەڵ لاوێکی میسری خێزانم پێکەوەنا لە کاتێکدا کە هێشتا خوێندکاری زانکۆ بووم، پاشان بە ویستی خوا خوێندنەکەم تەواو کردو بڕوانامەی ماجستێرم بەدەست هێنا و ئێستاش خاوەنی دوو کیژم، کاتێ کە خوای گەورە کیژی دووەمی پێ بەخشین بیرمان لە پەروەردە کردنیان کردەوە ژینگە لە ئەڵمانیا لەبارو شیاو نی یە بەڵکو دوچاری زۆر گرفت دەبنەوە ئێمە ویستمان ئەم دو منداڵە لەو گرفتانە دوور بخەینەوە لەبەرئەوە بڕیارماندا کە لە میسر لەنێو کۆشی کەس و کارە موسڵمانەکەیان پەروەردەیان بکەین..

بەڵام بارودۆخەکە بە نیسبەت منەوە سانا نەبوو، لە لایەن خەڵکی میسرەوە خراپ مامەڵە دەکرام دەمدیت کە هەندێ کەس هێشتا وا سەیرم دەکەن کە من موسڵمان نیم وە پێیان دەوتم کەتۆ لە پێناوی هاوسەرەکەت موسڵمان بویت و دڵنیاین کە کاتێ گەڕایتەوە

بۆ ئەڵمانیا حیجابەکەت فڕێ دەدەیت و نوێژ ناکەیت و ڕۆژوش ناگریت، لەبەرئەوەی کە تۆ وەك ئێمە لە منداڵی یەوە لەسەرئەمە ڕانەهاتووی، منیش پێم دەوتن: کە هەرگیز واز لـە ئاینەکەم ناهێنم و من موسڵمانم و لە هەرکوێ یەك بم و بۆ هەرکوێ بڕۆم ئیسلام لەگەڵمدا دەبێت، ئەمە پەیوەندی بەو وڵاتەوە نی یە کە منی تێدام، بەداخەوە کۆمەڵگای میسریم بەو شێوەیە نەدی، کەپێشبینیم دەکرد، وام دەزانـی کـە مـن موسـڵمانان لـە نیگـارێکی نمونەیدا بەدی دەکەم، بەڵام دیتم کە هەندێ کەس سەرسامن بـە ئـەوروپا و لـەزۆر شـتدا لاسایی دەکەنەوە و بەدوای جل و بەرگ و مکیاژیاندا دەگەڕێن بەدوی شـتی نوێـدا، مـن کاتێ کە موسڵمان بووم و حیجابم پۆشی پێیان وابوو کە ناتوانم خوێندن تەواو بکەم بـەڵێ من خوێندم تەواو کرد و بڕوانامەی ماجستێرم وەرگـرت لەبەرئـەوەی کـە ئیـسلام هـانی تاکەکانی دەدات لەسەر خوێندن، وە کاتێ کە خێزانم پێکەوەنا گومانیان وابوو کە من چی دی کارناکەم و دەبمە دایکی ١٠ منداڵ و لەماڵ ناچـمە دەرێ و پابەنـد دەبم بـەکارو بـاری ماڵەوەم، بەڵام ئەمە ڕوینەدا، خوای گەورە تەنها دو کچی پێدام و لەوەش زیـاتر نـەبو وە من زۆر پێیان بەختەوەر بووم وەکاتێ کە منداڵـە بـچوکەکەم گەیـشتە قۆنـاغی دایـەنگا جارێکی دیکە گەڕامەوە سەر کارەکەم وە لـە ڕێگـەی ئینتەرنێتـەوە چیرۆکی موسـڵمان بوونی خۆمم نووسی و بڵاوم کردەوە... هەفتانە لە هەموو جیهانەوە نامـە و پـەیامم پـێ دەگات... لە ئەمریکا و پاکـستان و سـنغافورە و ئـەوروپا و خاوەنـەکانیان پرسـیارم لێ دەکەن دەربارەی ئیسلام و منیش شارەزایی خۆمیان دەربارەی ئیسلام بۆ دەگێڕمـەوە و وا هەست دەکەم کە من کارێکی باش دەکەم.

جوانترین و قەشەنگترین شت لە دونیا ئەوەیە کە تۆ مەبەستێکت هەبێت و ڕازاوەترین مەبەستیش ئەوەیە کە تۆ پەروەردگاری خۆت بناسیت ئایا ئەو خولقێنـەری ئێمـە و ئـەم گەردوونە نی یە و هەمومان هەر بۆ لای ئەو ناگەڕێینەوە؟!

# چەند ئامانجێك

## ئامانجی پارە كۆكردنەوە

دەبینی هەندێ كەس لە ژیاندا ئامانجیان سەروەت پێكەوەنانە ئەی خوشك و براكانم ئەم سامانە لە شوێنی تایبەتی خۆیدا ئامانج نی یە بەڵكو هۆكارێكە كە ئامانجە بەرزەكانمانی پێ دەستەبەر دەكەین , كەسانێكی زۆر هەن لەوانەی كەماڵ و دارایەكی زۆریان هەیە، بەڵام لەناوەوە ڕوخاون، با بێین دارایی وەك هۆكارێك بۆ مەبەستێكی گەورەتر وەربگرین... وەرن با پێكەوە بەڕەزامەندی خودای ببەستینەوە، پارەو دارایی چۆن لەگەڵ ڕەزامەندی خوادا پێكەوە گرێ دەدرێن...

بەڵێ من دەمەوێ سامانێك دەستە بەربكەم كە زۆر بەڕێزەوە بژیم، هەتا بەشێوەیەكی بەڕێزانە منداڵەكانم پەروەردە بكەم و بە هۆیەوە بیان گەیەنمە پەروەردگار، هەتا بتوانم لەڕێگای خودا ببەخشم و هاوكاری هەژاران بكەم و ئەو كاتە سەر مایەدارێكی ئاین پەروەرم ئەمە هەروەك ئەوە وایە كە خوشكە عالیە وتی كاتێ كە دەڵێت، من موسڵمانێكی ئاین پەروەرم و بڕوانامەی ماجستێرم بەدەست هێناوە و لەژیانمدا سەركەوتووم، بێنە پێش چاوی خۆت كە ئەمە ڕاز و نیازت بێ سامانیش پێكەوە بنێی، ئەو كاتە لە هەموو خولەكێك دا كە تۆ سامانی تێدا كۆ دەكەیتەوە لە ملكەچی پەروەردگاردا دەبیت، دەكرێ كە هەر ئامانجێك لە ژیاندا لە چوار چێوەی ئەم ڕوناكی یەدا بێنیە پێش چاوی خۆت...

### لاوێك دەیەوێ وەرزشكارێكی سەركەوتوو بێت

بۆچی پەروەردگارت ناخەیتە سەر ئەم ئامانجەت، تۆ لاوێكی و لەناختدا وزەیەك هەیەوگەر لە چاكەدا بەكاری نەهێنی ڕەنگە لە خراپەدا بیخەیە گەر دەبمە یاریزانێك و ڕەزامەندی پەروەردگار بەهەموو لێدان و دەرون و ڕشتنی دڵۆپە ئارەقێك چاكەیەك بەدەست دێنم...

**باوكێك دەیەوێ كاری هاوسەرگیری ئەنجام بدات**

با پەروەردگارت لەسەروی ئەم مەبەستەوە بێت ئەو كاتە نیازی تۆ لە خێزان پێكەوەنان ئەوە دەبێت كە خۆت بەپاكی ڕاگریت و دەستی خێزانەكەت بگریت بۆ ملكەچی و بەندایەتی كردنی خوای گەورە تا ببنە ماڵێكی موسڵمان و خوای گەورەی تێدا ڕازی بكەن، ڕادەبوێرێ و دەڕۆیە دەرێ و گەشت دەكەیت لەسەر ئەو بنەمایەی كە هەمیشە پەروەردگارت لەسەر و ئەم مەبەستەوە بێت.

**كیژێك مەبەستی لە ژیانیدا ئەوەیە، كە خێزان پێكەوە بنێ و منداڵی ببێت بۆچی؟**

ئایا لەبەرئەوەی، كە هەموو ئافرەتان خێزان پێكەوە دەنێن؟، یان هەتا لەگەڵ منداڵەكانی گەمان بكات و پێیان بەختەوەر بێت؟ نەخێر... ئەم مەبەستانە پاش ماوەیەكی كەم كۆتایی پێ دێ، بەڵام با بێین بە تێگەیشتنی ئەم ئایەتە پیرۆزە بایەخ و گرنگی پێ بدەین، مەبەستی ئەم كیژە ئەوەیە، كە نەوەیەك پەروەردە بكات، كە خودا بپەرستن و بۆ خودا كار بكەن، لەبەر ئەوە منداڵەكەی دەچێتە نێو یانەیەكی وەرزشی تا ببێتە یاریزانێكی سەركەوتوو و بایەخ بە خوێندنەكەی دەدات هەتا سەركەوتوو بێت تیایدا، دەمەوێ لەبەر خودا بە نمونەیەكی تەواوەوە بچمە دەرێ، سەرنج بدە گەر ئەمە نیازی تۆ بێت منداڵەكانت پەروەردە بكەیت هەموو تاوێ لە پەروەردەكردنی منداڵەكەت چاكەیەكت بۆ دەنوسرێ، پاك و خاوێن ڕاگرتنی منداڵەكەت و ڕۆیشتنت بۆ یانەكەی و هاندانی ئەمانە هەموو چاكەن بۆ تۆ...

كەواتە لەخۆت بپرسە... ئایا ئامانجی من لەم ژیانەدا چی یە؟

پیاوبە

پەندێك هەیە دەڵێت: پیاو بە لەبەرامبەر هەزار پیاو، گەر نەتوانی پیاوێك بە نەك نیو پیاو).

ئەی برایان چەندێك لە دەوروبەری ئێمە مەبەستێكی گەورەیان ناوەتە سەر گەردنی خۆیان، ئەوە فلانە لەبری هەزار پیاوە، ئەوەش پیاوێكی دیكەیە لەبری سەد پیاوە، وە نیو

پیاو و چواریەکی پیاوێکیش هەیە، پیاویش هەیە هەر هیچ نی یە دەی سەرنج بدە و بزانە تۆ لە کامیانی؟؟

کاتێ کە قەڵای بابلیون بە عەمری کوڕی عاص نەگیرا داوای لە عومەری کوڕی خەتاب(ﷺ) کرد کە چوار هەزار پیاوی بۆ بنێرێ بۆ فەتحی میسر، عومەر سێ هەزار پیاو ویەك پیاوی بۆ نارد لەبری هەزار پیاو، ئەو پیاوە ئەو هاوەڵە بەڕێزەیە قەعقاعی کوڕی عەمرو بوو, عومەر فەرمووی: سوێند بەخوا هاوار و نەعرەتەی قەعقاع لە جەنگدا لە بوونی هەزار پیاو باشترە، جەنگ دەستی پێ کرد و قەڵاکە لە بتەوی خۆی نەکەوت و موسڵمانان نەیاندەتوانی کۆنترۆڵی بکەن، قەعقاعی کوڕی عەمریش لەژێر قەڵاکەدا وەستاو هاواری کرد: الله اکبر خوایە موسڵمانان سەرفراز بکەیت، قەڵاکە شکستی هێنا و موسڵمانان چونە نێویەوە و بەم نەعرەتەی قەعقاع سەرکەوتنیان بەدەست هێنا تا وتەکانی عومەری کوڕی خەتاب پشت ڕاست بێتەوە کە فەرموی پیاوێك بە هەزار پیاو.

کاتێ کە داگیرکەران لە کۆتایی سەدەی ١٨و سەرەتای سەدەی ١٩ هاتنە وڵاتەکەمانەوە لەنێو موسڵماناندا کەرەستەی پیاوەتی و لەنێو لاوانیشدا لەگەڵ لاوازیان ئەوەیان دیتەوە کە هێشتا ئەوا خاوەن مەبەست و ئامانجێکی گەورەن، ئەوان زانیان کە ناتوانن کۆنترۆڵی جیهانی ئیسلامی و، پاشان عەرەبیش بکەن تەنها بە پلانێکی دوو ئاڕاستە جیاواز نەبێ کە یەکەمیان بریتی یە لە گومڕا کردنی ئەم لاوانە و دووەمیشیان بریتی یە لە سڕینەوەی شارستانیەتی باو باپیریان لە هزریاندا.

لەبەر ئەوە هەندێ لە لاوان دەبینین کە بەسەر شەقامەکاندا تێدەپەڕێ و سەری لێ حەفر کردوە و گشت گیانی کردۆتە ملوانکە و خشڵ و گوێ لە ئاوازە ڕۆژئاواییەکان دەگرێت و لێیان تێناگات و بەبالای کچاندا هەڵدەدات بەشێوەیەکی ناشیاو... هەروەها هەندێ کچان هیچ غەمێکیان نی یە جگە لەوەی کە پۆشاکی تەسك و تەنك لەبەر بکەن بۆ دەرخستنی جەستەیان و هەروەها...

ئەوەیان لەبیر چووە کە باپیرانیان کە عومەری کوڕی خەتاب و خالیدی کوڕی وەلید و عوسمان و علی(ﷺ) هەمو ئەمانەیان لەیاد کردوە پاش ئەوان هۆکارەکانی ڕوخان دەستی پێ کردووە.

ئەی لاوان... لە کۆتایدا دەمەوێ کورتەی ئەوەی کەباسمان کرد لە دوو وشەدا کۆ بکەینەوە کە بریتی یە لە (مەبەستێك لە ژیاندا هەبێت کە ئەویش خودا بێت).

پاش ئەوەی کە ئەم پەیڤە دەخوێنی یەوە ئامۆژگاریت دەکەم کە بچیتە ژورەکەت و قەڵەم و کاغەزێك بگریت بەدەستەوە و ئامانجەکانی خۆت لەژیانتدا تۆمار بکەیت، زۆر شورەیی یە کە تۆ بژیت و بمریت و نەزانی چیت لە ژیاندا مەبەستە.

ئامانجەکانت تۆمار بکەو هەوڵی بەدی هێنانیان بدە، ئەوەت لەبیر نەچێت کە گەورەترین ئامانج لە ژیانی تۆدا ئەوەیە کە پەروەردگارت وەك خولقێنەری ئەم ژیانە بناسیت و بۆ ڕازیکردنی ئەو بژیت لە کاتێکدا کە بە شێوەیەکی سروشتی مومارەسەی ژیانت دەکەیت.

## خۆشەویستی خودا بۆ بەندە

### چۆن دەکرێ کە خوای گەورە ئێمەی خۆش بوێت

ڕەنگە زۆرمان بیستبێ سەبارەت بە خۆشەویستی بەندە بۆ خودا، وە بیستومانە کە زۆرێك لەبەر خۆشەویستی خودا لەناو چوون و لەجەنگێکدا، یان لەهەر کارێکی دیکەدا گیانیان بەخودا بەخشیوە، بەڵام ئەوەی کە ئەمڕۆ ئێمە لەسەری دەدوێین (خۆشەویستی خودایە بۆ بەندە)وە ئەوەی کە جێگای سەرنجە ژیانی پێغەمبەر(ﷺ)پڕە لەو فەرمودانەی کەباس لە خۆشەویستی خودا بۆ ئێمە دەکەن...

ئەی چۆن دەکرێ، کە خوای گەورە ئێمەی خۆش بوێت؟

یەکەمین فەرموودە لەو فەرموودانەی گوێ بیستی دەبین زۆر کاریگەری کردۆتە سەر یەکێك لە ئێمە ئەوەیە، کە پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی خوای گەورە دەفەرموێ: (خوای گەورە گەر بەندەیەکی خۆش بوێ بانگ دەکات: ئەی جبریل من فلانم خۆش دەوێ تۆش خۆشت بوێ جبریلیش بانگی دانیشتوانی ئاسمان ئەکات و ئەفەرموێ: خوای گەورە فلانی خۆش دەوێ ئێوەش خۆشتان بوێ).[1]

---

١ـ إمام أحمد لە ئەبو هريرەوە.

چەند جوانە ئەم خۆشەویستی یە!... چەند جوانە ئەم ڕاگەیاندنە ! خـوای گـەورە هـەر بەوە واز ناهێنێ کە فلانی خۆش دەوێ بەڵکو ئەم خۆشەویستی یـە لـە ئاسمانـدا ئـیعلان دەکـات و جبیریـل و ئـەهلی ئاسمـانیش لـە مرۆڤـەکان و پێغەمبـەران و فریـشتەکان و، پاشانیش دانیشتوانی سەر زەوی خۆشیان دەوێ... ئێمەش هـەروەها تۆمـان خـۆش دەوێ ئەی خودایە، ئەی ئەو زاتەی کە ئـەم خۆشەویـستی یـەت پـێ بەخـشیوین هـەروەها لـە فەرموودەدا هاتووە کە خوای گەورە بەندەکانی خۆی لـە بەهەشـت بـانگ دەکـات: ئـەی بەندەکەم تەمەناو ئارەزوو بکە تۆ هەموو ئـەو شـتانەت دەسـت دەکـەوێ کـە تەمـەنناو ئارەزوویان دەکەیت).

هەروەها (بەندەیەکم بەشتێ لێم نزیك نەبۆتەوە کە من خۆشم بـوێ لـەوەی کـە فـەرزم کردوە بەسـەریدا) ئایـا دەتـەوێ خـوای گـەورە خۆشـی بوێـت !! پێویـستە فـەرزەکانت ڕاپەڕێنی...

(بەدەوام بەندەکەم بە بەجێ هێنانی کاری باش لێم نزیك دەبێتەوە هەتا خۆشـم دەوێ) ئەمە ناوەڕۆکی بابەتەکەمانە، چی ڕوودەدات گەر ئێمە خودا خۆشی بوێین؟!!

(گەر بەندەیەکم خۆش ویست دەبمە ئەو هەستەی کە پێی دەبیـستێ، ئـەو چـاوەی کـە پێی دەبینێ ئەو دەستەی کە زەبری پێ دەنوێنێ، ئەو پێی یـەی کـە پێـی دەڕوات، گـەر داوام لێ بکات پێی دەبەخشم و داوای لێبوردنم لێ بکات ئەوا لێی دەبورم).

ئایا ئەمە شیاوە ؟!! ئایا هەر کەسێك لە ئێمە نالێت ئایا مـن بـۆ ناگەمـە ئـەم پلـە بەرزە

زانایان پەیڤێکی زۆر جوان لەم بارەیەوە دەردەبڕن کە ئـەویش بریتـی یـە لـەوەی، کـە (مایەی سەرسامی نی یە کە بەندەیەك گەورەکەی خۆی خۆش بـوێ و پـەرۆش بـێ بـۆی، بەڵام ئەوەی کە بەتەواوی مایـەی سەرسـامی یـە ئەوەیـە کـە خۆشەویـستی و پەرۆشـی لەگەورەوە بێ بۆ بەندەکەی) بەڵێ چەند واتایەکی جوان و ڕازاوە، ئێمە زۆر هەستیان پـێ ناکەین و بیریان لێ ناکەینەوە، لەبەر ئەوە زۆر، بەڵامانەوە سەیرە کاتـێ کـە گوێمـان لـە

هەندێ فەرمووده دەبێت بۆ نمونە پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرمووێ: (خوای گەورە لە سێ یەکی کۆتایی هەموو شەوێك دادەبەزێتە ئاسمان و دەفەرمووێ من سەردارم هەرکەسێ کە لێم دەپارێتەوە وەڵامی دەدەمەوە وە هەرکەسێ داوام لێ دەکات پێی دەبەخشم، هەرکەس داوای لێخۆش بوونم لێ بکات لێی خۆش دەبم دۆخەکە بەم شێوەیە دەمێنێتەوە تا بەری بەیان).[1]

مانای (هەموو شەوێك) چی یە؟! واتە هەرچەندە ئێوە بێ ئاگابن ئەی بەندەکانم وە ئەگەر چی ئێوە لە گێژاوی خەودا بن لەو کاتەدا ئەوا پەروەردگار هەموو شەوێ دا دەبەزێتە ئاسمان و تەوبە و میهری خۆی و لێبوردنی دەخاتەڕوو.

ئایا ئەوە بەس نی یە کە پەروەدگارمان پێمان بفەرموێ ئێوە فەرمانتان پێدراوە بە خۆشەویستی پەروەردگار، بۆچی خوای گەورە هانمان دەدات بۆ خۆشەویستی خۆی و ئەوینی خۆیمان بۆ دەردەخات من پێم وایە کە مرۆڤێك کاتێ کە دەزانێ کەسێکی دیکە خۆشی دەوێت ئەوا بەهەمان شێوە ئەویش ئەوی خۆش دەوێت ئەی تۆ چیتە لە خۆشەویستی خودا ؟!

بەڵێ مانای ئەم چەند فەرموودەیە ئەمەیە: بڕوانە ئەی بەندەکە چۆن خوای گەورە تۆی خۆش دەوێ،، بەڵام ئێستاش کاتی ئەوەیە کە ئەو خۆشەویستی یە ی ئەو بە ئەوینی خۆت بۆ ئەو بگۆڕیتەوە و وەڵامی ئەم خۆشەویستی یە بە پەیوەندی و نزیك بوونەوە و بەندایەتی ملکەچی پەروەردگار بدەیتەوە؟

زۆرێکیش هەن، کە لە ترسی دۆزەخ ملکەچی خوای گەورە دەبن نەك لەبەر خۆشەویستی خودا.

برایان ئەم مانایە زۆر گرنگە، پێویستە خەڵکی بیرۆکەی خۆیان سەبارەت بە پەیوەندیان لەگەڵ خودا بگۆڕن، ئێمە لە مردن دەترسین، لەگۆڕ لە دۆزەخ، ترس بنەمای پەیوەندیان نی یە بەخوداوە بەڵکو بنەمای پەیوەندی‌یەکە ئەوەیە کە تۆ خۆشت دەوێ وە بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەو چەند ئایەت و فەرموودە زۆرانەن کە خوای گەورە تیایدا

---

١ ـ مسلم و إمام أحمد لە ئەبو هريرەوە.

هەوالّمان پێ دەدات کا تاچ ڕادەیەك خۆشی دەوێین، سەیری ئەم ئایەتە پیرۆزە بکە﴿فَسَوْفَ يَأْتِي ٱللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ﴾ المائدة: ٥٤. هەمیشە ئەو بە خۆشەویستی خۆی بۆ ئەوان دەست پێ دەکات.

من خوای گەورە ناپەرستم لەبەرئەوەی کە لێی دەترسم بەڵکو بۆیە دەیپەرستم لەبەرئەوەی کە خۆشم دەوێ. کاتێ کە مرۆڤێك مرۆڤێکی دیکەی خۆش دەوێ بنەڕەت لەوەدایە کە چاوپۆشی لێ بکات و لێی خۆش بێت، لەبەر ئەوە هیچ پێمان سەیر نی یە کە گوێمان لە خوای گەورە بێ کە دەفەرموێ: ﴿كَتَبَ عَلَىٰ نَفْسِهِ ٱلرَّحْمَةَ﴾ الأنعام: ١٢.

## خۆشەویستی خودا لە کوێدایە؟

کەسێك دەپرسێ: چۆن خوای گەورە ئێمەی خۆش دەوێ و دوچاری کۆسپ و گرفت دەبین، کەسێك نی یە کە دوچاری گرفت نەبێ، هەندێ جار دونیای لەبەرچاو ڕەش دەبێ، ئەی کوا خۆشەویستی خودا؟ پێم وایە کە تاقی کردنەوەی خودایی بۆ ئەوبەندانەی کە خۆشی دەوێن و جۆرێکە لە پاکسازی لە دونیا، ئەو پاکیان دەکاتەوە لە گوناهێ کە لە دونیادا ئەنجامیان داوە.

گومانم وایە کە کۆسپ و تاقیکردنەوە کە لە بەندە ڕوو دەدات جۆرێکە لە وریایی دان، لە کاتێکدا نوقمی گێژاوی تاوانەکانە، خوای گەورە گرفتیان بۆ دەنێرێ هەتا پێی دەفەرموێ: (من ئامادەم)، یان چاکەکانی ئەو کەسە کەمن جا خوای گەورە خۆشی دەوێت و جا دەیەوێ پلەو پایەی بەرز بکاتەوە تاقی دەکاتەوە هەتا دەیخاتە بەهەشتەوە... بەڵێ، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ (هەر موسڵمانێك دوچاری غەم و پەژارە، یان دانەوینەوە، یان دەرد و ئازاری درێژخایەن، تەنانەت گەر دڕکێکیش بێت کە بە لەشی بکەوێت ئەوا خوای گەورە بەهۆیی یەوە لە تاوانەکانی دەبورێ).[1]

برایان ئایا دیتتان کە تاقی کردنەوەی خودایی هەمیشە بریتی نی یە لە تووڕە بوونی خوای گەورە.

---

١ـ بوخاری لە عائیشەوە (ﵵ).

خۆشەویستی خودا لە ژیانی ئەمانەدا

ئەوانەی کە لەگەڵیان دانیشتووم و لەم بارەیەوە دواندومن، هونەرمەند خاتوو سوهێر البابلی:

حاجیە سوهێر، کەی هەستت کرد کە پەروەردگار خۆشی دەوێیت؟ کاریگەی ئەو لەسەر تۆ چی یە؟

کاتێ کە هەست دەکەم کە پەروەردگارم لەگەڵە و دەمبینێ، دڵم ئارام دەگرێ، هەست دەکەم کە پەوەردگارم لەکاتی نوستنمدا چاودێریم دەکات، لە کاتی خواردنم و لە منداڵەکانم و لە هاوڕێکانم... لەبەر ئەوە هەمیشە دەیدوێنم، چونکە من خۆشم دەوێ، خۆشم دەوێ لەبەرئەوەی زۆر شتی پێ بەخشیوم و لەزۆر شت ڕزگاری کردوم زۆر بە قەشەنگی ڕایگواستوم، بەداخەوە من لە دونیادا زۆر وون بوو بووم، هەمیشە غەمم ئەوە بوو ئایا لەم نمایشەدا سەرکەوتووم، فلان کەس زۆر لە من باشتر بوو، فلان کەسیش زیاتر لەمن سامانی پێکەوە ناوە... هتد، بەڵام من چەند تاوێکی ئیمانی ڕاستەقینەم هەیە، هیچ بەندەیەکی موسڵمان، یان گەلێکی موسڵمان نی یە ئەگەر نا چەند تاوێکی ئیمانیان هەیە...

ئەو هەڵە دەکات و، پاشان لە خودا دەپاڕێتەوە(اللهم أغفرلي) ئەمە خۆشەویستی خودایە، لەبەرئەوە کە بەندە دەزانێ کە خوای گەورە زۆری خۆش دەوێ و ئەو خولقێنەریەتی، چۆن وازی لێ دێنێ؟ یەکەمین جار، کە بەم ئاڕاستە جوان و ئازیز و بەڕێزەدا هاتم... نەمدەزانی کە پێویستە چی بکەم؟ چی پێویستە، کە بیلێم؟ بەڵام زانیم کە پێویستە من گفتوگۆ لەگەڵ خودا بکەم و لێی بپاڕێمەو و نوێژەکان بخوێنم... شتانێکی زۆر سادە، بەڵام زۆر زۆر قەشەنگ، لە دوای بەجێ هێنانیان هەست بە ئارامی و دڵنیا یەکی نامۆ دەکەم، تەنانەت من زۆر دەخەوم و لەخەویشدا زۆر ئارامم، بڕوام پێ بکە من زۆر بەم ئاڕاستە و ئاینەم شادومانم وە زۆر بەولاوە بەختەوەرم کە بەڵێن و پەیمان دەدات و ڕێگەی خودا دەدۆزێتەوە و خوای خۆش دەوێ و خوای گەورەش ئەوی خۆش دەوێ...

لە قسەکانتدا ووتت لەگەڵ خودا دەدوێم... چی دەڵێیت؟

دەڵێم: پەروەردگارا کەم و کورتی یەکانم لەسەر زەوی و لـەژێر زەوی و لـەڕۆژی دوایـدا بپۆشە نەك هەر خۆم بەڵکو لەگەڵ منداڵ و خوشك و براو کەسەکانم و تەواوی موسـڵمانان بەگشتی.

بێ گومان تۆ لە ژیانت زۆر ئەزموت تێپەڕانـدەوە، ئـەو هەڵوێـستە چـی یـە کـە لـە بەردەمیدا ڕاوەستاویت و ووت پەروەردگار خۆشی دەوێم؟

زۆر جار لە بواری شانۆ و تەمسیلی یەوە شەیتان لێم نزیك دەبێتەوە و دەڵێت: کۆمەڵە ئەڵقەیەك بە حیجابەوە نمایش بکە. منیش هیچ سامانێکم نی یە وەك ئـەوەی کـە پێـشتر بەدەستمەوە بووە، تێبینی ئەم دۆخە زۆر بەباشی بکەن ئێمە لە ڕۆژگارێکداین مادە تیایدا زاڵە(چەندت هەیە و بایی ئەوەندی) تەنانەت گەر ڕۆشنبیریش نەبیت، یان ئاین پەروەریش نەبیت، هەمیشە من دەڵێم: پـەروەردگارا کـار ئاسـانیم بـۆ بکـە، مـن پابەنـدیم زۆرە و خەرجی تەواوی خۆم هەیە، هەمیشە هەست بە سانایی و ئاوەڵای دەرگـای ڕەحمـەتی خـوا دەکەم لەبەرئەوە هەمیشە داوای چاکەی لێدەکەم، تەنانەت پـێش ئـەوەی ئامـادەی ئـەم بەرنامەیەش بم داوای چاکەم لێ کرد، هەتا بزانم ئایا ئەوەی کە دەیلێم باشە، ئایا دەتـوانم لەبەر خودا ئەو پەیامە بگەیەنم، هەروەها لەبەرئەمە، من پێم خۆش نەبوو ئەمە بلێم ـ لە نوێژی بەیانیدا، یان لە شەونوێژمدا هەمیشە دەڵێم :((اللهم إجعل هذا اليوم كلـه لوجهـك الكريم وإجعلني أعمل عملا صالحا)) بەڵێ هیچ ڕۆژێك تێناپەڕێ کە من لەبەر خاتری ئەو خودایە کارێکی باش ئەنجام نەدەم.

ئەوەش بزانن: کە حاجی سوهێر کاتێ کە بەم دوعایە دەپاڕایـەوە ڕەنگـە نـەیزانی بـێ ئەمە دوعاو نزای پێغەمبەرە لە نوێژی بەیانیدا حـەزرەت هەمیـشە لـە نوێـژی بەیانیـدا دیفەرموو: ((اللهم هب لي من لدنك عملا صالحا يقربني إليك)).

سبحان الله... حاجیە سوهێر تۆ وزەیەکی زۆر گەورەی سەر تەختی شانۆ بویت، دەزانم کە ئێستاش هەروایت... ئایا ئەمە ڕاستە؟!

ـ بەڵێ من ئەوەم زۆر خۆش دەوێ، دڵنیابن کە کەسێك پاش پابەند بوونی هەمان گیان و هەمان ناخی هەیە، بەڵام جیاوازی یەکە ئەوەیە کە ئەمەیان لەسەری پاداشت وەردەگرێ، بەڵام ئەمەیان پاداشتی لەسەر وەرناگرێ، من هەروەك خۆم وام، هیچم لە کەسێتی خۆم ون نەکردوە، گەر داوای بەشداری کردنم لێ بکرێت لە کارێکی شانۆیی بەنرخ لە کارە ئیسلامی و مێژوویەکان ئەوا دودڵ نابم لە ئەنجام دانی.

ـ بەڵێ سوهێری بابلی لە ڕوی وزە و چوست وچالاکی هەمان کەسایەتی پێشووە، بەڵام لە ڕووی ئەخلاقەوە گۆڕاوە.

من هەست دەکەم تۆ لە پەروەردگار نزیکی، ئایا تۆ دەترسی لەوەی کە ئەم پەیوەندی یە ڕوو لە خراپی بکات؟

گەر ئەوە ڕویدا ئەوا من بەتەواوی کۆتاییم پێ دێ، بەشێوەیەکی زۆر سامناك دۆڕاوم، من لە پاش ئەوە هیچم پێ ناکرێ، هێشتا زۆرم لە ڕێگەدایە، هەموو ئەوەی کە ئەنجامداوە دڵۆپێکە لەدەریایەك، ئەوەی کە دەبینم تەنها ئەوەیە کە کەمێك تەنگەڵانیم خستۆتە سەر ناخی خۆم، لەسەرەتای پلە بەندی و پۆشینی حیجابدا چەند جارێك سەردانی کەعبەم کردوە، بەڵام هەستم بە پەژارەیی دەکرد و بەخۆم دەوت، من چیم بەخۆم کرد؟ ئایا من شێت بووم؟ بۆچی من خۆم نانوێنم لە کاتێکدا کەبەرێزم؟ لە کوێ سامان و خەرجی بێنم؟ بەردەوام نوێژم دەکرد وسوژدەم دەبرد و دەگریام و دەگریام، ئەموت ئەی خودایە، ئایا من لەسەر ڕاستیم، یان نا؟ من بە شێوەیەکی هیستری دەگریام هەتا هەموان ئاوڕیا دایەوە بەلامدا، پاشان گەڕامەوە شوێنی نیشتەجێ بوونم، من دەمەوێ ئەوە بزانم ئایا لەسەر ڕاسیتم، یان نا؟ هەر لە کاتی پێشوازی کردنمدا فەرمانبەرێك هەواڵی پێدام کە وتارێکم بۆ هاتووە، وتارەکەم وەرگرت و خوێندمەوە لە ژوورەکەم کە تیایدا نوسرابوو(ئەی خوشکە ئازیزەکە، ئەی هونەرمەندە گەورەکە، ئاوڕ بۆ ڕابردوو مەدەرەوە، تۆ پێشەنگی و بۆ پێشەوە بڕۆ بە سوپاسەوە سوژدەم بۆ خودا برد ! هەر لەو کاتەوە گومان لای من بە تەواوی کۆتایی پێ هات، دەکرێ کە پەروەردگار بەندەکانی خۆی تاقیبکاتەوە، من تاقیکرامەوە و زیاتر و زیاتریش تاقی دەکرێمەوە.

سوێند بە خوا ئەی لاوان نازانم کێ ئەو وتارەی بۆ ناردم... ئـەو فەرمانبـەرە هـەواڵی پێدام کە بوك و زاوایەك هاتون و وتارەکەیان بەجێ هێشتووە.

کە تۆ لە لوتکەی هەوڵی هونەریتدا بوویت چـۆن توانیـت ئەمـە بکـەیت، وە تـۆ کـە ئەستێرەیەکی کۆمیدی بویت چۆن توانیت لە مانە هەمووی بگەڕێیت؟

-سوێند بەخوا نازانم چیت پێ بڵێم، بەڵام دەتوانم بڵێم کە خۆشم دەوێ وە ئەگـەر داوام لێ بکات خۆم سەربڕم ئەوا ئەنجامی دەدەم.

حاجی سوهێر ئەمە دەڵێت و ئێمەش بەم بۆنەیەوە ئەو ئایەتە دێنینەوە، کە دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّا كَتَبْنَا عَلَيْهِمْ أَنِ اقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ أَوِ اخْرُجُوا مِن دِيَارِكُم مَّا فَعَلُوهُ إِلَّا قَلِيلٌ مِّنْهُمْ ۖ وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُوا مَا يُوعَظُونَ بِهِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَشَدَّ تَثْبِيتًا﴾ النساء: ٦٦.

وەڵامەکە بەسانایی ئەوەیە کە پەروەردگار دەیەوێت، خوای گەورە دەفـەرموێمن ئـەم ئومەتەم خۆش دەوێ و دەمەوێ لە بەنـدە چـاکەکانی نوێنـەری ویـستەکانی پـەروەردگار هەبێت.

چـی دەکـەیت لـەپێناو پاراسـتنی ئـەو خۆشەویـستی یـەی کـە خـوای گـەورە پێـی بەخشیویت؟

ـ خۆشەویستی بـە خۆشەویـستی دەگۆڕمـەوە، ئـەو نـاز و نیعمـەتی خـۆی ڕژانـدوە بەسەرمدا و لەنێو بەخشندەی خۆیدا نوقمی کردوم و زۆری پێ بەخشیوم و چەندین یاسـاو ڕێسای بۆ داناوم، منیش بەپێی توانا پابەند دەبم پێ یەوە ئەمـەش ڕاڤـەی خۆشەویـستی منە بۆ ئەو.

ئایا پابەندیت بە پلە بووە، یان ئەنجامی هەڵوێستێك، یـان تاقیکردنەوەیـەکی دیـاری کراو بووە؟

ـ دیتم کە من زۆر لەتەمەندا گـەورەم، جـوانیم خەریکـە لـە دەسـت دەچـێ خـەڵکی بەدەورو پشتمدا دەگەڕێن هەروەها هونەریش کەم بویەوە، ووتم بە خۆم: بۆچی خۆم ڕزگـار نەکەم لە کاتێکدا کە من لەم تەمەنـە سـامناکەدام ؟ هـەروەها شـتێکی دیکـە هـەبوو، ئەویش ئەوەبوو کە شەرمەزار دەبووم کە کەسێك لەبەرامبەرمدا باسی ئـاینی بکردایـە و من لێی بێ ئاگا بووم، نازانم کە چۆن دەپارێمەوە، لە بەیانیدا چی دەڵێم، لەڕۆژئاوابوون لە خۆم پرسی: لەسەرچی لێم دەپرسنەوە؟ ئایا لەسەر شـانۆ و کارەکـانم؟ دەبـێ مـن لەگـەڵ خۆمدا هەڵوێستەیەك بکەم، بە خۆمم ووتەوە: من فێری شانۆ و گۆرانی و سەما و هـەمو ئەو شتانە بووم کە خزمەتی شانۆ دەکات، بـەڵام تـا ئێـستا فێـری وشـەیەك نـەبووم لـە قورئان؟ لەبەر ئەوە دەکرێ کە ئەم ڕێگایە بگرم.

-کاردانەوەی هاوڕێ و کەسەکانت پاش پابەند بونـت چـی بـوو؟ ئایـا پیـشوازیان لێ کردیت، یان بەلایانەوە ئەم کارە پەسەند نەبوو؟

ـ والله ئەوان ئازادن... من بەوان نە دەچمە بەهەشت نەدۆزەخ، ووتیان ئێمە بە خـاتری تۆ دەڕۆین بۆ بینینی شانۆ، ئەی لە ئێستا بەدواوە کێ ببیـنین ؟ بـەڵام هـەموو مرۆڤێـك پێویستە بەرژەوەندی خۆی بزانێ وە ئەوەش بزانێ کە ڕۆژێك لەبەردەم خوادا ڕادەگیرێ .

# چەند چیرۆکێکی ڕاستەقینە

## خوای گەورە و ئاینەکەی سەرخست، خوای گەورەش ئەوی سەرخست:

ناوم (نەرمین)ە تەمەنم سی ساڵە لە قوتابخانەی زمان لە فەرەنسا خوێندومە پاش ئـەوە چومەتە کۆلێژی ئەلسن و، پاشان کۆچم کردوە بۆ بەریتانیا، هەشت سـاڵ لـەوێ ژیـاوم و، پاشان گەڕاومەتەوە بۆ میسر و ماوەی دومانگە لێرەم، من بۆتان دەگێڕمەوە چۆن ڕووم لە ئیسلام کرد، چۆن سەرکەوتم و چۆن ئیسلام لە ژیانی ڕۆژانەمەدا دەچەسپێنم.

من کیژێکم باوەڕم بە ئیسلام و بنەماکانی هەیە، من نوێـژم دەکـرد و ڕۆژوم دەگـرت، بەڵام کاتێ کەسەفەرم کرد و ئاشوب و ژیان لەوێ دەستیان گرتم، زۆر دژوار بوو بۆ من کە حیجاب بپۆشم، من بەنیاز بووم لەوێ بخوێنم و کار بکەم، لەبەرئەوەی کە ئەوان ئیـسلام و حیجاب بەدواکەوتویی لەقەڵەم دەدەن، گەر بیرم لە حیجاب بکردایەتەوە ئەوا هیچ شتێکم لەوێ چنگ نەدەکەوت.

دواتر گەڕامەوە میسر و لە لایەن لاوێك داخواز کرام بەچوار ڕۆژ پێش نوسـینی مـارە بڕین چاوەڕوانی بووم تا بڕۆین پێکەوە لە بازاڕ هەندێ کاڵا بکڕین، بەڵام ئەو نەهات، ئێمە لە ڕەمەزاندا بووین پاش ئـەوەی کـە نوێـژی تـەراویحمان کـرد و گەڕاینـەوە یـەکێك لـە هاوڕێکانم هەواڵی پێدام کە لە کارەساتێکدا مردوە، دەرونم تیك شـکا، دوای ئـەوەی کـە پێشتر هەستم کرد کە هەموو دونیا لەنێو دەستم دایە، بـەڵام بـەم هۆیـەوە وام زانـی کـە هیچم نی یە، کەسم نی یە کەلێم بپرسێتەوە.

هەستم کرد کە دونیا لەلام لە مێشێ ساناترە، لەبەرئـەوەی کـە ئێمـە بـەڕۆژوو بـوین هانی خۆمم دا کە حیجاب بپۆشم، پاشان جارێکی دیکە گەڕامەوە بۆ بەریتانیا، دەترسـام ئەمە کاریگەری بۆ سەرکارەکەم هەبێ من تەنها موسڵمانێك بووم، لە خـودا دەپاڕامـەوە کە بەم شێوەیە وەرم بگرن و لەکارەکەم دەرم نەکەن، سوپاس بۆ خودا هـەموان پەسـندیان کردم، دیتم کە دەرگای ماڵەکانیانم بۆ دەکەنـەوە هەسـتم کـرد کـە خـوای گـەورە کاتـێ مرۆڤێکی خۆش دەوێ لە دڵی خوڵقێنراوەکانیشیدا خۆشەویستی دەکـات، مـن زیـاتر لـە

خودا نزیك بومەوە و فەرزی حەج بەجێ هێنا، لەوێدا هەستم بە شـتێکی زۆر جـوان کـرد ئەویش ئەوەبوو کە خەڵکی بەهەموو ڕەگەزەکانیانەوە داوای لێخۆش بوون لە پـەروەردگار دەکەن هەروەها هەستم کرد کە بەختەوەی بەندە لە نێزك بونەوەیەتی لـەخودا، نـەك هـەر شتێکی دیکە. دواتر گەڕامەوە بۆ بەریتانیا، سوپاس بـۆ خـودا خـەڵکی پرسـیاریان لـێم دەکرد سەبارەت بە حیجاب، بەڵام بە داخەوە وێنـەکانی ڕاگەیانـدن هـەمویان شـێواون،، چونکە ئەوان پێیان وایە هەر کەس حیجاب بپۆشێ بە شێوەیەکی باش قسە و کار ناکات، سوپاس بۆ خودا دیتم کە خودی حیجاب خەڵکانی دەوروبەرم دەگۆڕن، بـۆ نمونـە گـەر لـە ئاهەنگێکدا لەگەڵیان بومایە داوای مەی، یان نەدەکرد، دیتم کە ئەوان ڕێـز لـە حیجـاب دەگرن، ئەمەش وای لێ کرم کە خۆم پەیوەست بکەم بە کۆمەڵێ شتی دیکەوە کـە خـوای گەورە داوام لێ دەکات کە پێوەی پابەند بم، هەندێ کات بـەزەیم بـە خـەڵکانێکی دیکـە دەهاتەوە لە ژیاندا کە هەست بەم کامەرانی یە ناکەن ئەوان سەیری تۆ دەکەن وەك ئەوەی کە زەرەر مەندی، بەڵام تەواو پێچەوانەکەی ڕاستە.

یەکەم جار کە سەفەرم کرد پەسەند کردنی ئەم حیجابە زۆر ئاسان نەبوو سەبارەت بەوان ئەوان وایان دەزانی کە ئەمە بەشێکە لە کەلەپوری ئێمە هەتا ئەو کاتەی کە ویسم حەج بکەم، بەڵام بەرێوەبەرەکەم بو بە ڕێگرم وە پەسەندی نەکرد مۆڵەتم بدات، هەتا لە نوسینگەکەی گریام و هەواڵم دایە کە دەبێ بچمە حەج، لەبەرئەوەی من ماندوم و هەست دەکەم کە حەج کردن هاوکاریم دەکات، سوپاس بۆ خودا بەمە ڕازی بوو، وە کاتێ کە گەڕامەوە پێی ووتم تۆ زۆر گۆڕاوی وە من زۆر شادمانم بەم ڕۆیشتنەت، بەڵام لەوێ هەمیشە سیاسەتی (سیاسەتی لێدان لە ژێر پشتێن) لەئارا دایە، ئەوان هیچ سەرە موچەو بەرز کردنەوەیەکی موچەیان بۆ من نەدەبەست، بەڵام من بەختەوەر و ڕازی بووم بەحیجاب و پابەندیم بە ئیسلامەوە.

کاتێ کە خوشکە(نەرمین) ئەم سەرگوزشتەی یەی دەگێڕایەوە من ئەو ئایەتـەم وە یـاد هاتـەوە کـە دەفـەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَنصُرُواْ ٱللَّهَ يَنصُرۡكُمۡ وَيُثَبِّتۡ أَقۡدَامَكُمۡ﴾ محمد: ٧ ئەو لە وڵاتێکدا حیجابی پۆشی وا گومان دەبات ئیسلام شتێکە کـە

ڕێـز لـە لایـەنگرانی ناگرێـت، تـۆ خـودا و ئاینەکـەت سەرخـست و پابەنـد بویـت بـە فەرمانەکانی خوداوە، خوای گەورە سەرکەوتنی پێ بەخشی هەتا ئەوانەی دەوریشی ڕێزیان لەو حیجابەی دەگرت.

ئەی لاو سەرنج بدە کە گرفتی مرۆڤ و ئازارەکانی لەسەر دەم و چاوی بەدەر دەکەون لەبەرئەوە چ لە نەرمین وچ لە حاجیە سوهێریش دەبینین کە ڕویان ئارام بوو و هەر کەسێك ڕوو لە خودا دەکات نیشانەی خۆشەویستی خودا لە چاوانیا دەبینرێ، لەبەرئەوەی کە دڵ بەختەوەرە هەروەك خوای گەورەش لە قورئاندا دەربارەی هێمای خۆشەویستی بۆ بەندەکانی دەفەرموێ: ﴿سَيَهۡدِيهِمۡ وَيُصۡلِحُ بَالَهُمۡ﴾محمد: ٥.

## نیشانەکانی خۆشەویستی خودا بۆ بەندە:

(١) زۆری گوێڕایەڵی: لە نیشانەکانی وەرگرتنی گوێڕایەڵی ئەوەیـە کـە خـوای گـەورە لەبارت بکات بۆ ئەنجام دانی گوێڕایەڵی یەکی دیکە .

(٢) هاوەڵی باش: خوای گەورە شیاو و لەبارت بکات بۆ چەند هاوەڵێك کە یارمـەتیت بدەن بۆ دامەزراوی لەسەر ملکەچی کردنی پەروەردگار.

(٣) خوای گەورە بەڵا و کۆسپ نەخاتە ئاینەوە: عومەری کوڕی خەتاب هـەرکاتێ کـە دوچاری گرفتێ دەبوو سوپاسی خوای لەسەر دەکرد و کاتێ کە لەو بارەیەوە پرسیاریان لێ دەکرد دەیفەرموو لە بەر ئەوەی گرفتەکەلە ئاینم دا نەبوو .

(٤) خوای گەورە چاکەی بۆ هەر کەسێ بوێ لە ئیسلام شارەزای دەکـات: زۆر شـورەی یە بۆ لاوێ کە چەند زمانێ بزانێ، بەڵام نەزانێ قورئان بخوێنێتەوە.

(٥) گەر خوای گەورە بۆ سەرکەوتنی ئاینەکەی، یان کاری چاکە بەکارم بهێنێ بـەڵێ: لە نیشانەکانی خۆشەویستی خودا بۆ بەندە ئەوەیە کە کەسانی دیکەی پێ چاك بکات.

(٦) پێویستە هەمیشە ئاواتت بۆ سەروتر هەبێت: عومەری کوڕی عبـد العزیـز(ﷺ) دەفەرموێ: (من نەفسێکی عەودالّم هەیە، ڕۆژێك عـەودالّ بـووم کـە ئامۆزاکـەم بخـوازم، لەبەر ئەوە خێزانم لەگەڵ پێکەوە نا، پاش ئەوە عەودالّی ئەوە بووم کە ببمە والی مـەدینـە

تا داد پەروەری لە مەدینەی پێغەمبەر(ﷺ)بەرپابکەم، بۆیە بومە والی مەدینـە، دواتـر عەودالّی ئەوە بووم کە ببمە خەلیفەی ئیمانـداران و بـووم وە ئێـستاش نەفـسم عـەودالّی شتێکی بەرزترە من ئێستا عەودالّی بەهەشتم.

(٧) ئارامی دەکەوێتە ناو دڵ: لەسەر دونیادا هیچ ئاخ هەڵکێشانێك نابێت.

(٨) تاقیکردنەوە: من وادەبینم کە تاقیکردنەوە هۆیەکە لە هۆکارەکانی خۆشەویـستی خوا بۆ بەندەکەی.

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: ((ما یزال البلاء بالمؤمن والمؤمنة في نفسه و ولـده و مالـه حتى یلقى الله وما علیه خطیئة)).[١]

(٩) وام لێ بکات ڕقم لە گوناه بێتەوە: ئادەمیزاد لەباربێت بۆ تەوبە کردن.

(١٠) هەست کردن بە ڕازیبوون: هەندێ جار کەسانێك هەن کە هەست بەخشینی خـوا ناکەن لەسەریان، هەست کردن بە ڕازیبوون مرۆڤ لەهەر فتینەیەك دەپارێزێ.

(١١) خۆشەویستی خەڵکی بۆ بەندە: خوای گەورە خەڵکی وا لێبکات، کـە لـێم ڕازی بن و خۆشم بوێن و خۆشیان بوێم.

## کەسانێك کە خوای گەورە خۆشی ویستون:

### ئەبو هریرە(ﷺ):

ئەبو هریرە چو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و سکاڵای دایکی کرد و وتی ئـەی پێغەمبـەری خوا من دایکم بانگ دەکەم بۆ ئیسلام، بەڵام ئەو سەرپێچی دەکات، باسی ئیـسلامی بـۆ دەکـەم سـوکایەتیم پـێ دەکـات، داوا لـە خـودا بکـە کـە هیدایـەتی دایکـم بـدات، پێغەمبەر(ﷺ) دەستی بەرز دەکاتەوە و دەفەرموێ پەروەردگارا هیدایـەتی دایکـی ئـەبو هریرە بدەیت) ئەبو هریرە دەفەرموێ بەو نزایەی حەزرەت زۆر شادومان بـووم، گەڕامـەوە بۆ ماڵەوە و لەبەردەرگا وەستام، دایك وتی ئەوە کێ یە ؟ ووتم: ئەبو هریرە، ئەویش ووتی: ئەی ئەبو هریرە، منیش ووتم بەڵێ، دایکم ووتی: أشهد أن لا إلـه الا الله وأن محمـدا رسـلو

---

١ـ ترمذی لە ئەبو هریرەوە.

الله، پاشان ئەبو هریرە دەڵێت گەڕامەوە بۆلای حەزرەت(ﷺ) و پێم ووت: ئەی پێغەمبەری خودا مزگێنی بێت خوای گەورە وەڵامی نزاکەتی دایەوە و، دوعا بکە، کە من و دایکم لە لای ئیمانداران خۆشەویست بین، پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (پەروەردگارا ئەم بەندەیە و دایکی لای ئیمانداران خۆشەویست بکەیت و ئیماندارنیش لای ئەمان خۆشەویست بن) ئەبوو هریرە ئەفەرموێ: لە ژیانمدا بە هیچ باوەڕدارێ نەگەیشتوم و خۆشی نەویستبم، کەواتە لە نیشانەکانی خۆشەویستی خودا ئەوەیە کە وا لە خەڵکی بکات خۆشیان بوێت و لەسەرزەویدا پەسەندت بکەن.

## خەدیجە(رضي الله عنها):

خەدیجە لەسەرمەرگ دایە و جبریل دادەبەزێتە سەرزەوی و بە حەزرەت(ﷺ)دەفەرموێ: (ئەی محمد سلاوی خوای گەورە بگەیەنە بە خەدیجە و پێی بڵێ: خوای گەورە مزگێنیت دەداتێ بەتەلارێ لە بەهەشت کە لە قامیش (مرواری) دروست کراوە، ئەو کۆشکە نە ژاوەژاوی تێدایە و نە نەخۆش کەوتن) بۆچی جبریل لە ئاسمانەوە دادەبەزێ لە کاتێکدا کە خەدیجە(رضي الله عنها) پاش ٢ تا ٣ دەقیقەی دیکە کۆچی دوایی دەکات، ئەوە شاهیدی دانێکە بۆ مرۆڤایەتی لەسەر خۆشەویستی خودا بۆ خاتو خەدیجە (رضي الله عنها).

## ئەبو بکر(رضي الله عنه):

ئەبو بکر (رضي الله عنه) لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دانیشتبوو لەم کاتەدا جبریل ( علیة السلام) هاتە خوارێ و بە پێغەمبەری خوای فەرموو: (ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، خوای گەورە دەفەرموێ بە ئەبو بکر بڵێ: کە خودا لە تۆڕازی یە ئەی ئایا تۆ لە ئەو ڕازیت؟!!)

ئایا دیتان کە ئەم خۆشەویستی یە گەیشتۆتە چ ئاستێ.

## ئوبەی کوڕی کەعب:

کاتێ کە سورەی(البینة) هاتە خوارێ، ئوبەی کوڕی کەعب جولەکە بوو وە موسڵمان بو بوو، حەزرەت(ﷺ) فەرمووی (کوا کوڕی کەعب؟) ئوبەی لەو کاتەدا هات، پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی: (ئەی ئوبەی خوای گەورە فەرمانی پێداوم کە سورەی (البینة)ت بەسەردا بخوێنم، ئوبەی ووتی: ئایا ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، خوای گەورە ناوی هێناوم؟ حەزرەت(ﷺ) فەرموی: بەڵێ و ئوبەی کوڕی کەعب دەستی کردە گریان.

بەڵێ برایان، خۆشەویسی خودا بۆ بەندەكانی سەرسوڕمانی تێدا نیە. لە كۆتاییدا... لەو پەروەردگارەمان دەپاڕێینەوە كە ئەم هەموو سۆز و خۆشەویستی یەی پێداوین، كە هەموو شەوێ بانگ دەكات: (ئایا كەسێ داوای پێویستی یەك دەكات هەتا پێ ی بدەم) ئەو پەروەردگارە لە هەموومان ببورێ و لێمان ڕازی بێت... أجمعین آمین وە لە بەهەشتی یەكان قەبوڵمان بفەرموێ أجمعین و هیدایەتی لاوانی موسڵمان بدات یٚمین یٚمین

وصل اللهم وبارك علی سیدنا محمد(ﷺ):

## ئارامگرتن (الصبر):

لە ڕاستیدا هەندێ كەس دێن و دەڵێن ئێمە گرفتێكمان هەیە وچارەسەرێكی كرداری مان دەوێ بۆی وە كاتێ كە پێیان دەڵێم ئارام بگرن لەسەر ئەو گرفتە، ئەوانیش پێم دەڵێنەوە ئێمە ڕێگە چارەیەكی كردارێمان دەوێ وەك ئەوەی كە بڵێی ئارامگرتن هەر تەنها قسەیە و بەس، ئەمەش زۆر ئازارم دەدات...

ئێمە كاتێ كە باسی ئارامگرتن دەكەین، ئەوا ئێمە لەسەر نیوەی ئیمان دەدوێین و سەبارەت بە بنەمایەكی سەرەكی لە بنەماكانی ئاینەكەمان دەدوێین...

ئەوەی كە هاوكاریت دەكات لەسەر ئارامگرتن، ئەوەیە كە نرخی بزانی و بیناسی، چونكە تەواوی گەردوون لەسەر ئارامگری وەستاوە كە تێبینی بكەین دەبینین كە گەردوون لەسەر بیرۆكەی پلەداری وەستاوە، خۆر ڕاستەوخۆ لەنێو جەرگەی ئاسمان دەرناكەوێ بەڵكو هەڵدێ و هەنگاو بەهەنگاو پرشنگی زیاد دەكات، وە كشتوكاڵ خێرا سەر هەڵنادات بەڵكو پێویستی بە ئارامی و كات و چاودێری هەیە، هەروەها كۆرپەش لە سكی دایكیدا دەست بەجێ گەورە نابێ تەنانەت خوای گەورە كاتێ كە زەوی و ئاسمانەكانی دروست كرد لە٦ ڕۆژدا، هەتا فێرمان بكات كە ئەم گەردوونە وردە وردە پەرەی سەندەوە وە ئەم كارەش پێویستی بە ئارامگری دەبێت هەروەها ناوی خۆی ناوە بە (الصبور) پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: ((لا أحد أصبر علی اذی یسمعه من الله، إنه یشرك به، ویجعل له الولد، ثم هو یعافیهم ویرزقم)).[1]

---

١ـ إمام أحمد لە أبو موسی الاشعری یەوە.

ئەوپەروەردگارە تاك و تەنها و نەمرە خوایەکی بەئارامە و سەرپێچی دەکرێ و ئارام دەبێت، هەڵە دەکەین لەبەرامبەریدا و ئەو لێمان خۆش دەبێ و بەزەیی پێماندا دێتەوە.

ئێمە تێبینی شتێکی زۆر سەیر دەکەین کە بریتی یە لەوەی کە هیچ شتێك نی یە مەگەر لەسەر ئارامی وەستاوە... بۆ نمونە هیچ جۆرە ملکەچی یەك نی یە کە تۆ بەجێی بهێنی بەبێ ئارامگری، نوێژی بەیانی پێویستی بە ئارامی یە: ﴿وَأۡمُرۡ أَهۡلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصۡطَبِرۡ عَلَيۡهَا﴾ طه: ١٣٢، ملکەچی خۆنەویستن واتە بەخشین دان بە خەڵکی پێویستی بە ئارامگرتن هەیە، شەو نوێژ رۆژو گرن، حەج و واز هێنان لە گوناه و تاوان پێویستی بە ئارامگرتن هەیە.

## کارەکان هەمویان دەگەڕێنەوە بۆ لای ئارامگرتن.

### ئارامگرتن لە قورئاندا.

ئەو ئایەتانەی کە باس لە ئارامگری دەکەن گەلێك زۆرن: ﴿وَٱصۡبِرۡ نَفۡسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥۖ وَلَا تَعۡدُ عَيۡنَاكَ عَنۡهُمۡ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَا تُطِعۡ مَنۡ أَغۡفَلۡنَا قَلۡبَهُۥ عَن ذِكۡرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمۡرُهُۥ فُرُطٗا﴾ الكهف: ٢٨.

ئەم ئارامگریە لەسەر پەیوەستی ئیمانداران ، واتە لە هاوەڵی خراپ دوور بکەوەرەوە و ناخت پابەند بکە ((مع الذين يدعون ربهم بالغداة والعشي)) و لێیان دوور مەکەوەرەوە.

﴿وَٱلۡعَصۡرِ ۝١ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ ۝٢ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ﴾ العصر١-٣.

ئیمامی شافعی دەفەرموێ: (گەر لە قورئاندا جگە لەمە هیچ سورەتێك دەربارەی ئارامگرتن نەبوایە ئەوا ئەمە بۆ خەڵکی بەس بوو، لەبەر ئەوەی تەواوی ئەو شتانە دەگرێتەوە کە مرۆڤ پێویستی پێ یەتی و بە ئارامگرتنیش کۆتایی دێت.

﴿فَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ ٱلۡحُوتِ إِذۡ نَادَىٰ وَهُوَ مَكۡظُومٞ﴾القلم: ٤٨.

﴿وَٱسۡتَعِينُواْ بِٱلصَّبۡرِ وَٱلصَّلَوٰةِۚ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى ٱلۡخَٰشِعِينَ﴾ البقرة: ٤٥.

خوای گەورەش بە ئارامگرتن دەستی پێ کردووە، لەبەر ئەوەی کە یەکەمین یارمەتی دەرە کە یارمەتیت دەدات لە ڕێگادا.

﴿فَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ قَبۡلَ طُلُوعِ ٱلشَّمۡسِ وَقَبۡلَ غُرُوبِهَاۖ وَمِنۡ ءَانَآيِٕ ٱلَّيۡلِ فَسَبِّحۡ وَأَطۡرَافَ ٱلنَّهَارِ لَعَلَّكَ تَرۡضَىٰ﴾طه: ١٣٠.

﴿وَلَنَبۡلُوَنَّكُم بِشَيۡءٖ مِّنَ ٱلۡخَوۡفِ وَٱلۡجُوعِ وَنَقۡصٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِۗ وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ١٥٥ ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةٞ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ١٥٦ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ صَلَوَٰتٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَرَحۡمَةٞۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُهۡتَدُونَ﴾ البقرة ١٥٥-١٥٧.

هەروەها لە قورئاندا تێبینی شتێکی زۆر جوان دەکەین، ئەو خودایە هەرکاتێ کە بەسەرهاتی پێغەمبەرێکمان بۆ دەگێڕێتەوە ئەوا لە کۆتایی ئایەتەکەدا بۆمان کورت دەکاتەوە، بەسەر هاتی نوح پێغەمبەر لە سورەی هود لە دوولاپەڕەدا هاتووە لەم سورەتەدا وە لە کۆتایی ئەم دوو لاپەڕەیەدا ئەم ئایەتە هاتووە: ﴿تِلۡكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ

ٱلْغَيْبِ نُوحِيهَآ إِلَيْكَ ۖ مَا كُنتَ تَعْلَمُهَآ أَنتَ وَلَا قَوْمُكَ مِن قَبْلِ هَـٰذَا ۖ فَٱصْبِرْ ۖ إِنَّ ٱلْعَـٰقِبَةَ لِلْمُتَّقِينَ ﴾ هود:٤٩.

بڕوانــــه ئــــەم ئایەتـــە: ﴿إِنَّهُۥ مَن يَتَّقِ وَيَصْبِرْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾ یوسف:٩٠، ئەم ئایەتە كاتێ هاتۆتـە خـوارێ كـە پێغەمبـەر یوسـف سەركەوتنی بەدەست هێنا پاش چەند ساڵی دوور و درێژە لە ئارامگرتن.

هەروەها گوێ بۆ وەسیەتی خوا بگرە بۆ ئێمە كە دەفەرموێ:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱصْبِرُوا۟ وَصَابِرُوا۟ وَرَابِطُوا۟ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ آل عمران:٢٠٠.

لەڕاستیدا چەندین ئایەتی قەشەنگ هەیە لەم بارەیەوە و هەر هەمویان هەستمان بـەوە پێ دەكەن كە پاداشتی ئارامگرتن كۆتایی بۆ نی یە..

﴿إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّـٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ الزمر: ١٠ ئەو كەسەی كە ئـارام دەگرێت وەك ئەوەی كە پێویستە ئارامگری هەبێت , هیچ حسابێكی بـۆ نیـە... ناتوانـێ كۆتایی پاداشەكەی لەلای پەروەردگاری بێنێتە پێش چاوی خۆی، چەندەها پلە و چـەندەها پلەی هەیە.

## نمونەی ئارامگران لە پێغەمبەران

ئەم چەند نمونەیە دەخەمە پێش چاو تا بـەخۆت بڵێـی: كـە خۆشەویـستانی خـودا لـە پێغەمبەران دوچاری ئەمە هاتون و ئارامیان لەسەر گرتووە ئەی من چی؟!

### پێغەمبەر نوح (عليه السلام):

با پێكەوە بیهێنینە پێش چاو ٩٥٠ ساڵ قەومەكەی بانگ كرد: ﴿وَمَآ ءَامَنَ مَعَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٌ﴾ هود:٤٠.

زۆرترین ئەو ژمارەیەی کە ئیمانداران باسی لێوە دەکەن تەنها ٨٠ ئیماندار بوون، واتە هەر ١٢ ساڵ جارێك یەکێك ئیمانی بەخودا هێناوە، وە نوح هێشتا بە ئارامە و بەردەوام دەستیان دەگرێ ئەمە چی یە ؟ بۆ نمونە گەر تۆ هاورێ یەکت هەبێ و پێت بلێ: من هەرگیز نوێژ ناکەم و تۆش پێی بڵێی: (هاوار بۆ خۆت لەلای خودا)وە گەر لێت بدات، یان ئازارت پێ بگەیەنێ پێی دەڵێیت سوێند بەخودا نزای خراپت لێ دەکەم , بەلام نوح پێغەمبەر پاش ٩٥٠ ساڵ خوای گەورە پێی دەفەرموێ: کەشتی یەك دروست بکە، ئەو دەست دەکات بە دروست کردنی و بێ باوەڕان سوکایەتی پێ دەکەن وە پاش ئەوە کوڕەکەی دەبینێ کە ژێر ئاو دەکەوێ ﴿ وَنَادَىٰ نُوحٌ ٱبْنَهُۥ وَكَانَ فِى مَعْزِلٍ يَـٰبُنَىَّ ٱرْكَب مَّعَنَا وَلَا تَكُن مَّعَ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٤٢﴾ قَالَ سَـَٔاوِىٓ إِلَىٰ جَبَلٍ يَعْصِمُنِى مِنَ ٱلْمَآءِ ۚ قَالَ لَا عَاصِمَ ٱلْيَوْمَ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ إِلَّا مَن رَّحِمَ ۚ وَحَالَ بَيْنَهُمَا ٱلْمَوْجُ فَكَانَ مِنَ ٱلْمُغْرَقِينَ ﴾ هود: ٤٢ ـ ٤٣.

ئەم خۆڕاگریە چی یە؟ ئایا ئێمە ئارامگر نەبین؟

## ئەیوب پێغەمبەر(عليه السلام) :

٨٠ ساڵ بە بەختەوەری ژیا، پاش ئەوە ١٨ ساڵ بە نەخۆشی ژیا، کاتێ کە خێزانەکەی پێی فەرموو لە خودا بپاڕێوە، فەرمووی: من شەرم لە پەروەردگارم دەکەم، کە ٨٠ ساڵ ڕێزی لێ ناوم وە ناتوانم ١٨ ساڵ بەئارام بم ﴿وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّى مَسَّنِىَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴾ الأنبياء: ٨٣.

تێبینی ئەوە دەکەین کە ئەو پێغەمبەر بەڕێزە نەیفەرموو: پەروەردگارا ڕزگارم کە لەم دۆخەی کە تێیدام، بەڵکو فەرمووی من ئاوا و ئاوام و تۆش بەسۆزترینی خاوەن سۆزانی .

## زەكەریا پێغەمبەر (ﷺ)

كاتێ كە خوای گەورە یەحیای پێ بەخشی و خێزانی لـە منـداڵ بـوون كـەوتبوو واتـە تەمەنی زۆر گەورە بوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیوا بڕاو نەبوو بـەڵكو پـاش خۆڕاگریـەكی زۆر فەرمووی: ﴿رَبِّ لَا تَذَرۡنِي فَرۡدٗا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡوَٰرِثِينَ﴾ الأنبياء: ٨٩.

تێبینی ئەوە ئەكەین كە هەریەكە لە پێغەمبـەران، خـوا كردویـەتی بـە نمونەیـەك لـە نمونەكانی خۆڕاگری، واتە ئارام گرتن لەسە نەخۆشی، كوڕی لاسار، پاڕانەوە لە خودا.

## گەورەترین مرۆڤی بەئارام محمد پێغەمبەر(ﷺ) بووە.

ئەمەوێ شێوازەكانی ئەو تاقی كردنەوانەتان بۆ بژمێرم كە پێغەمبەر (ﷺ) لە ژیانیدا هاتۆتە ڕێگای، ئەمەی كە باسی دەكەم پێش كەشی دەكەم بەهەموو ئـەو كەسـانەی كـە گرفتیان هەیە و پێش كەش بەو دایكانەی كە بـەمردنی ڕۆڵـەكانیان جـەرگیان سـوتاوە و بۆیان گریاون.

باسەیر بكەین كە پێغەمبەر(ﷺ) وەك خۆشەویسترین خولقێنراوی خودا دوچـاری چـی دەبێت حەزرەت(ﷺ) بەهەتیوی لەدایك دەبێ، پاشان دایكـی كۆچـی دوایـی دەكـات و، پاشان مامی و پاشتر ٧ منداڵی، مرۆڤ كاتێ كە ڕۆڵەیەكی دەمرێ بـە درێـژایی تەمـەنی لەسەری دەگری، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ)منداڵەكانی لەچـەند تەمـەنێكی جیایـدا مـردون و دواین كوڕی كە مرد ابراهیم بوو لە كاتێكدا كە تەمەنی پێغەمبەر(ﷺ) زۆر گەورە بـوو، پێش مردنی بەسێ ساڵ ئەو بە لە دایك بوونی ابراهیم زۆر دڵ خـۆش بـوو، بـەلای مـاڵی هاوەڵانیدا تێدەپەڕی و پێی دەفەرموون: سەیری ابراهیم بكەن، وە پاش چـەند مـانگێكی كەم مرد و پێغەمبەر(ﷺ) بۆی گریا و پێی دڵتەنگ بوو، پاشان هەریەكە لە ڕوقیە و ئوم كلپوم و زەینەبی كیژانی پێغەمبەر(ﷺ) و خەدیجە (رضي الله عنها)و مامی مرد، كـە پـشتیوان و هاوكارێكی باشی بوو.

## ئەم هەموو تاقیکردنەوانە چین ؟؟!

پاش ئەوەی کە پێغەمبەری ڕاستگۆی دەست پاك پێ، یان دەوت درۆزن و شێت و پێی پێ دەکەنین و سوکایەتیان پێ دەکرد بە جۆرێ کە ناوەکەیان گۆڕی و بەلۆمەکراو بانگیان دەکرد ئەمە بوبە مایەی ئازار گەیشتن بە یارانی بۆیە پێغەمب پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( ئەوان سوکایەتی بەلۆمەکراو و نەفرەت لە لۆمەکراو دەکەن، بەلاّم من محمدم).[1]

ئەو لە ڕووی شەرەفیشەوە یەك مانگ تۆمەتبار دەکرێت و تۆمەتێکی پڕ و پوچ دەخەنە شوێن عائیشەی دایکی ئیمانداران(ﷺ) پێغەمبەر(ﷺ) لە پێناوی ئاینی خوادا جیهاد دەکات و زۆربەی کاتەکانی ژیانی هێندە خۆراکی دەست ناکەوێ بە جۆرێ هەندێ جار لەبەر زۆری برسیەتی٢ بەرد دەبەستی بە سکی یەوە. وە خراپترین کارەسات کە پێغەمبەر(ﷺ) لە پێناو ئیسلام و بانگەوازەکەیدا دوچاری بوو ئەوە بوو کەڕوی کردە تائف بۆ ئەوەی بانگیان بکات بۆ سەر ئاینی ئیسلام، بەلاّم دەریان کرد و بەرد بارانیان کرد وە هەندێکیان پێیان دەوت: ئایا خوای گەورە لە تۆ باشتری نەدیتەوە بۆمانی بنێرێ؟!

هەندێکیش پێی دەڵێت: سوێند بەخوا بت بینم کە بەدیواری کەعبەوە خۆت هەلواسیت و سوێند بخۆیت کە پێغەمبەریت ئەوا بڕوات پێ ناکەم وە هەردوو کچەکەی ڕوقیە و ئوم کلپوم کە دەست گیرانی عوتبە و عوتەیبەی کوڕانی ئەبو لەهەب بوون تەلاّق دەدرێن بەهۆی ئیسلامەوە.

حەزرەت(ﷺ)لە غەزای ئوحود دێتە دەرێ و، دەکەوێتە چالێکەوە و دانێکی پیرۆزی دەشکێ و دەم و چاوی دەبێت بە خوێن لەگەڵ ئەوەشدا لە خودا دەپاڕێتەوە و، دەفەرموێ: (( اللهم أهد قومي فإنهم لا يعلمون)).

ئایا کەسێکتان ناسیوە لەسەر زەویدا، کە وەك پێغەمبەر(ﷺ) بەو شێوەیە دوچاری گرفت بوو بێت؟

---

١ ـ بوخاری لە ئەبو هریرەوە ریوایەتی کردوە.

ئەوەی کە پێغەمبەر(ﷺ) دوچاری بووە بریتی یە لەوەی کە ئەو خۆشەویسترین خوڵقێنراوی خودایە لای خودا وا لە هەر مرۆڤێك دەکات کە گرفتێکی هەبێت بڵێت: گەر پێغەمبەر بەوەی کە خۆشەویستی خودایە و ئەم هەموو گرفتەی لێ ڕودابێ ئەی من چی؟ کەواتە ئەمە مانای ئەوە نی یە کە پەروەردگارم منی خۆش ناوێ.

لەگەڵ هەموو ئەم تاقیکردنەوانەدا ئێمە پێغەمبەر(ﷺ) دەبینین، کە دەفەرموێ: ((لبيك وسعيدك والخير في يديك والشر ليس إليك)) هەروەها دەفەرموێ ((اللهم إني اسألك لذة النظر إلى وجهك والشوق الى لقائك)).

ئایا کەسێك هەیە کە ئەم هەموو تاقیکدنەوەیەی لەسەر بێ و ببینێ هەمیشە لە سوژدەدا و بڵێ: ((خشع لك سمعي وبصري ومخي وعظمي)) من هەموو جەسەم ملکەچی تۆیە، خەڵکانێکی زۆر لەساتی یەکەمی تاقیکردنەوەیاندا هەڵدەگەڕێنەوە و دەڵێن: بۆ وامان لێ دەکات؟ چاکەیان لەبیر دەچێت و سات و کاتی چاکە دەیان بینێ کە خوای گەورە دەپەرستن و لەسەرەتای دوچار بونیان بە گرفتێ دەست بەجێ وەردەگەڕێن...

﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعۡبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرۡفٖۖ فَإِنۡ أَصَابَهُۥ خَيۡرٌ ٱطۡمَأَنَّ بِهِۦۖ وَإِنۡ أَصَابَتۡهُ فِتۡنَةٌ ٱنقَلَبَ عَلَىٰ وَجۡهِهِۦ خَسِرَ ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةَۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡخُسۡرَانُ ٱلۡمُبِينُ﴾الحج: ١١.

عائیشەی دایکی ئیمانداران دەفەرموێ: کەسێکم نەدی کە وەك پێغەمبەر (ﷺ)بە سەختی تاقیبکرێتەوە، کەسیشم نەدی لە پێغەمبەر(ﷺ)زیاتر سوپاسی خودا بکات.

ئایا تۆ دەزانی کە ئاوا بیت و بیت؟ ئەم گیانی پڕ لە ورەیەت تێدا بێت؟

## جۆرەکانی ئارامگری، یان خۆڕاگری

ئارامگری سێ جۆری هەیە: ئارامگرتن لەسەر پەرستشەکان، ئارامگرتن لەسەر ئەنجام نەدانی تاوان، ئارامگرتن لەسەر تاقیکردنەوەکان.

ئارامگرتن لەسەر پەرستشەکان: ئەوەیە کە پارێزگاریان لێ بکەت و... نوێژی بـەیانی دەکەم، شەو نوێژ دەکەم و ڕۆژ و دەگرم و یادی پەروەردگار دەکەم.

ئارامگرتن لەسەر ئەنجام نەدانی تاوان: هەرگیز ئەم تاوانە ئەنجام نادەم... لە کاتێکدا، کە دەتوانی ئەنجامی بدەیت، بەڵام نایکەی...

ئارامگرتن لەسەر تاقیکردنەوەکان: خەڵکی وا دەزانن، کە ئارامگرتن بریتـی یـە لـە، ئارامگرتن لەسەر تاقیکردنەوەکان بەتەنها، بەڵام ئەمە ڕاست نی یە.

هەر سێ جۆر دەچنە سایەی ئەم ئایە پیرۆزە کە دەفـەرموێ: ﴿إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّـٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ الزمر:١٠.

## بەرزترین پلە و پایەکانی ئارامگرتن

کامیان بەرزترین پلە و پایە و زۆرترین پاداشتی هەیە، خۆڕاگری لەسەر ملکەچی، یان تاوان؟، یان خۆڕاگری لەسەر تاقیکردنەوەکان, ئەنجام نەدانی تاوان و ملکەچی گەورە ترە و بەرزترین پلەی هەیە، لەبەرئـەوەی کـە ئەشـکەنجەی زیـاترە، وە مـن گومـان دەبـەم کـە ملکەچی و تاوان کردن بەدەستی خودی مرۆڤە و بەدەستی خۆیەتی کە لە گونـاه و تـاوان دور بکەوێتەوە، بەڵام تاقیکردنەوەکان بەویستی مرۆڤەکان نی یە، ئـەوە لـە خوداوەیـە و لەلای خوداوە دێت گەر پێی ڕازی بیـت، یـان نـا وە سـەختیش ویـستی دەرونـی مرۆڤـە لەبەرئەوەی کە هەوڵ و تێکۆشان دەدات

هەندێ جار خۆڕاگری لەسەر تاقیکردنەوەکان پێویستی بـەهێزی ئیمـان هەیـە، هـەتا کاتێ کە ئیماندار تاقی دەکرێتەوە دەڵێت: الحمد لله.

واتە: خۆڕاگری دەکرێ بە ئارەزومەندی بێت و دەشکرێ کـە هەنـدێ جـار بـە ناچـاری بێت، ئەگەر بە ئارەزوومەندی بوو ئەوا پاداشتەکەی گەورە ترو زۆرترە.

لەبەر ئەوە خـۆڕاگری یوسـف پلـە و پایـەی بـەرزتری هـەبووە لـە خـۆڕاگری ئـەیوب پێغەمبەر لەبەرئەوەی کە خۆڕاگری یوسف بە هەڵبـژاردنی خـۆی بـووە، بـەڵام خـۆڕاگری ئەیوب لەسەر نەخۆشی بووە و ناچار بوە لەسەری.

زانایان ووتەیەکی زۆر بەچێژیان هەیە کە دەفەرمون: ئارامگرتن لەسەر ملکەچی یەکان و بەندایەتی گەورە ترە لە ئارامگرتن لەسەر تاوان و گونـاه، لەبەرئـەوەی کـە چـاکەیەك بەدەهێندەی خۆیەتی، گەر خۆڕاگر بوو لەسەر پەرستن ئەوا ئەو هەڵانەت دەبەخـشرێن کـە لە ئارام نەگرتن لەسەر تاوان ئەنجامت داون , تاوانەکانت لە تاوان دەبەخشرێن، وە ئەگـەر یەکێك چاکە و گوناهەکانی یەکسان بوون ئەوا زۆر کات بەرمیهری پەروەردگار دەکەوێت.

# چەند چیرۆکێکی ڕاستەقینە

## ئەمە سۆزێکە لە پەروەردگارەوە:

ناوم ئەحمەدە... ئەندازیاری کارەبایم... پاش تەواو کردنی خوێندن ٨ساڵ کارم کردوە و چەند جارێك لە پیشەکەم بەرز کراومەتەوە، ماوەی ٢ ساڵە بەڕێوبەری فرۆشتەنی یەکێك لەو کۆمپانیا گەورانەم کە کار لە بوارەکەی خۆمدا دەکات...

ئەم سەرگوزشتەیەی من دوساڵ دەبێ دەستی پێ کردوە کاتێ کە من وازم لە بواری کارەکەمدا هێنا لەو کاتەدا بڕیارێکم دەرکرد بە کردنەوەی نوسینگەیەکی تایبەت بە خۆم، دۆخی مادیم زۆر خراپ بوو بەداخەوە , دوای ئەوەی کە من خۆم و خێزانەکەم لەسەر دۆخێکی دیاری کراو ڕاهاتبووین پاش ئەوە گرفتێك ڕوی تێ کردم کە ئەمە ناوەڕۆکی بەسەرهاتەکەمە...

من خێزاندارم و سێ کچم هەیە، پاش ئەوە خێزانەکەم جارێکی دیکە دوگیان بوو زۆر سروشتی یە کە خوازیار بوین کە ئەمجارەیان منداڵەکە کوڕ بێت، بەڵێ منداڵەکە کوڕ دەرچوو، بەڵام دوایی بۆمان دەرکەوت کە منداڵێکی نائاسایی یە و هەستی تەواو نی یە، ئەمەش بویە هۆی کۆسپێك بۆ هەموو ئەوانەی کە لە دەوروپشتمانەوە بوون وە بۆ ئەوانەشی کە هەواڵەکەیان زانی وە لە ڕاستیدا من و خێزانەکەم، کە پزیشکەکان ئاگاداریان کردینەوە زانیمان ئەمە تاقیکردنەوەیەکە و پەروەردگار بۆ ئێمەی هەڵبژاردوە، بەڵام کەس و، کاری هەردولامان وا مامەڵەیان لەگەڵ ئەم بارودۆخەدا دەکرد وەك ئەوەی کە یەکێکیان لێ مردبێ ئێمە ئەم منداڵەمان ناو نا(عبد الرحمن) لەبەرئەوەی کە ئەمە ڕەحمەتێ بوو کە خوای گەورە بۆ ئێمەی نارد وە ئێمە زۆر پەیوەست بووین پێ یەوە وە پاش لە دایك بوونی عبد الرحمن خێزانم پاش چوار تا پێنج مانگی دیکە بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو جارێکی دیکە دوگیان بوو وە بەپێی شیکاری یەکانی پزیشکی بۆ ماوەیی دوچار بوون بەم نەخۆشی یە لە دوای منداڵی چوارەم زۆر دەبێت، پزیشکەکە زۆر سور بوو لەسەر شوێنەواری ئەو حەملە و دەیپرسی ئایا شیکارتان بۆ ئەنجام بدەم سەبارەت

بەو کۆرپەیە کە بزانین دوچار بووە، یان نا؟ بەڵام ووتمان نەخێر... ئەوەی کە خـوای گـەورە بۆمان بنێرێ ئێمە پێی ڕازی دەبین وە لەسەرەتای شەش مانگیدا حەملەکـە کۆتـایی پـێ هات، چونکە خێزانم توشی خوێن بەربونێکمی زۆر هات و، پاشـان بۆمـان دەرکـەوت کـە وێڵاشەکە جیابۆتەوە و لەبەرئەوە کۆرپەلەکە تەواو نەبو پاش تر لەبارچوو کە کـچێك بـوو کە بەهەمان نەخۆشی دوچار بوو بوو، من ڕۆژی سێ شەممە چوم بەخاکم سپارد، بـۆ ڕۆژی چوار شەممە عبد الرحمن زۆر نەخۆش بوو هەر ئەو شەوە بردمان بۆ بیمارسـتان، هـەر ئـەو ڕۆژە لە تەکسی یەکدا گوێمان لە کاسێتی مامۆستایەك بوو کە باسـی خـۆڕاگری دەکـرد، ئێمە عبد الرحمن مان بردە نەخۆشخانە و پزیشکەکان بە دیتنی زۆر کاریگەر بـوون هـەر بە گەیشتنمان بۆ ژوری ئۆکسجین ئەو کۆچی دوایی کرد هەمو ئەوەی کـە هـات بەناخمـدا لەو کاتەدا ئەو فەرمودە قودسی یە بوو کە دەفەرموێ: (خوای گەورە کاتێ فەرمان دەدات بەگیان کێشانی کوڕێك بە فریشتەکانی دەفەرموێ: بەندەکەم چی ووت ؟ ئەوانیش دەڵـێن سوپاسی کردی و گەڕایەوە واتە ووتی: ( الحمد لله، إنا لله وإنا إليهه راجعون) هاتمـە دەرێ بۆلای خێزانەکەم و پێم ووت: إنا لله وإنا اليه راجعـون، خێزانەکـەم چـەند جـارێ ئەمـەی ووتەوە، پاشان هەستم کرد کە ئێمە کەمتر لە خەڵکانێکی زۆرتر تاقی کراوینەتەوە . هەر لەم کاتەدا هەستمان کرد کە ئەوەی لە ئێمە ڕویداوە سۆزێك بووە لـە پـەروەردگارەوە بـۆ ئێمە، کاتێ کە ئەو منداڵەی پێبەخشین کاتێك بوو کە ئێمە تیایدا لەخوداوە دوور بـوین، ماڵمان گرفتێکی زۆری تێدا بوو، بوونی ئەو منداڵە جۆرێك لە سـۆز و خۆشەویـستی پـێ بەخشین وە جارێکی دیکە تەواوی خێزانەکەی کۆ کـردەوە، ئێمـە زیـاتر لـە خـودا نزیـك بوینەوە واتە ئەو کۆرپەیە پەیامێکی دیاری کراوی پێ گەیاندین کە پـەروەردگار ڕەوانـەی کردبوون وە کاتێ کە پەیامەکەی کۆتایی پێ هێنا خوای گەورە بردیەوە لەکاتێکـدا کـە ئێمە ئیمانمان زۆر بتەو بوو.

کاتێ کە ئێمە بەم شێوەیە دەپاڕاینەوە (اللهم أجرنا مصيبتنا وأخلفنا خيرا منهـا) بـە ویستی خوا کاتێ ئێمە ئەم دوعایەمان کرد کە هـەموومان کۆبـوین وە مـن دڵنیـام کـە پەروەردگار وەڵامی نزاکەمان دەداتەوە پاش ئەوە بەمانگ و نیوێك جارێکی دیکە خێـزانم حامله بویەوە ئێمە ئەو کاتە زۆر بژێویمان خراپ بوو کارەکەم کۆتایی هاتبوو.

هیچ خەرجی و پاشەکەوتێکم بەدەستەوە نەبوو، وە پاش چوار مانگ بۆمان دەرکەوت کە دوانەیەکە و سوپاس بۆ خودا ناومان لێنان حسن و حوسەین بەڕاستی گەورەترین هیوامان ئەوە بوو کە خوای گەورە بارمتەکەی لەو منداڵە نەخۆشەدا گەڕاندەوە و لەبری ئەوە نەك منداڵێ بەڵك و دوو منداڵی تەندروستی پێ بەخشین وە دوو مانگ پێش لە دایك بونیان لە یەکێك لە وڵاتانی کەنداوەوە گرێ بەستێکم پێ گەیشت وە خەڵکی پێش هاتنی ئەم کارە پێیان دەوتین ئێوە ژمارەتان بەردەوام زۆر دەبێ و خەرجیشتان نی یە،، بەڵام ئەم کارە سەری هەڵدا هەتا خەڵکی پێ دڵنیا بکات و پێیان بڵێ: خوای گەورە لە ئێمە چاوەڕێی هیچ هەوڵێك ناکات بەڵك و چاوەڕوانی ئەوەمان لێ دەکات کە سوپاسی بکەین و یادی بکەینەوە.

﴿إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّـٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ الزمر: ١٠.

پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرموێ: (ئارامگرتن ڕوناکی یە)[١]... ئێمە زۆر گوێمان لەم فەرمودەیە بووە، بەڵام ئایا کەسێك لە ئێمە بیری لێ کردۆتەوە ؟ ڕوناکی یە بۆچی ڕوناکی یە؟ کێشەو گرفت تاریکی یە وە خۆڕاگری لەسەر تاقیکردنەوە دونیایی یەکان بریتین لەو ڕوناکی یەی کە لەو تاریکی یەدا دەردەچێت.

بەڵێ ئێمە سەر گوزشتەی ئەحمەد دەخوێنینەوە هەست دەکەین کە بابەتەکە زۆر سادەترە لە پێشبینی یەکانمان گەر ئێمە دوچاری هەمان کێشەو گرفت بینەوە . هەروەها ئەحمەد گوێ لە خەڵکانێ دەگرێت کە دوچاری گرفت بونەتەوە و خۆڕاگری، یان بەلاوە سەیرە.

ئەی خەڵکینە خۆڕاگری ڕوناکی یە، بیر لەم واتەیە بکەنەوە کە زۆر گوێمان لێ بوە و بە زەینماندا تێپەڕیوە و لەوەی کە ئێمە بیرمان لە مانای ڕوناکی کردۆتەوە... لە ڕاستیدا هیچ سودێك نابینرێ گەر ئێمە ئەم بابەتە بەفەرمودەیەکی پێغەمبەر(ﷺ) کۆتایی پێ نەهێنین کە دەفەرموێ: (سەرسامی بۆ کاری ئیماندار، کە هەموو کارەکانی هەر چاکەیە

١ ـ بوخاری لە صحیحەکەیدا هێناویەتی .

گەر خۆشی ڕووی لێ بکات سوپاسی خوا دەکات و ئەمەش بۆی دەبێت بە چاکە وە ئەگەر زیان ڕووی لێ بکات ئارامی لەسەر دەگرێ و ئەمەش هەر بەچاکە بۆی دەنوسرێ و ئەمە جگە لە ئیماندار بۆ هیچ کەسێکی دیکە نی یە).

حەزرەت(ﷺ) سەری لە کاری ئیماندار دەسوڕمێ... ئیماندار ئەمەی زۆر نامۆیە کە هیچ گرفتێکی نی یە و تەواوی ژیانی سانایی یە إن شاو الله...

ئایا ئەوەمان لەیادە کە ئەحمەد چی ووت بە خێزانەکەی کاتێ کە کوڕەکەیان مرد؟ پێی ووت بڵێ: (إنا لله وإنا اليه راجعون).

دەکرێ کە هەموو موسڵمانێ ئەم نزایە بکات...

پێغەمبەر (ﷺ)دەفەرموێ (( إنا لله وإنا اليه راجعون، اللهم اجرني في مصيبتي وأخلفنا خيرا منها، لا يقولها عبد إلا عوضه الله خيرا منه)).[1]

بەختەوەر بن بەم خۆڕاگری و پاڕانەوەیە

نامەوێ کۆتایی بە پەیڤەکەم بهێنم هەتا پەیامێك ئاڕاستەی ئەو دایك و باوکانە نەکەم کە کۆرپەکانیان مردوون...

لەڕاستیدا من دەزانم ئەزمونەکەی مامۆستا ئەحمەد و خێزانەکەی ئەزمونێکە لەنێو زۆرێك لە ماڵەکاندا هەیە، لەنێو زۆرێك لە خێزانەکاندا هەیە، پێغەمبەر (ﷺ)دەفەرموێ ((إن السقط ليراغم ربه اذا دخل أبويه النار، فيقال أيها السقط المراغم ربه: أدخل أبويك الجنة، فيجرهما بسرره حتى يدخلها الجنة)).[2]

فەرمودەیەك زۆر جوانی دیکە هەیە کە دەفەرموێ ((إذا مات ولد العبد قال الله لملائكته: قبضتم ولد عبدي؟ فيقولون:نعم، فيقول: قبضتم ثمرة فؤاده: فيقولون: نعم، فيقول: ماذا قال عبدي؟ فيقولون: حمدك و إسترجع، فيقول الله آبنوا لعبدی بيتا في الجنة وسموه بيت الحمد))[3] ئەگەر منالی بەندەیەك مرد خودای گەورە بە فریشتەکان دەفەرموێت:

---

١ـ إمام أحمد لە مسندەکەی هێناویەتی.

٢ـ إبن ماجه لە علی کوڕی ئەبو گالبەوە ڕیوایەتی کردوە.

٣ـ ترمذی لە ئەبو موسی الاشعری یەوە ڕیواتی کردوە.

ڕۆحی منداڵی بەندەکەتان کێشا ؟ دەڵێن بەڵێ , خودا دەفەرمویێت: بەرووبوومی دڵتان لێ وەرگرت ؟ دەڵێن بەڵێ , دەفەرمێت: بەندەکەم چی گووت ؟ دەڵێن , گووتی: ( الحمد لله , انا لله وانا اليه راجعون , دەفەرمویێت: دەخانوویەکی بۆ دروست بکەن لەناو بەهەشت و ناوی بنێن خانووی سوپس گوزاری.

## گیان و مادده

لەم بابەتەماندا باس لە گرفتێ دەکەین کە هەموو مرۆڤایەتی بەدەستیەوە دەناڵێنێ، مرۆڤایەتی بەدەست لە خۆیایی بونێکی زۆرەوە دەناڵێنێ و ماددەش خەڵکی نوقم کردوە و بەتەواوی ڕوحیان لە بیر چۆتەوە سەرەتا من ناڵێم تەنها بۆ گیانمان بژین و جەستەمان لەیاد بکەین، ئەوان بەهەر شێوەیەك بێت لێك جودا نین.

بۆ ئەوەی کە لەم بابەتە بگەین پێویستە بگەڕێینەوە بۆ سەرەتا وە مەبەستم لەسەرەتاش سەرەتای ئەم سەدەیە نی یە، یان مەبەستم لەسەرەتای سەدەی ڕابردوش نی یە بەڵك و مەبەستم سەرەتای خوڵقانە...

## پەروەردگار چۆن و لە چی خوڵقاندوین؟

پەروەردگار کۆمەڵە خوڵقێنراوێکی زۆری لەیەك مادە خوڵقاندەوە فریشتەکانی لە ڕوناکی و جنی لە ئاگر خوڵقاندوە، بەڵام مرۆڤ، یان ئادەمیزادەکان تا کە خوڵقێنراوی ژیرن کە لە دوو مادده خوڵقێنراون کە ئەویش جەستە و گیانە.

جەستە بەرگ، یان پۆشەرێکی دەرەکی یە کە بۆشاییەکی هەیە، بەڵام ڕوح، یان گیان ئەو شتەیە کە دەڕواتە نێو ئەو بۆشایەوە و هەریەکەیان سەرچاوە و خۆراکی خۆی هەیە، جەستە سەرچاوەکەی قوڕی زەوی یە و خۆراکەکەی هەموو ئەوانەیە، کە پێ دەگات لە خواردن و خواردنەوە و پۆشاکی جوان و پەیوەندی پیاو بە ئافرەتەوە، بەڵام گیان سەرچاوەکەی فویەکی بەرز و بەنرخە لەلایەن خوداوە، کە کراوە بەبەری ئادەم (عليه السلام) دا... خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَـٰجِدِينَ﴾ الحجر: ٢٩.

## چی ڕوودەدات گەر هاوسەنگی لەنێوان گیان و مادده دەستەبەر نەکەین؟

خۆراکەکەی هەموو ئەوەیە کەدەمانگەینێت بەخودا وەك خوێندنی قورئـان و دەسـتت بڵند بکەیەوە و بڵێی: پەروەردگارا... جگە لەمەش زۆرە ئـەم گیانـە بەنـد کـراوە لـەنێو جەستەدا، ناتوانی بگاتە خودا مەگەر ئەو جەستەیە سوك بێت، گرفتی ڕاستەقینەی ئێمـە ئەوەیە کە ئێمە سورین لەسەرئەوەی کە لەیەك مادە پێکهـاتووین، ئێمـە گیانمـان لـەیاد کردوە و تەنها خۆراکی جەستە دەدەین، گیانمـان پـشت گـوێ خـستوە و گرتومانـە هـەتا ماندوو بووە و پیر بوەو ڕوخاوە!!

بۆ نمونە گەر یەکێك ماوەی یەك هەفتە بـێ خـۆراك بـژی چـی ڕوودەدات ؟ ئـەی چـی ڕوودەدات گەر بۆماوەی سێ ڕۆژ ئاو نەخواتەوە؟ بێ گومان دەمرێ... هـەروەها گیـانیش، مرۆڤ گەر یادی خوا نـەکات ئـەوا گیـانی دەمرێـت، بـەڵام بـە هێـوری و بەپێـچەوانەی جەستەوە کە بەخێرایی دەمرێت و ئەمەش وا دەکات لە مرۆڤ کـە گومـان بـەرێت تـەنها جەستەیەتی کە دەمرێ بۆیە لێی ناگەڕێ و هەرگیز پشت گوێی ناخات، دەمێنێتـەوە و وا خۆی تێر دەکات بیری دەچێت، کە گیانی هەیە.

ئەمەش هەر ئەوەیە کە لە ڕۆژئاوادا هەیە، مرۆڤەکان هەسـت بەمانـدو بـوون دەکـەن لەگەڵ ئـەوەی کـە ئـەوانی لەسـەرە لـە بەختـەوەری و خۆشـگوزەرانی، لەگـەڵ ئەوەشـدا مرۆڤەکان لە وڵاتی ئێمە هەرچەندە ژیانیان سەخت و دژوارە، بەڵام هەر لە سەقامگیریدان و لە زۆرترین ئەو نمونانەی کە ڕاڤەی ئەم پەیڤەی ئێمە دەکات... ئێمە دوو کەس دەبیـنین کە پێکەوە و لەهەمان کاتدا دێن و لەپـشت پـێش نوێـژەوە نوێـژ دەکـەن و هـەردووکیان بەیەك دەنگ و هەمان ئایەتیان گوێ لێ دەبێت، بەڵام یەکێکیان دەگری و ئەوی دیکەیان هەست بە هیچ ناکات، یەکەمیان گیانی پەیوەستە بە خوداوە و دوەمیـان گیـانی لاواز و مردوە، ئەگەر دەنگی هەبوایە گوێی لە نرکەی دەبوو، کە پێی دەڵێت: پێت حـەرام بێـت! کەی تێدەگەیت لەوەی کە مـن پێویـستم بـە خـواردن و خواردنـەو هەیـە بەتـەواوی وەك جەستەت؟

قورئان ئەم ڕاستیەی بەرجەستە کردووە... لە سورەتێکدا کە هەمومان دەیخوێنین، بەڵام ئێمە بیری لێ ناکەینەوە کە ئەویش سورەی(التکاثر) لەسەرەتای ئەم سورەتەدا دەفەرموێ: ﴿أَلْهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ﴾التکاثر -١- (زۆربون لێرەدا مانای زۆر بوون نی یە لە نەوەدا بەتەنها بەڵکو زۆر بوونە لە سامان و داهات و ئۆتۆمبێل و پۆشاك و منداڵ...

قەدەغەکردن لێرەدا بریتی نی یە لە قەدەغەکردن لە زۆربوون وە ئەگەر نا ئەمە پەچیەك دەبوو بۆ مادە بەڵکو بریتی‌یە لە قەدەغەکردن بێئاگابوون بەهۆی زۆر بوون... واتە هەتا کەی زۆر بوون بێ ئاگاتان بکات وە پاش ئەمە ئەم سورەتە کۆتایی جەستەمان بۆ ڕون دەکاتەوە، کە دەفەرموێ: ﴿ حتى زرتم المقابر﴾ التکاثر: ٢ کۆتایی یەکەی گۆڕستانە، هەروەها ئایەتەکانی پاش ئەوە بەڵێن دەداتە ئەوانەی کە تەنها بۆ جەستەیان ژیاون پێنج هەڕەشەیان لێ دەکات:﴿ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ ۝٣ ثُمَّ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ ۝٤ كَلَّا لَوْ تَعْلَمُونَ عِلْمَ ٱلْيَقِينِ ۝٥ لَتَرَوُنَّ ٱلْجَحِيمَ ۝٦ ثُمَّ لَتَرَوُنَّهَا عَيْنَ ٱلْيَقِينِ ۝٧ ثُمَّ لَتُسْـَٔلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ ﴾ التکاثر: ٣-٨.

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشێ، چی ڕوو دەدات گەر ئەو هاوسەنگی یە دەستە بەر نەبێت؟

یا ئەوە بێنینە پێش چاوی خۆمان کە مرۆڤێك بۆ جەستەی ژیاوە و گیانی لەبیر کردووە... ئەم مرۆڤە دەبێت، یان هەر تێر بوونی بۆ نەبێت واتە هەر چەندی تێر بکەیت بەس نەبێت، ئەمەش ڕاڤەی لادانی جنسی دەکات کە ڕۆژئاوایی یەکان بە دەستیەوە دەناڵێنن وەیان دەگونجێ لەدەست پەژارە و، پاشان زیادە ڕەوی بناڵێنێ , وە نوقم بوون لەنێو مادەو یەکێکە لە هۆیەکانی پەژارەیی ئەگەر ئەم هاوسەنگی یە ڕووی نەدا، مرۆڤ، یان دەبێت بگاتە بێ ئومێدی یەکی تەواو لەماددە کە بەمەش خوای گەورە هیدایەتی داوە بۆ سەر ڕێگەی ڕاست وە، یان بەخۆی خۆی لەناو بەرێت لە ڕێگەی ناردنەوە بۆ ئەم ئارەزوانە.

ئەمەش وای لێ دەکات کە ئەو هەست بکات بەوەی کە بەبێ ئامـانج دەژی و هەسـت بەوە دەکات کە ئەو بێ نرخە و ئەمەش پاڵی پێوە دەنێ بۆ خۆ کوژی.

زۆر جار ئـەو مرۆڤـە هەسـت دەکـات کـە مانـدووە و دەرونـی شـڵەژاوە وە دەیـەوێ بگەڕێتەوە بۆلای پـەروەردگاری، بـەڵام چـەپەڵی شـەیتان وای لێ دەکـات کـە هەمیـشە هەستی وا بێت کە ناگاتە پەروەردگاری وە هیچ سودێکی نی یە و پێی دەڵێـت: تـۆ هـەر کاتێ کە وازت لە گوناه هێنابێ ئەوا جارێکی دیکە گەڕاویتەوە سەری.

گەر گیان لەگەڵ زانست و زانیاریدا تێکـەڵ بکـەین ئـەوا دەبینـە باشـترین دەوڵـەتی جیهان.

پێم خۆشە لەم بارەیەوە شتێك بڵێم: ئێمە سیفەت و خاسیەتێکمان هەیە کە ڕۆژ ئـاوایی یەکان نیانە، ئێمە ئاین و زانیاری و زانـستمان هەیـە، بـەڵام ڕۆژئـاوایی یـەکان لێکیـان جیاکردوونەتەوە ئێمە گەلێکی ئاین پەروەرین وە لەناخماندا سروشتێکی پاك و بێ گـەرد و دروست هەیە ئەگەرچی تاوانیش ئەنجام بدەین.

لــە عومــەری کــوڕی خەتابــەوە(ﷺ) دەگێڕنــەوە کــە دەفــەرموێ گــوێم لــە پێغەمبەر(ﷺ)بوو دەیفەرموو: (ئەگەر خوای گەورە فـەتحی میـسری پـێ بەخـشین، ئـەوا تیایدا خەڵکی زۆر بەسەرباز بگرن، لەبەرئەوەی کە ئەوان باشترین سـەربازانی سـەرزەوین) ئەبو بکر(ﷺ) فەرموی بۆچی ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)؟ ئەویش فەرموی: (لەبەرئەوەی کە ئەوان خۆیان و خێزانەکانیان تا ڕۆژی دوایی لە پابەندیدان)[١] ئەم پەیوەنـدی یـە مانـای وایە کە: ئەوان تا ڕۆژی دایی پابەند بە ئاینەکەی خۆیانەوە.

---

١ ـ لە (کنز العمال)) دا هاتووە .

## ئایائیسلام دژی ماددەیە؟

## سەرگوزشتەیەکی بەچێژتان بۆ دەگێڕمەوە

پاش موسڵمان بوونی عەمری کوڕی عاص بە پێنج مانگ عەمر بە خزمەت پێغەمبەری خودا(ﷺ)گەیشت و حەزرەت پێی فەرموو: (پۆشاك و شمشێرەکەت لەگەڵ خۆت بێنەو وەرە لام، عەمر کاتێ هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)دەست نوێژی دە شۆرد و، سەری بەرز کردەوە و، پاشان سەری دانەواند و وتی: (من دەمەوێ کە بتکەم بەسەر کردەی سوپایەك و بەهۆیەوە غەنیمەتێکی باشت چنگ بکەوێ وە من لە سامان و دارایدا ئارەزویەکی باشم بۆت هەیە) عەمر دەڵێت: ووتم ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)من لە پێناوی پارەدا موسڵمان نەبووم بەڵکو ئارەزوی ئیسلامم کردوە و دەمەوێ لەگەڵ پێغەمبەری خوا(ﷺ)دابم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەی عەمر ماڵی باش بۆ پیاوی باشە).[1]

ئەمە بریتییە لە تێگەیشتنی خواپەرستی لە ئیسلامدا: کە دەبێت دونیا لەژێر چنگتدا بێت نەك لە دڵ و دەرونتدا...

شێخ حەسەنی بەصری حەزی لە خواردن بوو لەبەرئەوە کەسێکی بەخۆوە بوو، پیاوێکی شان و شەوکەتدار بوو لەگەڵ ئەوەشدا سەرداری لە خواترسان بوو، هەتا یەکێك لە شاعیران دەربارەی دەڵێت: ((إذا كان عرض زنده شبرا وهو زاهد، فكيف لو لم يزهد))؟!! واتە: لەخوا ترس بوو ئینجا پانایی دەستی بستێك بوو , ئەی ئەگەر لەخوا ترس نەبا چۆن دەبوو؟

پیاوێك لە ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەلی پرسی: ئایا دەکرێ کە کەسێك هەزار هەزار درهەمی هەبێ و لە خواترس بێت؟ ئەویش فەرموی بەڵێ، پیاوەکە ووتی چۆن؟ حەنبەل ووتی گەر پارەکەی زۆربێ ئەوە پێی بەختەوەر نابێ و گەر کەمیش بکات دڵتەنگ نابێ.

---

١ـ بوخارو و إمام أحمد له (مسند) ەكەی.

ئەگەر سەیری دە هاوەڵە مژدە پێ دراوەکەی بەهەشت بکەین: دەبینین، کە عبد الرحمنی کوڕی عەوف کاتێ کۆچی دوایی کرد هەشتا ملیۆن درهەمی هەبوو وە پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی دەفەرموێ: (گەر بەردێکی لە شوێنی خۆی هەڵبڕی بایە پارچەیە زێڕی لە ژێریدا دەدۆزی یەوە) هەروەها عوسمانی کوڕی عەفان سوپایەکی ئیسلامی ئامادە کرد.

لە هەموو ئەمانەوە دەگەینە ئەوەی کە هیچ دژایەتی یەك لە نێوان گیان و ماددەدا نی یە، دەکرێ لە ژیانت سەرکەوتوو بیت هەروەها ئاین پەروەریش بیت، بەڵام پێویستە کە هاوسەنگی یەك لەنێوانیاندا دەستە بەربکەین...

## ئایا ماددە زاڵە؟

زۆر سەیرە کە ئێمە دەبینین گەر خوای گەورە بیەوێت بمانگێڕێتەوە بۆ لای گیان ئەوا لەبەر چاوماندا ئەو بیرۆکەیە تێك دەشکێنێ کە ماددە زاڵترە بەسەر یاساکانی گەردووندا نمونەش لەسەر ئەمە زۆرە لەوانە:

کاری چەقۆ ئەوەیە، کە ببڕێ و لەت و پەت بکات، ئەمە مادی یە، بەڵام خوای گەورە فەرمانی پێ دا کە ئەم هەڵنەستێ بەم کارەی کاتێ خرایە سەرگەردنی ئیسماعیل(عليه السلام) هەر ئەو خودایەش بوو کە ئاگری سارد کرد لەسەر ابراهیم، کاتێ کە پێغەمبەر(ﷺ)پرسیاری لێ کرد: (جوانترین ڕۆژانی ژیانت کامەیە؟ فەرمووی ئەو ڕۆژانەی، کە لەنێو ئاگرەکەدا بەسەرم برد).

هەر ئەو خودایە بوو فەرمانی دا بە حوت کە یونس قوت بدات و بەئاوی ووت وەك چیای لێ بێت تا موسی بەسەریدا تێپەڕێ.

# چەند چیرۆکێکی ڕاستەقینە

ناوم ئولجا محمدە... بەڕەگەز ئەوروپیم و لەگەڵ پیاوێکی میسری خێزانم پێکەوە نـاوە و کوڕ و کچێکم هەیە بەناوی: لیلی و ئەحمەد، گەلی ئێمە لە ئەوروپا پاش جەنگی جیهـانی هەموویان بێ باوەڕ بوون، کاتێ کە خێـزانم پێکـەوەنا گومـانم وابـوو هاوسەرەکەشـم بـەو شێوەیەیە، ئێمە ژیانی خۆمان لە میسر دەست پێ کرد و زۆر ڕەفتارەکانیم بـەلاوە سـەیر بوو و دەم دی کە نوێژی دەکرد بۆیە داوام لێ کرد کـە سـورەی فاتحـەو چـەند سـورەتێکی کورتم فێر بکات، بەڵام ژمارەی ڕکاتەکانی نوێژم نەدەزانی.

ڕۆژێك لەماڵەوە منداڵی یەکێك لە هاوڕێکانم لەلابوو کـە تەمـەنی تـەنها ٧ مـانگ بوو، لەپڕ دیم کە هاواری کرد دیتم کە لەسەر پێی وەستاوە و دەلـەرزێ، چـونکە دەسـتی بەکارەباوەیە، ووتم: کارەبای ٢٢٠ ڤۆڵت، ڕەنگە ئەو مردبێ...، چونکە زانـست وا دەڵـێ بیرم لەوە کردەوە کە ڕزگاری بکەم، لەبەرئەوەی کە ئەمانەتە لەلام وە گومـانم وابـوو بـەو شێوەیەی کە دەمەوێ خۆشم دەمرم.

پاش ئەوە دیتم کە هەموو شتێ لە ژوورەکە دەبینم، کەواتە مـن نـەمردووم هـەر ئـەو دەمە وتم: سبحان الله، الله اكبر لەسەرووی هەموو شتێکە، ئەمـە یەکـەمین ڕۆژ بـوو کـە نوێژم تێدا دەکرد... تێر تێر گریام سوپاسی خوام کرد و هەستم کـرد کـە مـن چـەند وون بووم، هەستم وەك هەستی ئەو منداڵە وون بووە وابـوو کـە بـەدوی دایکیـدا دەگـەڕێ و، پاشان دەیدۆزێتەوە.

پاش ئەوە ویستم پابەند بم بە حیجابەوە، بەڵام بیرم لەوە دەکردەوە کە کەس و کارەکەم چیم پێ دەڵێن؟ بەڵام وتم: من بۆ خوا کار دەکەم نـەك بـۆ خـەڵکی، بـەڵێ پۆشـیم و زۆر بەختەوەر بووم، هیچ هەستم بە شەرم و تەنگی و گەرما و ماندویی نـەدەکرد وەك ئـەوەی کە پێشبینیم دەکرد، بەڵکو هەستم بە ئارامی یەکی نامۆ دەکرد وە بە خـۆمم ووت: بریـا زووتر پابەند بوومایە.

کاتێ کە ژیانی خۆمم هەڵسەنگاند لە پێش و پاشی موسڵمان بوونم هەستم بە بەختەوەری یەك کرد، کە هەرگیز پێش موسڵمان بوونم هەستم پێ نەکردبوو.

پێم خۆشە ئەوەم بۆ باس بکەیت کە پێش موسڵمان بوونت چۆن بوویت ئەی لە دوای موسڵمان بوونت چۆنی؟ ڕات چی یە لە بەرامبەر گرفتی گیان و مادده؟

مەجەر وڵاتێکی شیوعی یە و ئاینی تێدا نی یە، نە لێپرسینەوە و نە هیچ بیرۆکەیەك سەبارەت بە ڕۆژی دوایی و نەگیانیش، لەبەرئەوە ناکرێ، کە بڕوا بەشتێ بکەین کە نە دەیبینین و نەبەرجەستەی دەکەین.

من هەرکارێکم بویستایە دەم کرد لەبەرئەوەی کە هیچ پەروەردگارێ نەبوو لێم بپرسێتەوەو نەهیچ ڕۆژێکیش هەیە قیامەتی تیا بەرپا بێت. لەگەڵ ئەوە ئەم ئازادی یەهۆکاری چەندین نەخۆشی یە بۆ خەڵکی لەوانە پەستانی دەمارەکانی هەڵچوون و دەرونی و شتی دیکەش، لەبەرئەوەی کە ئادەمیزاد لە هەموو شتێکدا پشت بەخۆی دەبەستێ نەك بە خودا.

من لە قورئاندا خوێندومەتەوە کە خوای گەورە لە خوڵقێنراوەکانی دەپرسێ: ئایا ئیمانتان هێناوە بە پەروەردگار؟ ووتیان: بەڵێ ووتم: کەسێك چۆن دەتوانێ بڵێ: پەروەردگار نی یە؟ بۆ نمونە لەچین، دەڵێن: گەر لەوێ خودایەك هەبوایە ئەوا ئەمان دەپەرست.

بەڵێ ئەو مەبەستی ئەم ئایەتەیە، کە دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِىٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ ۛ شَهِدْنَآ ۛ أَن تَقُولُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَـٰذَا غَـٰفِلِينَ﴾ الاعراف: ١٧٢.

پەروەردگار کاتێ کە ئادەمی خەڵق کرد هەر لە پشتی خۆی نەوەکانی تا ڕۆژی دوایی دەرهێنا وە پێی فەرموون: ئایا من پەروەردگارتان نیم ؟ ووتیان: بەڵێ شاهیدیمان دا، ئێمە دەڵێین ئەوەمان لەیاد نی یە، بەڵام ئەم هەڵوێستە لە نێو ناخ و تواناکانی ئێمە دایە لە

ناخی ئێمەدا سروشتێك هەیە كە خوای گەورە لەسەری خوڵقاندوین و ئەویش ئەوەیە كە ئێمە هەمیشە پێویستمان بەخودایە، گیانمان پەرۆشی لای خودایە و دەتەوێ بگەڕێیتەوە لای، ئەمەش ڕاڤەی ئەوە دەكات كە لەنێو كۆمارەكانی ڕوسیای شیوعی ڕویدا كە ماوەی٧٠ ساڵە وانەی بێ ئیمانی تێدا دەوترێتەوە. كاتێ كە ئەم ڕژێمە واتە یەكێتی سۆڤیەت روخا دانیشتوانی ئەم كۆمارانە داوایان كرد كە ئیسلام بكرێتە دەستوری وڵات.

## وەك ئافرەتێكی موسڵمان چۆن ڕۆژگاری خۆت بەسەر دەبەیت؟

سوپاس بۆ خودا وەك ئافرەتێكی موسڵمان بە نوێژ و قورئان خوێندن دەست پێ دەكەم، ئێمە پەندێكمان هەیە هەركەس زمانێك فێر بێت دەبێت بزانێ چۆن بیخوێنێتەوە، بەڵام من زۆرێك لە موسڵمانان دەبینم كە ئیسلامیان لە باپیرانیانەوە بۆماوەتەوە، بەڵام نازانن قورئان بەباشی بخوێننەوە.

بۆشاییی یەكی زۆر گەورە لە نێوان ئێمەو قورئاندا ڕویداوە، ئولجا قورئانی بە وەرگێراوی لە عەرەبی یەوە بۆ ئینگلیزی دەخوێندەوە و لە ئینگلیزی یەوە بۆ مەجەری و ئێمەی عەرەبیش ناتوانین قورئان بخوێنینەوە و گەر قورئانێكمان كردەوە ئەوا هەڵدەنوێین و نازانین كە چۆن دەیخوێنین، ئێمە لە ڕەمەزاندا نەبێ قورئانەكانمان ناكەینەوە و پاش ڕەمەزان قورئانەكان سكاڵای ئەوەمان لێ دەكەن كە تەپ و تۆزی زۆریان بەسەرەوەیە، عبد الله كوڕی عەمر هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)و پێی ووت: ئەی پێغەمبەر(ﷺ)ی خودا لەماوەی چەند ڕۆژدا قورئان بخوێنمەوە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (هەرمانگەی جارێ) عبد الله ووتی: ووتم من زۆر لەوە بەهێزترم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: ( بیست شەو جارێ) عبد الله ووتی: ووتم من زۆر لەوەش بەهێزترم، حەزەرت فەرموی: (پانزە ڕۆژ جارێ) عبدالله دەڵێت: ووتم زیاتر لەوە بەهێز ترم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی (هەفتەی یەك جار) عبدالله دەڵێت ووتم: زۆر لەوەش بەهێز ترم پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی (هەركەس لەماوەی سێ ڕۆژ كەمتر بیخوێنێتەوە ئەوا لێ ی تێناگات).

خوازیارم ئەم پەیڤە زۆر بەئازار بێت، چونكە قورئانەكان لەنێو ماڵەكانماندا هەڵواسراون بۆ جوانی و پارێزراوی لەچاو پیسی.

## چۆن هاوسەنگی دەستەبەربکەین؟

بۆ ئەوەی کە ئەو هاوسەنگی لە نێوان گیان و ماددەدا دەستەبەربکەین ڕێگەیەکی زۆر ئاسان بۆ ئەمە هەیە، کاتێ کە دەست دەکەیت بە کارێکی مادی بۆ نمونە دەست پێشخەری لە کارێکی گیانیشدا بکە... دانیشتوی بە تەلەفۆن یەك کات ژمێر قسە دەکەیت، پاش ئەوە یادی خوا بکە ماوەی نیو کات ژمێر سەیری TV دەکەیت نیو کات ژمێریش قورئان بخوێنە، پۆشاکێکی نوێ دەکڕیت بایی نیوەی نرخەکەی ببەخشە.

هەرکەس بتوانێ ئەم هاوسەنگی یە دەستەبەر بکات ئەوا بە جوانترین و بەختەوەرترین شێوە دەژی.

پێغەمبەر(ﷺ) فێرمان دەکات کە چۆن ئەم هاوسەنگی یە دەستەبەر بکەین کاتێ کە دەفەرموێ.

(پەروەردگارت مافی لەسەرتە، دەروونت مافی لەسەرتە، کەس و کارەکەت مافیان لەسەرتە، مافی هەریەك لەو خاوەن مافانە بدە).[1]

کەسێك لە ئێمە دادەنیشێ و تاکات ژمێر سێ ی شەو سەیری TV دەکات، گەر پێی بڵێی هەستە نوێژەکەی بەیانیت بکە، دەڵێت داوای لێ بوردن دەکەم کات ژمێر ٩ی بەیانی کارم هەیە، خوای گەورەش داوای شتێکی نەکردووە کە لە تواناد نەبێت.

گەر بە یەکێك بڵێین کات ژمێری ٥ ی بەیانی لەژێر خانوەکەتدا ٥٠٠ جونەیە دەدۆزیتەوە چی دەکەیت؟!

بێ گومان دادەبەزێ و هەڵیدەگرێت و ئەگەر بێدار نەبویەوە ئەوا خێزانەکەی لەخەو بێداری دەکاتەوە، بەڵام لەگیان لە ڕازی کردنی پەروەردگاردا دەبینین دەڵێت: (مامە پەروەردگارت پەروەردگاری دڵەکانە گوێ مەدەرێ بنو!)

هەرچۆن خۆراکی جەستەت دەدەیت هەر بەو شێوەیەش خۆراکی ڕوحت بدە، هەریەکێك لەوانە مافیان لەسەرتە لەبەرئەوە مافی خۆیان بدەرێ، بەردەوام ببە لەسەر بەندایەتی و ملکەچی پەروەردگارت، نوێژەکانت لە کاتی خۆی و لە مزگەوتدا بکە.

---

١- بوخاری ریوایەتی کردوە.

لە كۆتایدا... داوا لەو كەسانە دەكەم كە دەیانەوێ خواردن بدەنە گیانیان با یادی خودا بكەن ئەگەر بۆ ماوەی١٠ خولەكیش بێت... ئەمە خاسیەتێكە پێش كەش بە هەموو ئەوانەی دەكەم كە بەدەست پەژارەیی یەوە دەناڵێنن وە ئەو ئافرەتانەش كە گرفتیان هەیە... پەروەردگاریش دەفەرموێ: ﴿ألا بذكر الله تطمئن القلوب﴾ الرعد: ٢٨.

لە خوای گەورە دەپاڕێینەوە كە ئەمەمان لێ قەبوڵ بفەرموێ، و لەسەر ملكەچی و بەندایەتی خۆی دامەزراومان بكات و لە خۆیان نزیك بكاتەوە و لە ئێمە و ئێوەش خۆش بێت...آمین، أجمعین.

## چەند گەنجینەیەك لە جیهانی گیان:

### كەرەستە بێ گیانەكان بە یادی خودا خۆشحاڵ دەبن!!

إبن مسعود(ﷺ) دەفەرموێ: چیا بەناوی خۆیەوە بانگ دەكرێ ئەی فلان، ئایا كەسێك بەلاتدا تێپەڕی یادی خوای كرد؟ گەر چیاكە ووتی: بەڵێ ئەوا مزگێنی بێ لێت.

### لە خۆراكی گیاندا چێژێك بۆ جەستە هەیە!!

یەكێك لە سەلەف دەڵێت: گەر نەوەی پادشاكان بیان زانیایە ئێمە لە چ چێژێكداین ئەوا بە شەڕ دەهاتن لە گەڵمان لەسەر ئەو چێژە.

هەروەها تێری تێدایە!!

عوسمانی كوڕی عەفان(ﷺ) دەفەرموێ: گەر دڵتان چاك بكەن ئەوا لە ووتەی پەروەردگارتان تێر نابن.

### لە خۆشەویستی یادكردنەوە مادە ڕوحی پێدا تێدە پەڕێ!!

كاتێ كە پێغەمبەر(ﷺ)لەو درەختە جیا بویەوە كە مینبەرەكەی لەسەر بوو درەختەكە دەستی كردە نركە نرك وەك ئەو منداڵەی كە سۆزی دایكی وون بكات پێغەمبەر(ﷺ)چاكەی لەگەڵ كرد و دەستی پیاهێناو هێوری كردەوە و نركە نركەكەی سوك كرد، پاشان فەرموی: (گریا لەسەر ئەوەی كە گوێی لەیادی خوا دەبوو).

هەروەها شێخ حسن ی بەصری ئەگەر ڕیوایەتی ئـەم فەرمودەیـەی بکردایـە دەگریـا و دەیفەرموو ئەی بەندەکانی خودا دار و درەخت داوای سۆزی پێغەمبەر (ﷺ) دەکات، ئێوە بەندەی خودان و پیویستە زیاتر پەرۆشی ئەو بن.

براکەم خۆت لەو کۆت و بەندەت ڕزگار بکە و بەرەو مەلەکوتی گیان دەر بچۆ.

## تێکۆشان دژ بەدەروون( نەفس ):

ئەم بابەتەمان ئاڕاستەیە بۆ تەواوی خەڵکی و لاوان بەتایبەتی.

زۆرێك لە لاوان بەدەست ئەو گرفتەوە دەناڵێنن کە لاوازن لەبەردەم دەرونیاندا و ناتوانن بەرگەی بگرن و هەرکاتێ کە داوای شتێك دەکات بۆی جێ بەجێ دەکەن..

لەوانەیە کە دەرون داوای مادەی بێ هۆشکەر و سەرپێچی و تاوان و زۆر شـتی دیکـە بکات، بەڵام نازانی کە چۆن بەرگەی دەگرێت، ئەو هیچ ڕێگەیەك، یان پێشبینی یەکی نی یە بۆ کۆنترۆڵ کردنـی ئارەزوەکـانی دەرونـی، ئـەم کـۆنترۆڵ کـردن و هـەڵس و کـەوت و مامەڵەیە لە ئاینی ئێمەدا پێناسـەیەکی هەیـە کـە پێـی دەوتـرێ تێکۆشـانی دەرونـی، تێکۆشان نەك خەبات، لەبەر ئەوەی کە ووشەی تێکۆشان زۆر لە ووشـەی خـەبات گـەورە ترە.

## تێکۆشانی دەرونی چی یە؟ مانای چی یە؟ چۆن ئەمە دەکەین؟

لەبەر زۆری نادیاری ئەم واتایە لـە دەرون، ئـەم کـارە زۆر دژوار بـووە لەسـەرەتادا... پێویستە ووشەی تێکۆشان بناسین و وشەی دەرونیش هەروەها و پێکەوە گرێیان بدەین تـا بزانین لەچی دەدوێین.

(المجاهده) تێکۆشان لە بنەڕەتی زماندا لە ووشەی (جهد) هاتووە، واتە هەوڵـدان، یـان هەڵهێنانەوەی ووزە کەواتە تێکۆشانی دەرونی مانای دریێخـی نـەکردن و هەڵهێنانـەوەی ووزەیە لە بەرگری کردن لە شتێکی دیاری کراو بەواتایەکی دیکە: تۆ دەرونت دەبڕی یـەوە لە ئارەزوەکانی، ئایا تۆ لەشیر بڕینەوەی کۆرپە دەزانیت ؟ واتە کـە دەگـری، لەبەرئـەوەی

كە دەیەوێ بەو شێوەیە شتی دەست بكەوێ، بەڵام دایكی هیچی پێ نادات، ئەمەش لە ژیانی ئێمەدا مانای وایە كە دەرون داماڵی و بیبڕیتەوە لە ئارەزوەكانی بۆ نمونە هاوڕێكانم هەموویان مەییان نۆشیوە... نەخێر! من خۆڕاگر دەبم لەبەردەمیان، من ئەو گوناهەم ناوێت، دەرون داوام لێ دەكات كە بڕۆم بۆ ئەو جێگایە و ئەو تاوانە ئەنجام بدەم، نەخێر ناڕۆم و هەرگیز ئەو كارە ناكەم و من بە دەرونم دەڵێم نەخێر.

## جۆرەكانی نەفس:

كەسێك دەپرسێ مانای جۆرەكانی نەفس چی یە ؟ ئایا هەریەك نەفس نی یە ؟ نەفسی مرۆڤایەتی چەندین شتی بەسەردا دێت و چەند شێوەیەكی جیاوازی هەیە .

جۆری یەكەم: نەفسی فەرماندەر بە خراپە: ئەمە یەكێكە لە جۆرەكانی نەفس كەوا لە خاوەنەكەی دەكات هەموو ئەو كارە خراپانە ئەنجام بدات كە پەروەردگار پەست دەكات، واتە هەمیشە زاڵە بەسەر خاوەنەكەیدا وە پاڵی پێوە دەنێ بۆ ئەنجام دانی هەموو ئەو شتانە كە دەبێتەی مایەی سەرپێچی پەروەردگار وە هەرگیز ڕووبەڕووی سەرپێچی نابێتەوە﴿وَمَآ أُبَرِّئُ نَفۡسِيٓۚ إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ﴾ یوسف: ٥٣، سەرنجی خێزانەكەی عەزیز بدە گەیشتۆتە ڕادەیەك كە ئارەزوی ئەوە دەكات لە بەندەكەی كە لە خۆی نزیك بكاتەوە و تەواوی دەرگاكانی ماڵەكەشی لەسەر دادەخات سەیر بكەن كە ئەم دەرونە تا چ سنورێك وون بووە وە بەوپەڕی بوێری یەوە و هیچ هەست بەشەرم ناكات وەك ژنێك نرخ و بایەخی خۆی ون دەكات و دادەبەزێت بۆ نزمترین پلە وە لە كۆتایدا دەڵێت:﴿وَمَآ أُبَرِّئُ نَفۡسِيٓۚ إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ﴾ ئەوەی كەوای لە من كرد بگەمە ئەم پلە و پایەیە ئەو نەفسە بوو كە زاڵ بوو بەسەرمدا كە بریتی یە لە نەفسی فەرماندەر بەخراپە.

بەڵێ چەندین نەفسی لەم شێوەیە هەیە، پەنا بەخودا دەگرین لە پەست بوونی و لە نەفسی فەرماندەر بە خراپە.

جۆری دووەم: نەفسی لۆمەكەر: كاتێ كە مرۆڤ تاوانێك دەكات وای لێ دەكات بیر بكاتەوە كە چۆن ئەمەی كرد ؟ وە بۆچی ؟ من جارێكی دیكە ئەمە دوبارە ناكەمەوە،

ئەمە بریتی یە لەو نەفسەی کە هەرکاتێ دەکەوێتە نێو گێژاوی خراپەیەکەوە . بە حوکمی ئەوەی کە مرۆڤە جۆرێك لە تەنگەڵانی و هەست کـردن بەهەڵــە لای ڕوو دەدات هــەروەها هەست بە ترسـان لــە پــەروەردگار دەکـات: ﴿لَآ أُقۡسِمُ بِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ ۝١ وَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلنَّفۡسِ ٱللَّوَّامَةِ﴾ القیامە: ١ـ ٢. با تێبینی شتێکی زۆر سەیر بکەین، کە پەیوەنـدی ڕۆژی خەسڵانە بە نەفسی لۆمەکەرەوە لە سوێند خواردنەکەدا، ئەمــەش لەبەرئــەوەی کــە ئەم جۆرە نەفسە هەمیشە ڕۆژی دوایی لەیادە وە لەچارەسەرەکانی نەفسی تـا خۆمـان لــە نەفسی فەرماندەرەوە بگۆڕین بۆ نەفسی لۆمەکەر ئەوەیە کە ڕۆژی دوایـت بێتــەوە یـاد و بەخۆت بڵێی، تۆ دەچیتە بەردەم پەروەرگارت، تۆ لەبەردەم پەروەردگارت ڕادەگیرێی.

جۆری سێ یەم: نەفسی ئاسودە: ئەو نەفسەیە کە ترس و تکای لە خودا هەیە و ڕازی و سەقامگیرە و لەبەرئەوە خوای گەورە ناوی لێنـاوە ئاسـودە و لەبـەر ئــەوەی کــە تــەواوی خەڵکی سەرسامن لەدەوری و تەنها ئەوە ڕازیە، هــەموو خــەڵکانی دەوروبــەری گرفتیــان هەیە و دودڵ و تۆقاون، بەڵام ئەم دڵە ئاسودەیە... ئاه گــەر دەرونــی خــۆت بەئاســودەیی دەژیاند

﴿يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفۡسُ ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ ۝٢٧ ٱرۡجِعِيٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرۡضِيَّةً ۝٢٨ فَٱدۡخُلِي فِي عِبَٰدِي ۝٢٩ وَٱدۡخُلِي جَنَّتِي﴾الفجر: ٢٧-٣٠.

جۆر چوارەم: نەفسی بێ ئاگا: لە مەترسی دارترین جۆرەکانی نەفـسە چـالاك نــی یــە، خاوەنەکەی لە سەرگەردانە تاوانبارە خراپەکارەکانی نەفسی فەرماندەر بەرخراپە نی یــە و لەوانەش نی یە کە سور و بەردەوامن لەسەرملکەچی کردنی خودا و لەوانەش نی یــە کــە نەفسیان لۆمەکەرە و لۆمەیان بکات لەســەر ئــەو تاوانــەی کــە ئــەنجامی دەدەن ئــەو لــە دونیادا سەرگەردانە و هەرچی یەك بیەوێ ئەیکات، بۆ نمونە ئەو کیژێکی باش و بەڕەوشتە و زۆر بەباشی پەروەردەکراوە، بەڵام کەسەیری دەکەیت لە ناخەوە ئەو لەکوێ یە لای خودا و ئەو تاوانباری نیەیە و ملکەچیش نی یە، بەڵام کەسێکی سەرگەردانە.

**من شتێکی زۆر سەیرتان پێ دەڵێم، ئایا بڕوادەکەن، کە تەوبەکردنی ئەم نەفسی بێ ئاگایە دژوارترە لە تەوبەکردنی نەفسی فەرماندەر بە خراپە؟**

کەسی گوناهبار دەیەوێ پاش کەمێك تەوبە بکات ئەو بە درێژایی ڕۆژگار ئاوا و ئاوا دەکات، ئەو لەم گوناهانە ماندو بوە، گوناه سەرشۆڕی و زەبونی و بێ خەوی و سەرلێشێواوی لەگەڵە، بەڵام بێ ئاگا تەوبە ناکات لەبەر ئەوەی، کە شەیتان هەمیشە سوکایەتی پێ دەکات و پێی پێ دەکەنێ.

ئەم نەفسی بێ ئاگایە، لە دژوارترین جۆرەکانی نەفسە، خەڵکانێکی زۆر نەداوێن پیسن و نە تاوانبارن و نە بەندەی ملکەچن، بەڵکو زۆربەری خەڵکی سەرگەردانن.

ئای... تۆ لە کامیانی؟ ئایا لەو نەفسەی، کە تاوان زاڵ بووە بەسەریدا و نازانێ چۆن بەرگەی ئارەزوەکانی بگرێت وەك ئەوەی، کە دیلی بێت و ئەو لە گەردنی بگرێت و بۆ هەرکوێی بیەوێ بیبا وە ئەو کەسێتی خۆی نی یە و ئازاد و سەربەست نی یە بەڵکو بەندەی هەواو ئارەزوەکانیەتی: ﴿ أَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَـٰهَهُۥ هَوَىٰهُ أَفَأَنتَ تَكُونُ عَلَيْهِ وَكِيلًا ﴾الفرقان: ٤٣.

**دەپرسین: ئایا نەفس لەسەر یەکێك لەم حاڵەتانە دەمێنێتەوە و ناگۆڕێ، یان دەکرێ لەیەك ڕۆژدا هەر چوا حاڵەتەکە لەخۆی بگرێ؟**

ئەمە گونجاوە... بۆ نمونە جادوگەرەکانی فرعەون چونە لای و پێیان وت: ﴿فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ قَالُوا۟ لِفِرْعَوْنَ أَئِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَـٰلِبِينَ ﴿٤١﴾ قَالَ نَعَمْ وَإِنَّكُمْ إِذًا لَّمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴾ الشعراء: ٤١-٤٢ . واتە من هەر پارەو بەخشیشتان نادەمێ بەڵکو دەتان کەمە کەسانی نزیکم ﴿فَأَلْقَوْا۟ حِبَالَهُمْ وَعِصِيَّهُمْ وَقَالُوا۟ بِعِزَّةِ فِرْعَوْنَ إِنَّا لَنَحْنُ ٱلْغَـٰلِبُونَ﴾ الشعراء: ٤٤، سەیر بکە تۆ دەڵێیت: بسم الله و ئەویش دەڵێت: بە عزەتی فیرعەون و، پاشان موسی گۆچاکەنەی فرێ دەدات و پاش یەك خولەکە ((فألقي السحرة سجدين)) الشعراء.

## بەم شێوەیە نەفس دەکرێ هەڵگەڕێتەوە!.

خەڵکانێکی زۆر هەن کە دەڵێن ناکرێ کە ئێمە ئاین پەروەر بین، چونکە ئەمە پێویستی بە ساڵانێکی دوور و درێژ هەیە وە جادوگەرانی فیرعەونیش هەڵدەگەڕێنەوە و دەڵێن: ﴿قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ الشعراء: ٤٧، فیرعەون پێی ووتن: ﴿ لَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَٰفٍ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ ﴾ الشعراء. ٤٩، ئەوانیش وەلامیاندایەوە و وتیان: ﴿قَالُواْ لَن نُّؤْثِرَكَ عَلَىٰ مَا جَآءَنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلَّذِى فَطَرَنَا ۖ فَٱقْضِ مَآ أَنتَ قَاضٍ ۖ﴾ طه: ٧٢، ئایا دەکرێ کەسێك بدۆزینەوە کە پارەی بوێ و پاش کەمێك پێی بلێن: (لەت لەتت دەکەین) ئەویش بلێ: (فەرمان بدە بەوەی کە پێت دەکرێ ئەمە چی یە؟ چی لەناخەوە ڕویدا؟ بێ گومان شتێکی زۆر ناسروشتی ڕوویداوە...

## بۆچی ئەمە بۆ ئێمە ڕوونادات؟

دەترسم کە ئێمە لە نەفسی جۆری چوارەم بین، بێ ئاگابین، جادو گەران وتیان ئەم دونیایە چەندە بێ نرخە !! ﴿إِنَّآ ءَامَنَّا بِرَبِّنَا لِيَغْفِرَ لَنَا خَطَٰيَٰنَا وَمَآ أَكْرَهْتَنَا عَلَيْهِ مِنَ ٱلسِّحْرِ ۗ وَٱللَّهُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ ﴾ طه: ٧٣.

هەروەها لە ژیانی ئێمەدا چەندین موعجیزە بەدی دەکرێت، خەڵکانێك هەن کە گرفتی زۆر گەورەیان هەیە و خوای گەورە لێی ڕزگار کردون، دەرگای لێ کردونەتەوە، بەلام ئێمە ناخوێنینەوە و لە موعجیزەکانی خوای گەورە ناگەین.

عومەری کوڕی خەتاب(ﷺ) شمشێرەکەی هەڵگرت هەتا پێغەمبەر(ﷺ)بکوژێ لە ڕێگادا پیاوێك دیتی وە پێی وت: خوشکەکەت بکوژە کە موسڵمان بوە نەك پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش چوو بۆ لای خوشکەکەی شەپازلەیەکی وای لێدا کە گوارەکەی لەگوێ خستە خوارێ و لێوی دوکەرت کرد... ئەم نەفسە دژوارە چی یە ؟!! وەکاتێ کە

گــوێی لــەم ئایەتانــە بــوو ﴿طه ۝١ مَآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ لِتَشْقَىٰٓ ۝٢ إِلَّا تَذْكِرَةً لِّمَن يَخْشَىٰ ۝٣ تَنزِيلًا مِّمَّنْ خَلَقَ ٱلْأَرْضَ وَٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلْعُلَى﴾ طــه: ١-٤.

عومەر گریا و ووتـی چـی بکـەم تـا بێمـە نێـو ئـەم ئاینـەوە ؟ ووتیـان بـڕۆ بـۆلای پێغەمبەر(ﷺ)، ئەوە عومەری کوڕی خەتابی ناسراو بە عومەری فاروق... ئەمە چی یـە لە٢٤ کات ژمێردا لە بکوژی پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەگۆڕێ بۆ عومەری فاروق!!

نەفس قابیلی گۆڕانە، بەڵام ئەم کارە پێویستی بە تێکۆشـان و ڕاسـت گـوێیی هەیـە و بەردەوامیش پێویستی بە تەنها تاوێکی ڕاستی هەیە کە لەگەڵیدا نیازی ئەوە بکـات کـە ژیانی بە تەواوی لە پێناوی خوادا تەواو بکات.

ئەمەش نمونەیەکی زۆر بەچێژی پیاوێکە کە ناوی: فچالەیە ئەم پیاوە لـە ڕۆژی فـەتحی مەککە کاتێ کە پێغەمبەر(ﷺ)بـە خەڵکەکـەی ووت ( ئێـوە بـڕۆن ئـازادن، بـەڵێ لـەم ڕەفتارە نیان تر و گەورەتر بەدی ناکرێت، چونکە ئەو بـێ باوەڕانـە بـۆ مـاوەی ٢٠ سـاڵ ئازاریان دا، بەڵام ئەو پێیان دەفەرموێ: من لێتان خۆش بووم، ئەم فـچالەیە یـەکێك بـوو لەوانەی کە پێغەمبەر(ﷺ) لێی خـۆش بـوو، بـەڵام سوپاسـی ئـەم ڕەفتـار جـوانی یـەی حەزرەتی نەکرد بەڵکو خەنجەرەکەی هەڵگرت و پاش ئەوەی کە لێـی خـۆش بـوو ویـستی پێغەمبەر(ﷺ)بکوژێ ئەم کابرایە چـەند نەفـسی دژوار بـووە، پێغەمبـەر(ﷺ)بـەدەوری کەعبـەدا دەسـوڕایەوە و فـچالەش چـاوەڕێی هـەلێکی لـەباری دەکـرد بـۆ ئـەم نیـازەی حەزرەت(ﷺ)ئاوڕی لێ دایە و پێ ووت (نەفس بەچی دەت دوێنێ ئەی فوزالە))؟ ئـەویش ووتی: یادی خوا دەکەم، حەزرەت(ﷺ)پێی فەرموو: (لەخودا بترسە ئەی فوزالـە)، پاشـان دەستی بەرز کردەوە و فچالە ووتی وام زانی کەلێم دەدات، پاشان دەستی نایە سەر دڵی و دەستی دەهێنا بەدڵمدا و پێدەکەنی و دەیفەرموو: (داوای لێخۆش بـوون لـە خـودا بکـە، لەخودا بترسە، داوای لێخۆش بوون لەخودا بکە) فچالە دەڵێت: پێش ئەوەی، کـە دەسـتی بخاتە سەر سنگی ڕقاوی ترین کەسی سەرزەوی بوو لـە دڵمـدا پـێش ئـەوەی کـە دەسـتی لەسەر سنگم بەرز بکاتەوە بویە خۆشەویسترین کەسی سەر زەوی لەدڵمدا.

لێرەدا پەیوەندیەکی داوێن پیسی هەبوو -پەنا بەخودا- لەنێوان فوزلـە و ئافرەتێکـدا لەسەردەمی نەفامیدا، ئەو ڕاهاتبوو کە بڕوات بۆلای پاش ئەوەی کە موسڵمان بـو بـەلای ئافرەتەکەدا تێپەڕی لە کاتێکدا ئافرەتەکە دانیشتبوو وە ووتی وەرە ئەی فوزالە با پێکەوە قسە بکەین ئەوە بێننە پێش چاوی خۆتان کە ئەم کابرایە چی دەکـات کـە دەیوسـت دوو خولەك لەمەوبەر حەزرەت(ﷺ)بکوژێت...

لاوان دەڵێن: من ناتوان لە ئاستی داوێن پیسیدا خۆم ڕاگرم، مـن نـاتوانم لـە ئاسـتی کچان خۆم ڕاگرم.، بەڵام فچالە ئەم دێڕە هۆنراوە جوانەی ووت کە دەڵێت:

قالت هلم الى الحديث قلت يأبي عليك الله والاسلام

لوكانت رأت محمدا ورجاله بالامس يوم تكسر الاصنام

ئەمە چی یە ؟ کێ ئاوا هەڵیگێڕایتەوە ئەی فوزالە ؟ چۆن نەفسی خۆتت بـەم شـێوەیە گۆڕی؟

## ئەی ئێمە بۆ خەباتی دەورنمان ناکەین؟

دەکرێ هۆکەی ئەوە بێت کە ئێمە متمانەی تەواومان بەخودای گـەورە نـەبێت، خـوای گـەورە پـەیمانی پـێ داویـن ﴿وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ العنكبوت: ٦٩.

گەر ئێمە متمانەی تەواومان بەخودامان هەبێت هەرگیز لەیادمان ناکـات، واتـا گـەر هەوڵت دا داتدەمەزرێنێ، ئەم بابەتە تەنها پێویستی بە تێکۆشانێکی ڕاستەقینە هەیە لە خۆتەوە.

## کامیان هۆکاری سەرەکین . نەفست، یان شەیتان؟!

کەسێك دەڵێت من نازانم چۆن خەباتی دەرونی خۆم بکەم، من نازانم شـەیتان پـێم پـێ دەکەنێ، یان نەفسی خۆم؟

نەفس ئەو گوناهە دەناسێ کە کار دەکاتە سەر مرۆڤ، گەر گوناهێك هەبێت سور بێت لەسەرم ئەوا لە نەفسی خۆمەوەیە نەك لە شەیتانەوە، بەڵام شەیتان بەلایەوە گرنگ نی یە کە من بکەوم، هەر گوناهێك لەبەردەمی خۆیدا ببینێ ئەوا لەسەری یارمەتیم دەدات.

بەڵێ... ئەمەش جیاوازی یەکی زۆر گرنگە هەتا نەڵێین شەیتان ئەو کەسەیە کە پێم پێ کەنیوە و سوکایەتی پێ کردوم و ئەو وای لێ کردم کە ئەمە بکەم، شەیتان هیچ ئامانج و مەبەستێکی نی یە لە گوناهێکی دیاری کراو، بەڵام گرنگ بەلای ئەوەوە ئەودیە کە تۆ گوناه بکەیت، ئەو پێت دەڵێ: ئەم کارە بکە، تۆش دەڵێیت: نەخێر، ئەو جارێکی دیکە پێت دەڵێتەوە تۆش پێی دەڵێیت: نەخێر، پاشان پێت دەڵێت کارێکی دیکە بکە، ئەو لە گوناهێکەوە لەگەڵ دێ بۆ گوناهێکی دیکە، ئامانجی ئەوەیە کە بەرهەر رێگەیەك بێت تۆ بکەوی، بەڵام نەفس سور دەبێت لەسەر ئەو تاوانە و بەخۆت پێی دڵێیت: نەخێر، ئەویش پێت دەڵێت: من ئەو تاوانەم دەوێ و تۆش هەر بەو شێوەیە دەمێنیەوە .

ئەمەش ڕاڤەی ئەوە دەکات هەرچەندە شەیتانەکان لە ڕەمەزاندا کۆت و بەند کراون، بەڵام مرۆڤەکان هەر سەرپێچی دەکەن وە ئەمەش دەکرێ کە لە ڕەمەزاندا ئاشکرای بکەیت کە کێ بەهێزترە نەفسی تۆ، یان شەیتان، خەڵکانێك هەن لە ڕەمەزاندا زۆر خراپترن لەوەی کە پێش ڕەمەزان بوون کەواتە ئەمانە نەفسیان زۆر زۆر خراپە.

# چەند چیرۆکێکی ڕاستەقینە

## گەڕانەوە بۆلای خودا

من ناوم مصطفی محمودە... تەمەنم نزیکەی ٢٦ ساڵە و دەرچوی کۆلێژی بازرگانی زانکۆی قاهیرەم و لە بواری بەرهەم هێنانی کاسێتدا کار دەکەم... من سەر گوزشتەی خۆمتان لەگەڵ پابەندیم بۆ دەگێڕمەوە، بەڵکو خوای گەورە سودێکی بخاتە ناوی یەوە.

لە ژیانمدا جێگایەك نەبوو بۆ ئاین جگە لە چەند شتێکی سادە نەبێت... من لە قوتابخانەیەکی تێکەڵاودا بووم... ژیانم وەك ژیانی زۆرێك لە لاوان وابوو دەرچون لەگەڵ کیژان و گۆرانی و مۆسیقا و سەماکردن، واتە گۆرانی زاڵ بوو بەسەرمدا هەر لە منداڵیمەوە هەروەها من هەر لە منداڵیمەوە کچە هونەرمەندێکم زۆر خۆش دەویست هەموو جارێ گۆڤارێکم دەکڕی، کە وێنەی ئەوی پێوە بوو بەیەك جونەیە، یان دو، یان دە جونەیە، هاوڕێکانم دەیان دواندم گۆڤارێکی وەهایە و وێنەی ئەو هونەرمەندەی پێوەیە، من چوم و کڕیم و وێنەی ڕەش و سپی و ڕەنگاو ڕەنگی تێدا بوو و چوار دەوری دیواری ژورەکەم پڕبوو لەو وێنەیە، ڕۆژێك حەزم لەوە کرد، کە تەواوی ئەو وێنانە دامالم کاتێ، کە دەستم برد، بەلام دەستم گەڕاندەوە یەکەم جار ویستم دایان گرم، بەلام نەمتوانی، جاری دووەم هەولم داو نیوەیانم داگرت و خەریك بوو جارێکی دیکە هەڵیان بواسم و هەتا سەرکەوتم بەسەر نەفسی خۆمدا و خەباتم کرد و سەرکەوتم لە دڕاندن و داماڵینیان.

هەموان دەیان زانی، کەمن بەشێوەیەکی زۆر خراپ ئەو هونەرمەندەم خۆش دەویست، داماڵینی ئەو وێنانە بۆمن گۆڕانێکی لە ڕیشکەوە بوو، لەم ڕۆژەدا هەستم دەکرد، کە کەس و کارەم زۆر بەشێوەیەکی نا سروشتی ڕێزم لێ دەگرن.

ڕۆژێك کە لەگەڵ هاوڕێکانم دانیشتبوین و تاوانێکی دیاری کراومان ئەنجام دەدا لەگێژاوی مەستی و بەختەوەری دابووم هەڵوێستێك ڕوویدا و بەهۆیەوە سوکایەتیم پێ کرا لەو کاتەدا من هەستم بە قێزەونیەکی زۆری ئەو تاوانە کرد، دابەزیم و گەڕامەوە ماڵ و لە تەنیشت ماڵەکەماندا وەستام من کەرەستەکانی ئەو تاوانەم هەرپێ بوو، ئا لەم کاتەدا

بڕیارم دا، کە هەرگیز و جارێکی دیکە نەگەڕێمەوە سەر ئەو تاوانە، هەر بەو بۆنەیەوە مـن گەڕامەوە سەری و چەند جارێك لێی دور کەوتمەوە هەموو جارێکیش دەگەڕامەوە، ڕۆژێـك من و هاوڕێکانم دوچاری گرفتێ بووین و وتمان چی دی ئەم گوناهە ناکەین، بـەڵێ نـەمان کرد، پاشان جـارێکی دیکـە گەڕاینـەوە سـەری، لەبەرئـەوەی، کـە پاڵنـەر لـە دوای واز لێهێنانی نە هۆکاری ئاینی بوو نە پابەندی.

ڕۆژێك من لەو گازینۆیە دانیشتبوم، کە هەمیـشە هـەمومان لـە کـاتی وانەکانمانـدا تیایدا کۆ دەبووینەوە، ئەو گازینۆیە شوێنی پێك گەیشتنمان بوو کاتێ، کـە دەچـوین بـۆ قوتابخانە و شەوانەش دەگەڕاینەوە بۆ ئەوێ ئێمە لە مانگی ڕەمەزانـدا بـوین و گـوێم لـە مایکرۆفۆنی مزگەوتەکە بـوو مامۆسـتا قورئـانی دەخـوێن و بـانگی خـەڵکی دەکـرد و دەگریان و خەڵکانێکیشم دەدی، کە دەڕۆیشتن و دەگەڕانەوە و ئەم دیمەنەش زۆر نامۆ بوو، منیش ووتم: من لەگەڵ ئەم خەڵکانەدا نیم؟ بۆچی ئەم خەڵکە سەرقاڵن و بە پەرۆشـن بـە شتێکی دیکەو و بە شێوەیەکی دیکە دەژین جیاواز تر لەوەی، کە من تیایدا دەژیم.

هەروەها ئەوەم لەیادە، کە ڕۆژێ لەگەڵ هاوڕێکانم چـووم بـۆ زانکـۆ بـۆ ئاهـەنگێکی ئاینی بوو چوینە ژورێ، بەڵام من هیچ لەوە نەگەیشتم، کە باس دەکرا، بەڵام ئەوەی، کـە هەستم پێ کرد، بریتی بوو لە پاك و خاوێنی و پوختی و ڕوونی ئاین، ئەوەی کـەمن لـەم ساتەدا یادی دەکەمەوە هەر دەگریام و دەگریام، سەیرم بەو گریانەم دەهات، کە هیـچیش تێ نەدەگەیشتم، سوپاس بۆ خودا دەستم کرد، بە بیر کردنەوەیەکی دیکە، ژیـان و شـوێن بایەخەکانم گۆڕان و هەستێکی زۆر جوانم هەبوو بـەجۆرێ کـە پێـشتر بـەم جـۆرە هەسـتم نەبووە بەجۆرێ: کـە بوومـە مرۆڤێـك و خوازیـارم کـە هـەموو مـرۆڤ بـەم شـێوەیە بـن لەبەرئەوەی کە هەستم دەکرد کە ئەوان دورن لە خوداوە و ئەوان لە زۆر شتی ئەم دونیایـە بێ بەری کراون.

بەڵام سەرگوزشتەم لەگەڵ هونەردا من مۆسیقام خۆش دەوێ و حەزیشم لە گۆرانی یـە کاتێ، کە پابەند بووم نە حەزم لە گۆرانی و نە حەزم لە مۆسیقا بوو... هەتا کەسێك پێی ووتم بۆچی ئەم بەهرەیە لە ملکەچی خودا بەکار ناهێنی؟

سوپاس بۆ خودا ئێستا من کۆمپانیایەکی بەرهەم هێنانی کاسێتم هەیە و سرود پێشکەش دەکەم و خوازیارم لە خودا ئامانجی خۆی بپێکێ و کاریگەر بێت لە کۆمەڵگادا...

## ئەو هۆکارە دامەزراوی یانە کامانەن کەوا دەکات لە مرۆڤ کە جارێکی دیکە نەگەڕێتەوە سەر تاوان کردن؟

هاوەڵی کردن تیایدا لە گرنگترین ئەو هۆکارە کاریگەرانەیە لە دەرون و ڕەفتاری مرۆڤدا...

هاوڕێ سێ جۆری هەیە: هاوڕێ یەکی ئیماندار، کە دەستت دەگرێ بۆ ملکەچی کردنی پەروەردگار، هاوڕێ یەکی بەڕێز و ڕەفتار چاك، بەڵام نە ئیمانداری نە گوناهبارە، بەڵام ئەوەی، کە وتمان بێ ئاگا، یان هاوڕێ یەکی خراپە کارەو، گرنگ ئەوەیە، کە بەپێی توانا لێی دوور بکەویتەوە.

ئەم پەیڤەم ئاڕاستەی باوکان و دایکان ولاوان دەکەم و دەڵێم: هیچ شتێك نی یە وەك هاوڕێی خراپ مرۆڤ سەرگەردان بکات وە هیچ کەسێك نی یە بڵێت کە من کەتومەتە نێو گوناهێکی گەورەوە، یان مەی دەنۆشم ین... و یان... بەتەنها وە دەبێت کەسێك بۆ ئەمە دەستت بگرێت وە دەکرێ بەتەواوی لەهاوڕێی خراپ دوور بکەویتەوە، بەڵام شتێکی بچوك دەمێنێتەوە کە بریتی لە پارێزگاری کردن لەو پەیوەندی یە لە دورەوە.

ئەم پەیوەندی یە کۆتایی پێ نایەت، لەبەرەئەوەی کە دەکرێ تۆ ئەو دەستە بیت کە درێژ دەکرێت بۆ ئەو هاوڕێ یە، وە دەستی دەگریت بۆ ملکەچی پەروەردگار، بەڵام گرنگ ئەوەیە کە تۆ دوور بیت و دەرونت بەتەواوی بتەو بێت، بەڵام هاوڕێی بێ ئاگا ئەوەیە کە دەستی دەگریت و ڕایدەپەڕێنی و سور دەبیت لەسەر هاوەڵی کردنی وە هاوڕێی ئیماندار پەنای بۆ دەبەیت و سور و بەردەوام دەبیت لەگەڵی و پێی دەڵێیت دەستم بگرە.

## ئەو هۆکارانە چین، کە دامەزراوم دەکەن لەسەرخەباتی دەرونیم؟

(١) داوای یارمەتی لە خودا، من بڵێم: پەروەردگارا هەر شتێك کە تۆ پێی ڕازی نیت من ڕقم لێی دەبێتەوە، سبحان الله پاش ئەوە خۆت دەبینیەو کە ڕقت لە هەموو ئەو شتانەیە کە خوای گەورە پێی ناخۆشە.

ئەمەش خاڵێکی زۆر گرنگە، سوێند بەخوا کەسانێکی زۆر هەن کە ساڵانێکی دوور و درێژ دەپاڕێنەوە: پەروەردگارا کۆمەکیم بکە پەروەردگارا ئەم گوناهە لەدڵم دەرپەڕێنە، وە ناتوانێ لێی بگەڕێ و سوێندت بۆ دەخوات کە دەست بەجێ لە دڵی وەك تاڵە مویەك دەرپەڕیوە، یان وەك ئەوەی کە هەر نەبوبێ.

ئەمە بریتی یە لە بنەما، گەر تۆ دەتەوێ واز لەهەر گوناهێك بهێنی لە ژیانتدا، پێویستە پەنا بۆ لای ئەو کەسە بەریت کە دڵت بەدەستیەوەیە، ئەمە درێژە دەکێشێ هەتا خوای گەورە ئەو داخوازی یە ڕاستەقینەیە تاقی دەکاتەوە، بەڵام ئەو گوناهە پاش ئەوە و بەویستی خوا دەردەپەڕێ.

(٢) گوێ گرتن لەوانە ئاینی یەکان: لە بەرەئەوەی کە ئیمان کەم و زۆر دەبێت، مرۆڤ کاتێ کە گوێ لە وانەیەکی ئاینی دەگرێت و زانیاری نوێی لێ چنگ دەکەوێ و بۆ ماوەی ٢ ڕۆژ، یان ٣ وە، یان چوار ڕۆژ ڕایدەپەڕێنی ئەوا لەگەڵ ئەوەدا ملکەچی کردنی زۆر تر دەبێت .

هەر لەبەرئەوەشە کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَذَكِّرْ فَإِنَّ ٱلذِّكْرَىٰ تَنفَعُ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾الذاريات ٥٥.

(٣) ئامانج و مەبەست دیاری بکەم: کاتێ کە بیر و هۆشم هەمیشە سەرقاڵ دەبێت من دەمەوێ خوای گەورە ڕازی بکەم و بچمە بەهەشتەوە وە گومانی تێدا نی یە کە من هەموو ڕۆژێ زیاتر خەباتی دەرونی خۆم دەکەم.

هەرکاتێ کە ڕەزایەتی پەروەردگار لەدڵ و دەرونت گەورە تر بێت ئەو کاتە تێکۆشانت زیاتر دەبێت، لەبەرئەوەی کە لێرەدا مەبەستێکی گەورە هەیە: من دەمەوێ بچمە بەهەشت و خوای گەورەش لە خۆم ڕازی بکەم.

(٤) متمانەم بە خۆم هەبێ کە واز لە گوناه و تاوان دێنم و هەرگیز ناگەڕێمەوە سەری.

(٥) واز لە هاوڕێی خراپ بهێنم کە ئەمە گەورەترین هۆکارە.

پەیڤەکەم کۆتایی پێ دێنم... بە فەرمودەیەك و ووشەیەك

فەرمودەکە ئەمەیە:

پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ)ووتی: دەمەوێ لەبەهەشت ببمە هاوڕێت، حەزرەت(ﷺ)فەرموی: ( نەفست دامەزراو بکە لەسەر زۆری سوژدە بردن).

بەڵام ووشەکە ئەمەیە:

ووشەکە وتەیەکی ئەبو بەکری صدیق (رضي الله عنه) کە کاتێ خەلافەتی سپارد بە عومەری کوڕی خەتاب (رضي الله عنه)، ئەبو بکر سەیرێکی عومەری کرد و فەرمووی: (ئەی عومەر یەکەمین شت کە وریات دەکەمەوە لێی ئەو نەفسەتە کە لە نێوان هەردوو کەلەکتدایە، گەر سەرکەوتیت بەسەریدا ئەوا تۆ زۆر بەتواناتری لە غەیری نەفسی خۆت وە ئەگەر لەبەردەمیدا شکستت خوارد ئەوا کەساس تری لەوانی دیکە، ئەی عومەر نەفست لەنێوان هەردوو کەلەکتدایە).

ئەوەی کە ئێمە دەمانەوێ ئەوەیە کە خەباتی دەرونی خۆمان بکەین و داهاتویەك بۆ لاوان و کیژان و خێزان و منداڵەکانمان دیاری بکەین، ئێمە هەموو ئەو شتانە دەبەخشینە نەفس کە دەیەوێ وە دەکرێ کە خەباتی نەفسی خۆمان بکەین، تۆ بە نەفسی خۆت دەتوانی هەموو شتێ بکەیت کە دەتەوێ و خۆت لە نێوان کامەرانی دونیا و دوارۆژدا کۆ بکەیتەوە، لەدوا ڕۆژیشدا نەفس یەکێکە لەم دوانە، یان نەفسێکی بەختەوەر و کامەران و

شادومانی ناسروشتی یـە ﴿فَلَا تَعۡلَمُ نَفۡسٞ مَّآ أُخۡفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعۡيُنٖ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾ السجده: ١٧.

یان ـ پەنا بەخودا ـ نەفسێکە لە دۆزەخ و هاوار دەکـات و دەڵێـت: ﴿يَٰحَسۡرَتَىٰ عَلَىٰ مَا فَرَّطتُ فِي جَنۢبِ ٱللَّهِ وَإِن كُنتُ لَمِنَ ٱلسَّٰخِرِينَ ۝٥٦ أَوۡ تَقُولَ لَوۡ أَنَّ ٱللَّهَ هَدَىٰنِي لَكُنتُ مِنَ ٱلۡمُتَّقِينَ﴾ الزمر: ٥٦-٥٨.

تۆ دەتەوێ لە دوارۆژدا کام نەفسەیان بیت؟

جا ئایا پێت خۆشە بەخوای گەورەت بگەیت و ئاسودە بیت؟

ئایا پێت خۆشە بچیتە بەردەم ئەو و ڕازی بێت لەو نەفسەت و گوێت لێبێت کاتێ کـە دەفــەرموێ: ﴿يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفۡسُ ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ ۝٢٧ ٱرۡجِعِيٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةٗ مَّرۡضِيَّةٗ ۝٢٨ فَٱدۡخُلِي فِي عِبَٰدِي ۝٢٩ وَٱدۡخُلِي جَنَّتِي﴾ الفجر: ٢٧-٣٠.

ئایا پێت خۆشە کە ڕۆژێ فەسڵان گوێت لە پەروەردگارت بێت کاتێ کـە پێـت دەڵێـت ئەی فلان من لە تۆ ڕازیم و لێت خۆش بووم دەی برۆ نێو بەهەشتەوە؟، یـان پێـت خۆشـە گوێت لە پەروەردگارت بێت کە پێت دەڵێت: بەندەکەم من لە تۆ پەستم وە زۆر ڕقـم لێتـە ئادەی ئەی فریشتەکانم بیبەن بۆ دۆزەخ.

ئایا پێت خۆشە کامیان بیت؟

# ناوەڕۆك